ئیسماعیل تەنیا



# حزبی سۆسیالیستی کوردستان

## کانوونی دووەمی ١٩٧٦ـ شوباتی ١٩٩٣

## (هەڵکشان ... داکشان ... پەرتەوازە بوون)

چاپی یەکەم / هەولێر
٢٠١٩



# حزبی سۆسیالیستی کوردستانَ

## کانوونی دووەمی ١٩٧٦- شوباتی ١٩٩٣

## (هەڵکشان ... داکشان ... پەرتەوازە بوون)

ئیسماعیل تەنیا

چاپی یەکەم / هەولێر
٢٠١٩

# حزبی سۆسیالیستی کوردستان

**کانوونی دووەمی ١٩٧٦- شوباتی ١٩٩٣**

**( هەڵکشان... داکشان... پەرتەوازە بوون )**


نووسینی : ئیسماعیل تەنیا

دیزاین : هیوا کۆمپیوتەر

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم / ٢٠١٩

چاپخانەی ( ڕۆژهەڵات ) هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی ( ٤٢٠ )ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە

# پێشەکی

(بزوتنــەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردسـتان)ی سـەرەتا و، (حزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان)ی دواتـر، رێکخراوێکـی تـازە و، دەسـت پێـشخەر و بەشداری کاریگـەریی شۆڕشـی نـوێی گەلەکـەمان، بـوو. لەهـەموو سـەرکەوتن و داکـەوتن، هەڵکـشان و داکـشان، کـەوتن و هەڵـسانەوەدا، بـەگوێرەی سـەنگ و رەنگ و قەبارەی خۆی، رۆڵی لەم قۆناغە (١٩٧٦-١٩٩٣) مێژووییەدا، بینیـوە. لەم پێناوەشدا، کۆمەڵێك قوربانی، بەسەخاوەتەوە، بەخشیوە. لەنووسینی ئەم کتێبـەدا، کۆمـەڵێك سەرچـاوەم بـەکارهێناوە، کەبەشـی زۆریـان (بـیرەوەری، یاداشتنامە، لێکۆڵینەوەی زانستی)ن. هـەروەها سـوودم لەپەیوەنـدی لـەرێگای تەلـەفۆن و نامـەوە، لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی کەپەیوەنـدیان بەرووداوەکانــەوە هەبووە، بینیوە. ئەرشیفە خاکەڕاییەکەی خۆشم یەکێك بـووە لەسەرچاوەکان. لەچەند قۆناغێکدا، خـودی خـۆم، لـەریزی رێکخـستنەکانی حـزب و راگەیاندنـدا کـارم کـردووە، ئـەو بـەیان و بڵاوکراوانـەی ئـەوکات دەسـتم کـەوتوون، هـەڵم گرتـوون، پاراسـتوومن، نـەم هێـشتووە بفـەوتێن، ئـەوانیش کـەم و زۆر، بـۆ روونکردنـەوەی زۆر رووداو بەکـەڵکم هـاتوون. لەهەنـدێك شوێنیـشدا، پـشتم بەیاداشت و زاکیرەی خۆم بەستووە.

لەبەشـێکی هەسـتیاری وەك: جودابوونـەوەی بزوتنـەوە لەیـەکێتی و دواتـر کەوتنەوەی ململانێ و شەڕی خوێناوی لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا، زێتر پشتم بەو سەرچـاوانە بەسـتووە کەلەلایـەن (یـەکێتی)یەکانـەوە، نووسـراون و بڵاوکراونەتـەوە، ئەمـەش زێـتر لـەپێناوی روونکردنـەوە و یەکلاکردنـەوەی کێشەکان لەدیدی ئەوانەوە، خراونەتە روو. ئەوەندەی کراوە، خۆمـان لەهەسـت

و سۆز و لایەنگیری بەدوور گرتووە. ئەگەر رووداو و هەڵوەستەیەکی مێژووییش، سەرچاوەکانی ئەوان بەقازانجی سۆسیالیست یەکلایان کردبێتەوە، رۆڵی ئێمە شتێك نەبووە بەناوی لایەنگیری.

یەکەم هاندەریش بۆ نووسینی ئەم کتێبە: نادیدەگرتن و بەهەند هەڵنەگرتنی قوربانییەکانی ئەم حزبە و، کەسوکاری پێشمەرگە و ئەندام و لایەنگرانییەتی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی کوردستان. ئەگەر رۆژێك ئەندام و پێشمەرگەکانی ئەم حزبە، لەریزی یەکەمی هەرە پێشەوەی خەبات و قوبانیدانیدا، پێشەنگ بووبن، ئەوا ئەمڕۆ پەرتەوازە بووینە و کەسێك نییە خۆیان لێ بەخاوەن بکات و بەدەنگ داواکارییەکانیانەوە بچێت.. وەك ئاردی ناو دڕکانیان لێهاتووە. خەڵکی خەباتکاری وا هەیە، مێژووەکەی پڕە لەگیانفیدایی و چەندین جار بریندار بوون و کەسوکاریان چەندین جار لەم زیندان بۆ ئەم زیندان گواستراونەتەوە، کەچی ئەمڕۆ، ئەوانە جێگری جێگری کەسانێکن کەرۆژێك لەرۆژان، بۆ کورد خەباتیان نەکردووە و بەدرێژایی تەمەنیان هەر جاش و سەرۆك جاش و مەفرەزە خاسە بووینە.

* **لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا،** بەپشت بەستن بەچەندین سەرچاوە، باسی لەبارچوونی شۆڕش و پەرتەوازە بوونی پێشمەرگە (بەئاوارە بوون بۆ ئێران و هەندەران) و گەڕانەوە و تەسلیم بوونەوە، بەعێراقم کردووە. هەروەها هەوڵ و کۆششی ئەو سەرکردە و فەرماندە عەسکەرییانەی کەبەدۆخی تەسلیم بوون رازی نەبوون، خراونەتەڕوو. لەناونیشانێکی لاوەکی سەربەخۆدا، باسی ئەو کۆبوونەوانەی شارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانمان کردووە کەبەنیازی دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بۆ تەسلیم نەبوون بەئەمری واقیع و هێنانەدی مافەکانی گەلی کورد، بەرێگای ئاشتیانە گرێدراون. دوای ئەمە، باسی دامەزراندنی (بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان)مان کردووە، تیشکمان خستۆتە سەر کۆبوونەوە و جموجۆڵەکانی ئەو کەسانەی کەبزوتنەوەیان دامەزراندووە.

* **لەبەشــی دووەمــدا**، لەهەشــت کورتــە ناوونیــشانی لاوەکیــدا، باســی (ڕێکخستنەکان و ئەرکەکانیان، پەیوەندی کردنی یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە بەشاخ، چوونە ناو نیمچە بەرەی یەکێتی، هەرێم و هێزەکان بەژمارە و ناوی فەرماندەکانیان، ڕۆڵی هێزەکانی بزوتنەوە لەهەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ و چالاکییەکانیان، لیژنەی ئامادەکردنی پارتی، یەکەم مفاوەزاتی نێوان ڕژێم و یەکێتی– بەکۆمەڵە و بزوتنەوەوە–، شەڕی هەکاری و زیانەکانی)، کردووە.

* **لەبەشی سێیەمدا**، باسی کێشەکانی نێوان بزوتنەوە و کۆمەڵە، کراوە، کەدواتر بۆتە هۆی دەرچوونی بزوتنەوەی لەچوارچێوەی یەکێتی و ڕاگەیاندنی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان– حسیك). دوای ئەمە، باسی گیران و شون بزر کردنی هەردوو سەرکردە، داینەمۆی خەباتی شار، عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی، مفاوەزانی حسیك لەپایزی ١٩٧٩ لەگەڵ ڕژێم و چوونی د. مەحمود عوسمان و عەدنان موفتی، بۆ بەغدا، دامەزراندنی هەردوو بەرەی (جوقد) و (جود) و ڕۆڵی حزب تیایاندا، ئاماژە سەرەتاییەکانی سەرهەڵدانی شەڕی نێوان سۆسیالیست و یەکێتی، پەیوەندی کردنی محەمەدی حاجی مەحمود فەرماندەی هەرێمی یەکی یەکێتی بەسۆسیالیستەوە، بەستنی یەکەم کۆنگرەی حزب و دەرهاویشتەکان و، زەقبوونەوەی ناکۆکی ناوخۆیی حزب و، جەمسەربەندی، کراوە.

* **لەبەشی چوارەمدا**، باسی قۆناغەکانی شەڕی نێوان (حسك و ینك)مان کردووە، کەنموونەی هەرە دیاریان: (بەدیل گرتنی نەوشیروان لەلایەن حسك، خوێن ڕژان لەنێوان دەعوەت و دەعوەتکاری پلان بۆ داڕێژراو، گرتن و بەدیل کوشتنی عەولا سوور و مام ئاراس و کاکەسوور قۆڕیتانی، شەڕی گرتنی مەڵبەندی سێی یەکێتی و ئاشقولکە و پشت ئاشان..) بووە. هەر لەم بەشەدا، باسی دەرهاویشتەکانی ئەم شەڕە نەخوازراوە و کاریگەرییەکانی لەسەر مۆراڵی گەلی کورد و خەبات و قوربانیدانی و ڕۆڵی گوندنشینان لەشۆڕشی نوێدا، کراوە.

* **لەبەشی پێنجەمدا**، باسی راگەیاندنی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، کراوە، کەخۆی لەراگەیاندنی نووسراو: (گۆڤار، بڵاوکراوە، رۆژنامە)، بیستراو (ئیستگە)دا، بینیوەتەوە. ناوی گۆڤار و رۆژنامەکان، کاتی دەرچوونیان، بەشێك لەژمارەکانیان، دەست نیشان کراون. وەك نموونەش، ئیندێکسی چەند ژمارەیەکمان، خستۆتەڕوو. لەبەشی (ئیستگە)شدا، بەدرێژی باسی چۆنیەتی کڕین و هێنان و دامەزراندن و شوێنی کارکردن، بەرنامەکان و ئەو کەسانەی کەرۆڵی سەرەکییان تێدا بینیوە، کردووە. چەند هەڵەیەکی مێژووییشمان راست کردۆتەوە. ئەمە یەکەم جارە، بەم شێوەیە، بەچڕوپڕی باسی راگەیاندنی حسك بکرێت کەوەك لەم کتێبەدا، باسکراوە.

* **لەبەشی شەشەمدا**، ناو و کورتە مێژووی رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکانی وابەستە بەحزب، خراونەتەڕوو. تا ئەو شوێنەی بۆمان روون بۆتەوە، ناوی ئەو کەسانەمان هێناوە، کەرۆڵیان لەم رێکخراوانەدا، هەبووە.

* **لەبەشی حەوتەمدا**، باسی حزبمان کردووە، لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆ، کەئەمەش خۆی لەکۆمەڵێك وردە ناوونیشاندا بینیوەتەوە، وەك: (ناکۆکییەکانی نێو سەرکردایەتی حزب، کۆبوونەوەکانی گوندی شووشان و جیابوونەوەی قادر عەزیز، رووداوی شەهید کردنی قادر مستەفا، ئاشتبوونەوەی گشتی و رۆڵی حسك تیایدا، دامەزراندنی بەرەی کوردستانی).

* **لەبەشی هەشتەمدا**، باسی حزبمان لەدوای راپەڕین کردووە. کۆمەڵێك داتا و زانیاریمان خستۆتەڕوو. لەحەوت کورتە ناوونیشاندا، باسی: (لیستی یەککرتن و ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمان، یەککرتنی سۆسیالیست و پاسۆك و گەل، کۆنگرەی یەککرتن، جیابوونەوەی باڵی رەسول مامەند، گرژییەکانی نێوان حزبی یەککرتن و حزبی سۆسیالیستی کوردستان، کۆنگرەی دووەمی حسك، یەککرتنی سۆسیالیست لەگەڵ یەکێتی)دا، کردووە.

* **لەبەشی نۆیەمدا،** لەژێر ناونیشانی: (کرۆنۆلۆژیای بەشێك لەشەڕەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، باسی کۆمەڵێك شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان هێزەکانی ڕژێم و حزبی سۆسیالیستی کوردستانمان، کردووە. هەتا کراوە، دەستکەوت و زیانەکان، مێژوو و شوێنی شەڕەکان، هەرێم و هێز و مەفرەزە بەشداربووەکان، باسکراون. ئەم زانیارییانەشمان لەبیرەوەرییەکانی سەید کاکە و محەمەدی حاجی مەحمود و، بەیاننامە و بڵاوکراوەکانی حزب و، چەند سەرچاوەیەکی تر، دەست کەوتووە. لەکۆتایی باسکردنی هەر چالاکییەکیش، لەژێرەوە، ئاماژەمان بەسەرچاوەکان، کردووە. ئەمەش لەپێناوی پاراستنی خەبات و قوربانییەکان، لەیەك شوێنی حازر بەدەست، کەببێتە هۆکارێك بۆ ئاسان کردنی کاری مێژوونووس و توێژەران، لەداهاتوودا.

* **لەبەشی دەیەمدا،** زۆر بەکورتی، ژیاننامەی بەشێك لە (سەرکردە، فەرماندە عەسکەرییەکان، کادیرەکان)، بە (شەهید و کۆچکردوو و زیندوو)ەوە، خستۆتەڕوو.

* **لەبەشی یازدەهەمدا،** بەناونیشانی: (بزوتنەوە لەدیداری تەمەندا)، هەڵسەنگاندنمان بۆ چەند لاپەڕەیەکی دیمانەکەی مام جەلال (دیداری تەمەن)، کردووە. بەپشت بەستن بەسەرچاوە و دیکۆمێنتەکان، دانپیانانی سەرکردەکانی یەکێتی، بەخودی (مام جەلال)یشەوە، بۆ ئەم باسەمان نووسیوە. لەوێدا: ئەوە روون کراوەتەوە، کەلەڕووی مێژوویی و خەبات و هەڵوێستەوە، غەدر لەم سەرکردە ناوهاتووانە، کراوە. ئەوانەی لە (دیداری تەمەن)دا، باسکراون، پێچەوانەکەی، لەکات و شوێنێکی تر، لەلایەن خودی (مام جەلال)ەوە، پشت ڕاست کراونەتەوە، واتە: هەر بەقسەکانی (مام جەلال)، وەڵامی (دیداری تەمەن)مان داوەتەوە.

* **لەبەشی دوازدەهەمدا،** کۆمەڵێك (بەڵگە و دیکۆمێنت و وێنە)ی پەیوەندیدار بەم قۆناغەمان، بڵاو کردۆتەوە، کەبەشی زۆریان لەئەرشیفی

تایبەتی خۆمدا، بوونیان هەبوو.

ئەم کارەی من کردوومە، کارێکی ئاسان و بێ و گرفت و سەرئێشە نەبووە، بەتایبەتیش لەرووی نەبوونی سەرچاوەوە... من هەمیشە پێم وابووە: کردنی کارێکی بەکەموکوڕی، چەندین قات باشترە لەونبوون و فەوتان و شون بزر بوونی هەتا هەتایەی.

**لەکۆتاییدا**، هیوادارم توانیبێتم بەشێك لەم ئەرکەی کەکاتی خۆی لەپێناویدا رەنجم بۆی کێشابوو، بەئەنجام گەیاندبێت و بەناوهێنانی شەهیدەکان و باسکردنی (بزوتنەوە) و (حزب)ەکەیان، گیانی هەموو ئەو کەسانەی کەرۆژێك لەرۆژان لەسەر ئەم رێبازە خەباتیان کردووە، شاد و ئاسوودە کردبێت. جگە لەمەش: کارئاسانییەکم بۆ مێژوونووسان و سەرەدەرکردنی نەوەی داهاتوو لەرابردووی نەتەوەکەیان، کردبێت.

**ئیسماعیل تەنیا**

**دیسێمبەری ۲۰۱۷- هانۆڤەر**

## بەشی یەکەم

# کورتە مێژوویەکی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان

## ١- لەبارچوونی شۆڕش

حزبی بەعس کەلەدوای کودەتاکەی حەڤدەی تەموزی ساڵی ١٩٦٨دا، دەسەڵاتی گرتە دەست، پێگەی سیاسی و هێزی سەربازی ئەوەندە رەگاژۆ و بەهێز نەبوو، هەر زوو، کەهێشتا دوو ساڵی حوکمیان تەواو نەکردبوو، لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، کەوتنە گفتوگۆ و دانوستاندن. ئەنجامی ئەم هەوڵانە، رێککەوتنی مێژوویی یازدەی ئازاری لێکەوتەوە.. دەبوو ئەو رێککەوتننامەی کەمۆرکرابوو، پاش چوار ساڵ، لەیازدەی ئازاری ساڵی ١٩٧٤دا، هەموو بەند و بڕگەکانی بکەوێتە واری جێبەجێ کردنەوە. حکومەت لەماوەی ئەم چوار ساڵەدا، توانی: نەوت لەساڵی ١٩٧٢دا، خۆماڵی بکات، کەبەم هۆیەوە، ئابووری عێراق گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و، داهاتی تاکە کەس زێدەتر بوو. لەتەموزی ساڵی ١٩٧٣دا، بەرەی نەتەوایەتی و نیشتمانی پێشکەوتنخوازی لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق، مۆرکرد. بەم کارەی، تا رادەیەك توانی بەرەی ناوخۆ رێك و بەهێز بکات. لەهەمان کاتیشدا، هەست و سۆز و لایەنگیری یەکێتی سۆڤیەت و پارتە کۆمۆنیستەکانی رۆژئاوا و وڵاتانی عەرەبی، بۆ خۆی مسۆگەر بکات. لەپاڵ ئەمانەشدا، لەماوەی ئەم چوار ساڵەدا، بەهەڵڕشتنی پارە و خستنەرووی پۆستی ئیداری توانی چەند سەرکردە و کەسایەتیەکی دیار لەناو شۆڕشی کوردستاندا، بکڕێت و لەریزی پارتی دیموکراتی کوردستان و پێشمەرگەدا، بیانترازێنێت. بۆ نموونە: (رژێم لەرێگای هاندان و دووبەرەکی نانەوە، لەکۆتایی ١٩٧٣دا، عەزیز ئاکرەیی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی و هاشم ئاکرەیی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی و ئیسماعیل مەلا عەزیز ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لەپارتی جیا بکاتەوە و پارتێکی کارتۆنیان بەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ دروست بکات)[1].

هەروەها، (عەبدوڵڵا ئیسماعیل ناسراو بەمەلا ماتۆڕ، ئەویش لەساڵی ١٩٧٣، بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازانی کورد، دادەمەزرێنێت و لەپاش دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ١٩٧٤/٣/١١، بارەگای لەشاری هەولێر دەکاتەوە)[2]. لەناوەڕاستی کانوونی دووەمی ١٩٧٣دا، پارتی شۆرشگێڕی کوردستان، یەکەمین بەیاننامەی

خـۆی بـەناوی لیژنـەی ئامادەکـاری (پـارتی شۆڕشـگێڕی کوردسـتان)، بـڵاو دەکاتەوە. ئەم پارتە، پاش ئەوەی باڵی مەکتـەبی سیاسـی (پـارتی دیمـوکراتی کوردستان)، لەکۆنگرەی حـەوت لەسـاڵی ١٩٧١دا نـاوی ئـەم پارتـە بـۆ (پـارتی شۆڕشـگێڕی کوردسـتان) گـۆڕدرا، بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ (پـارتی دیمـوکراتی کوردستان)، تێکەڵ ببنەوە، بەڵام بەهۆی هاندانی رژێم، بەشێك لـەکادیرەکانی لەتـشرینی دووەمـی ١٩٧٣دا، لەشـاری بەغـدا کۆنگرەیـەکیان بەسـت و پـارتی شۆڕشـگێڕیان دامەزرانـد و (عەبدولـستار تـاهیر شـەریف)[٣] یـش، بەسـکرتێری هەڵبژێردرا[٤].

وەك لەدانپیانانەکانی خۆیاندا دەردەکـەوێت کـەپاش نـسکۆی سـاڵی ١٩٧٥، بەتـەواوی فـەرامۆش کـراون و خراونەتـە پـشت گـوێ. هـەروەها دەسـت کـراوە بەئیحتیوا کردنیان و زۆربەی ئەنـدامانی هەرسـێ حزبەکـە: (حزبـەکانی هاشـم و عەزیز ئاکرەیی و مەلا ماتۆڕ و عەبدولستار تاهیر شـەریف)، یـان کـران بەئـەمن، یان بەلایەنگیر و ئەندامی بەعس[٥].

ساڵی ١٩٧٤ هات و حکومـەت لەسـەرکردایەتی شۆڕشـی کوردسـتان، کەوتـە بیانوو هێنانەوە کـەوا ناتوانێـت تـەواوی بڕگـەکانی رێککەوتننامەکـە، پراکتیـزە بکات... لەم حاڵەتەشدا، کورد دوو رێگەی لەبەردەمدا بوو: یان بچێتە ژێر باری داواکەی حکومەت و بەئۆتۆنۆمی کارتۆنی رازی بێت، یان دەست بداتـەوە چـەك و پـەنا بـۆ شـاخەکان ببـات. ئـەوکات، حکومـەتی شـای ئێـرانیش بەهـەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا، رێککەوتننامەکە جێبەجێ نەکرێت. چونکە بەجێ بەجێ کردنی، پێگەی ناوخۆ و دەرەوەی حکومەتی بـەعس، بـەهێز دەبێـت و دەبێتـە هەڕەشـەیەکیش بـۆ سـەر ئێـران. بـۆ ئـەم مەبەسـتە، ئێـران، هـەموو جـۆرە یارمەتیـەکی لەپێـشکەشکردنی چـەك و تەقەمـەنی و چـەکی قـورس و، نـاردنی پـسپۆری سـەربازی و، حەواندنـەوەی کـەس و کـاری پێـشمەرگەکان و، چارەسەرکردنی برینـدارەکانی شـۆڕش و...تـاد، خـستە بـەردەم سـەرکردایەتی شـۆڕش. سـەرکردایەتی شۆڕشـیش، زێـتر مـەیلی لەهەڵبـژاردنی رێگـای دووەم (دەستپێکردنەوەی شۆڕش) بـوو. هەرچـەندە هەنـدێك دەنگیش لـەناو شـۆڕش کەپێگـەی لێپرسراوێتیـشیان هـەبوو، حـەزیان بەهەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش

نـەدەکرد. هەوڵیانـدەدا، دانووسـتاندنەکە لـەپێناوی بەرقـەرار بـوونی ئاشـتی و ڕێگـرتن لـەدووباره خـوێن ڕشـتن و کاولکـاری، درێـژه بکێـشێ. سـاڵح یوسـفی، ئەندام مەکتەب سیاسی پارتی و ئەندامی شاندی دانووستاندن کـار، (پێـی بـاش بوو شـەڕ هەڵنەگیرسـێ و، بـارزانی یـەکێك لـەکوڕەکانی "ئیـدریس و مەسـعود" وەك وەفدێك بنێرێتە سۆڤیەت، تاوەکو هـەوڵ بـدرێت ڕێککەوتننامـەی یـازدەی ئازار، تێك نەچێت. بەڵام بارزانی نەچووە ژێر باری ئەم داوایە و پێی وابوو، ئەو هەوڵە سەرناگرێ)[٦].

لەشەوی ١٠-١١/٣/١٩٧٤دا، حکومەت لـەڕێگای رادیـۆ و تەلەفزیۆنـەوە بـەم شێوەیەی کەخۆی مەرامی بوو، جێ بەجێ کردنی ڕێککەوتننامەکەی، ڕاگەیاند.

پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و باڵـە سـەربازییەکەی (هێـزی پێـشمەرگە)، دووبـاره چـوونەوه شـاخ و، شـۆڕش، هەڵگیرسـایەوە. سـاڵێکی تـەواو، تـەواوی دەڤەرەکانی کوردستان، ببوونە گۆڕەپانی شەڕ و پێکدادان لەنێوان حکومەت و شۆڕشی کوردستاندا. لەم کاتەشدا، حزبی شیوعی عێراق لەگەڵ حزبـی بـەعس، لەیـەك بـەرەدا بـوون. بەهـەموو شـێوەیەك (سیاسـی، ڕاگەیانـدن، سـەربازی)، کەوتنە هاریکاری حکومەت و دژایەتی کردنی شۆڕشی کوردستان. لەگەڵ هەموو ئەمانەشـدا، بـەهۆی زۆری ژمـارەی پێـشمەرگە و پاڵپـشتی و هاریکـاری شـای ئێران[٧]، شۆڕشی کوردستان، سەربەرزانە توانی لەسەر پێی خۆی بوەسـتێت و دەیان شەڕی گەورە گەورە، لەبەرژەوەندی شۆڕشدا، یەکلایی بکاتـەوە. بۆیـە: حکومەت، زۆر بەناچاری، بۆ ئەوەی بەسەر شۆڕشدا زاڵ بێت و، بـۆ هـەتا هـەتا لـەناوی ببـات و، مەترسـیەکانی داتـەپینی ئـابووری لـەعێراق، دوور بخاتــەوە، بەنێوەندگیری نێودەوڵەتی، لەگـەڵ شـای ئێـران، کەوتـە سازشـکردن. بـۆ ئـەم مەبەستە، لەپەراوێزی کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی ئۆپێك لەجەزائیر، بەناوبژیوانی (هاواری بۆمدیان ١٩٣٢-١٩٧٨)ی سەرۆکی وڵاتی جـەزائیر، سـەدام حوسـێن[٨] جێگری سـەرۆك کۆمـاری عێـراق و (محەمـەد ڕەزا پەهلـەوی)[٩]، شـای ئێـران، بەیەك دەگەن و لەڕێکەوتی ٦ی ئازاری ١٩٧٥، ڕێککەوتننامەیەك مـۆر دەکـەن. کۆمـەڵێك بەنـد و بڕگـە لـەناو ئـەم ڕێککەوتننامەیـەدا، جـێگیر کرابـوو، بـەڵام ئامانجی سەرەکی لەم ڕێککەوتننامەیە، بڕینـی یارمـەتی و لـەناوبردنی شۆڕشـی

کوردستان بوو. بەگوێرەی بەند و بڕگەکانی، عێراق لەنیوە بەشی ئاوی کەنداوی عەرەبی خۆش دەبێت و بەئێرانی دەبەخشێت. جگە لەمەش، کۆمەڵێك گوند و تەپۆلکەی سەر سنوور دەقەبەر ئێران، دەکات. لەبری ئەمەش، ئێران تەواوی یارمەتییە سەربازی و لۆجستیەکان، لەشۆڕش دەبڕێت. سنوورەکان دادێخیت. چەکە قورس و پسپۆڕە سەربازییەکانی، دەکێشێتەوە. فشاریش دەخاتە سەر سەرکردایەتی شۆڕش، تاوەکو شەڕ لەگەڵ عێراقدا، بووەستێنێت. پاش ئەمە، تەواوی پرۆتۆکۆلی رێککەوتننامەکە، لەرۆژی ١٣/٦/١٩٧٥، لەشاری بەغدا، لەنێوان (عەباس عەلی خیلعەت بەری)، وەزیری دەرەوەی ئێران و (سەعدون حەمادی)، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی عێراق، مۆرکرا و راگەیاندرا و، بڵاوکرایەوە.

سەدام حوسێن، لەدانپیانانێکی دا، باسی لەوە کردووە، کەئەم کاتەی رێککەوتننامەکە مۆرکرا، عێراق و سوپاکەی لەوپەڕی بێ چەکی و بێهێزیدا بووە. ناوبراو لەوتارێکیدا کەبەبۆنەی هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامەی جەزائیر لە ١٧/٩/١٩٨٠دا، پێشکەشی کرد، گوتی: (گەلی عێراق بەهۆی شەڕەوە لەگەڵ گەلی کورد گەلێك قوربانی دا، ئەو شەڕەی کەساڵێکی تەواو درێژەی کێشا، لەنێوان مارتی ١٩٧٤ و مارتی ١٩٧٥دا، لەشکری عێراق لەو شەڕەدا پتر لە ١٦ هەزار کەس لەشەهید و برینداری لەکیس چوو... هەرچەندە لەشکرەکەمان ورەی بەرز بوو، لەگەڵ ئەوەشدا نەدەکرا پێویستییە ماددی و بابەتیەکان لەشەڕەکەدا بخرێنە پشت گوێ. چونکە جاری وا هەیە ئەم پێویستیانە گرنگ و کۆتایی هێنەرن بۆ دیاری کردنی زۆر ئەنجامی سیاسی و سوپایی. جا کار گەیشتە پلەیەکی ترسناك، کاتێك تەجهیزات و زەخیرە بنچینەییەکانمان، بەتایبەتی چەکی کۆتایی هێنەر و بەکارترمان بەرەو کەمی دەچوون.. جبەخانەی تۆپی قورسمان لەتەواو بوون دا بوو، لەبۆمبا قورسەکانی چەکی ئاسمانی، تەنێ سێ بۆمبامان مابوو)[١٠]. کەرێکەوتننامەکە لەراگەیاندنەکانی عێراق و ئێران و جیهاندا، بڵاوکرایەوە، تەمی رەشی نائومێدی و دەست لەخۆ بەردان، لەناو ریزەکانی شۆڕش و هێزەکانی پێشمەرگەدا، بڵاوبۆوە. کەس ئاگای لەکەس نەما. هەموو کەسێك خاوەن پرسیار بوون، وەلێ کەس نەبوو

وەڵامی چارەنووسساز بداتەوە.. هەر کەسەو لەئاشێکی لێدەکرد. هەبوو پڕ بەدەم هاواری دەکرد و دژ بەسەرکردایەتی شۆڕش، ناڕەزایی دەردەبڕی. هەندێکی تر، بەردەوامیان بەشۆڕش دەدا و پابەند نەدەبوون بەرێککەوتننامەکە. بابایەکی تر، ورە رووخاو، دەست لەئەژنۆ، هەتا هێزیان تێدا بوو لەسەر لووتکەی شاخەکانەوە، چەکەکانیان ورد و خاش دەکرد و فڕێیان دەدایە خوارەوە. خەڵکی تر هەبوون، چەکەکانیان دەشاردنەوە. ئاوارەکان، لەچادرگا و ئۆردوگاکانی ئێراندا، بەچاوی پڕ لەفرمێسک و دڵی پڕ لەحەسرەتەوە، رۆژیان دەکردەوە.

لەم کاتە پڕ لەناخۆشی و تراژیدیا ئامێزەدا، پاش تێپەڕبوونی چوار پێنج رۆژێك بەسەر مۆرکردنی رێککەوتننامەکەدا، سەرکردایەتی شۆڕش دەکەوێتە خۆ و بەمەبەستی بینینی شا و ئاگادار بوون لەچارەنووسی شۆڕش، وەفدێك پێکدەهێنێت. شای ئێران، کاتژمێر دەی سەر لەبەیانی رۆژی ١١/٣/١٩٧٥، مستەفا بارزانی و د. مەحمود عوسمان و موحسین دزەیی، دەبینێ و لەگەڵیاندا کۆدەبێتەوە و رێککەوتننامەکەیان لەگەڵ عێراقدا پێڕادەگەیەنێت و بەبارزانی دەڵێت: ئێوە سێ رێگاتان لەپێشە، یەکەم: عێراق لەسەر داواکاری من لێبووردنی گشتی بۆ هەمووان دەرکردووە و دەتوانن بگەڕێنەوە. دووەم: لەئێران ببنە پەنابەر. سێیەم: دەتوانن شەڕ بکەن، بەڵام ئێمە هیچ یارمەتییەکتان نادەین و لەکۆتایی مانگی ئاداردا، سنوور دادەخەین[11].

پاش ئەوەی لەقسەکانی شا بێئومێد دەبن، بۆ پرس و ڕا کردن و چارەنووسی شۆڕش، بڕیاری ئەوە دەدەن بگەڕێنەوە کوردستان و لەنزیکەوە، لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسە باڵاکانی پێشمەرگەدا، کۆببنەوە و، رێوشوێنێکی گونجاو بگرنەبەر. بارزانی و دزەیی و دکتۆر مەحمود، لە ١٢/٣/١٩٧٥دا، دەگەڕێنەوە کوردستان. لەرۆژی ١٣/٣دا، یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردایەتی دەست پێدەکەن. (دوای راوێژ و قسەکردن لەبارەی بارودۆخەکە، بڕیاردرا، شەڕ بەردەوام بێت. دوای ئەمە، کۆبوونەوەیەکی فراوانتر، ساز درا، کەسەرکردە سەربازییەکانی ناوچەکە و کەسایەتییە سیاسییەکان و هەندێك لەکادیرە پێشکەوتووەکانی حزب و هەر یەك لەئیبراهیم ئەحمەد و عەلی

عەسکەری و هی تر تێیدا ئامادەبوون، لەو کۆبوونەوەیەدا، بڕیاردرا ناوچەکانی شۆڕش بەسەر چەند کەرتێك دابەش بکرێن و هەر کەرتەو سەرکردەیەکی مەیدانی تایبەتی بۆ دانرا)[12]. بەڵام لەبەر ئەوەی شۆڕش تووشی تەنگژەیەکی گەورە و چاوەڕواننەکراو هاتبوو، ئەو بڕیارانەی کەدەشدران، جێ بەجێ کردنی مسۆگەر نەبوون.. بیروڕاکان جیاواز بوون. کۆبوونەوەکان، ڕۆژێك و دوان و سێیان نەبوون، بەڵکو تا ٣/١٩، بەردەوامیان هەبوو. لەیەکێك لەکۆبوونەوەکاندا، (زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پێیان باش بوو بەرگری بکەن، لەناویاندا، عەلی هەژار و ساڵح یوسفی)[13]. هەندێك سەرچاوەی تر دەڵێن: (پاش کۆبوونەوەی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی، بەشێك لەسەرکردایەتی پێیان وا دەبێت کەشەڕ ناکرێت، تەنها لەم نێوەندا باس لەهەڵوێستی نارەزایەتی ساڵح یوسفی و عەلی عەسکەری دەکرێت، بەجۆرێ ساڵح یوسفی لەکۆبوونەوەکەدا وتویەتی: ئەو کاتەی پێویست بوو شەڕ نەکەین، شەڕمان کرد، ئێستاش کەدەبێ بەرهەڵستی بکەین، دەگوترێ شەڕ لەقازانجماندا نییە)[14]. ساڵح یوسفی مەبەستی لەوە بوو کەدەبوو لەگەڵ حکومەت لەپاش یازدەی ئازاری ١٩٧٤، درێژە بەدانووستاندن بدرێت و شەڕ نەکرێتەوە. ئەوکاتیش پێشنیاری بۆ بارزانی کردبوو، کە (شەڕ هەڵنەگیرسێ و یەکێك لەکوڕەکانی- بارزانی-، وەك وەفدێك بنێرێتە سۆڤیەت تاوەکو هەوڵ بدرێت رێککەوتننامەی یازدەی ئازار تێك نەچێت... بەڵام ئەوکات، بارزانی پێی وابوو ئەو هەوڵە سەرناگرێت)[15].

هەر لەسەروبەندی ئەم کۆبوونەوانەدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان چەند شەڕێکی گەورە لەگەڵ حکومەت دەکەن و بەردەوامی بەشۆڕشی چەکداری دەدەن... جارێکی تر، لەیەکێك لەکۆبوونەوەکاندا پێشنیارێکی تر دەخەنەڕوو، کەپێشنیاری ساڵح یوسفی و چەند کەسێکی تر دەبێت، (پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کەتەسلیم بەعێراق نەبنەوە، هەر هیچ نەبێت دوو مانگێك بەرگری بکەن تاوەکو- ساڵح یوسفی- بەسەرکردایەتی وەفدێك لەرێگای زاخۆوە بچێتە سوریا و چاوی بەحافز ئەسەد و چەند کەسایەتیەکی عەرەبی وەك یاسر عەرەفات و کەمال جەنبولات، بکەوێت و داوای یارمەتیان لێ بکات. هەر لەوێش

لەگەڵ سەفیری رووسیا لەدیمەشق سەردانی رووسیا بکات و داوایان لێ بکات بەتەنگ کارەسات و ئازارەکانی کوردەوە بێن و فشار بخەنە سەر بەغدا تاوەکو چارەسەرێکی عادیلانە بۆ کێشەی کورد لەرێگای گفتوگۆوە بدۆزنەوە)[١٦].

دەڵێن ئەو وەفدەی کەپێشنیار کرابوو بۆ لای ئەم کەسایەتیانە و (ئەنوەر سادات)ی سەرۆکی میسر بنێردرێت بەسەرکردایەتی ساڵح یوسفی بووە، چونکە ئەو پەیوەندییەکی دیبلۆماسی بەرفراوانی لەگەڵ ئەم کەسایەتیانەدا هەبووە.. پاش ئەوەی پێشنیارەکە تاوتوێ دەکەن، بارزانی دەم و دەست رازی نابێت و دەڵێت: پاش چەند رۆژێکی تر وەڵامتان دەدەمەوە... ئەم چەند رۆژە تێدەپەڕن، ساڵح یوسفی لەگوندی (بابەکرئاوا)– رۆژهەڵاتی کوردستان–، چاوی بەنوێنەری بارزانی دەکەوێت. نوێنەرەکە وەڵامی بارزانی بەناوبراو رادەگەیەنێت و دەڵێت، شا بەهیچ جۆرێك لەم جموجۆڵ و کارە سیاسییە رازی نییە[١٧].

بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەك، یان بەردەوام بوون لەشۆڕش، یان گەڕانەوەیەکی شەرەفمەندانە بۆ عێراق، کۆبوونەوە و جموجۆڵە سیاسییەکان، بەردەوامی دەبێت. هێشتا تەواو بڕیاری یەکلاکەرەوەی دەستبەردان لەشۆڕش و گەڕانەوە بۆ عێراق، نەدرابوو، مەکتەبی سیاسی پارتی، لەرۆژی ١٩٧٥/٣/١٦[١٨]، وەك دوا رێگا چارە، (لەرێگەی ئیستگەوە بروسکەیەکی دا بەرژێم، ناوەرۆکی بروسکەکەش داواکردنی گفتوگۆ بوو بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەگەڵ رژێم. سەردێری بروسکەکە بەناوی نامەیەك بۆ سەرانی حکومەتی عێراق، بوو... رژێم رۆژی دواتر لەرێی کەناڵی رادیۆوە وەڵامی دانەوە، کەبەم شێوەیە دەستی پێدەکرد: ((الی ما یسمی بالمکتب السیاسي للحزب الدیمقراطي الکردستاني))، کەتیایدا دەڵێت: دەبێ ئاڵای سپی هەڵبدەن و خۆتان بدەنە دەستەوە)[١٩].

هەر لەم بارەیەوە، بەهەمان شێوەی مەکتەبی سیاسی، ساڵح یوسفی، داوا لەحکومەت دەکات کەگفتوگۆ لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بکات، بەڵام لەبەرئەوەی سەرکردایەتی شۆڕش کەوتبووە ژێر بارێکی قورس و پێگەکەی زۆر بێهێز ببوو، حکومەتیش تەواو بوغرا ببوو، پێی وابوو، تا هەتایە شۆڕشی کورد تەواو و ئیتر لەمە بەدواوە دەتوانێت

لەپێگەیەکی بەهێزەوە مەرج و خواستەکانی خۆی بەسەر کورددا، بسەپێنێ.
هەربۆیە: حکومەت (لەرێگەی ئێزگەی بەغدا و رۆژنامە و گۆڤارەکانی بەعسەوە زۆر بەرەقی وەڵامی سەیدا ساڵح یوسفی دایەوە و پێی راگەیاند کەلەخۆ بەدەستەوەدان بەولاوە هیچ رێگەیەکتان لەبەردەمدا نەماوە)[٢٠]. پاش ئەم وەڵامەی حکومەت، سەرکردایەتی تەواو بێ ئومێد دەبێت، بەڵام هێشتا بەتەواوی بڕیاری یەکلاکەرەوەی کۆتایی هێنان بەشۆڕشیان نەدابوو، بەشێك لەکەسایەتیە دیارەکانی شۆڕش هەر لەکوردستان مابوون، بەشێکی تریان چووبوونەوە دیوی ئێران... ساڵح یوسفی یەکێك دەبێت لەو کەسانەی کەپاش کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی دەچێتەوە نەغەدە، چونکە خانەوادەکەی لەشاری (نەغەدە)ی رۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێ ببوون. لەماڵەکەی خۆیدا، خەڵکێکی زۆر سەردانی دەکەن و داوای لێ دەکەن بگەڕێتەوە عێراق، بەڵام یوسفی پێشنیارێکی تر دەکات: لەرێگای ئەفسەرێکی دیاری عێراقی بەناوی (یەعقوب عەبدولکەریم)، کەلەزیندانەکانی شۆڕشدا، دیل بوو، نامەیەکی شەخسی بۆ سەرکردایەتی حزبی بەعس و حکومەتی عێراق، دەنێرێت. تیایدا دەنووسێت: (لەپێناوی دانوستاندن ئامادەم سەر لەبەغدا بدەم). نامەکە دەدرێتە ئەفسەرە دیلەکە و ئازاد دەکرێت کەبگەڕێتەوە ناو خانەوادەکەی...
پاش چەند رۆژێك، حکومەتی عێراق، لەرێگای لیوا روکن (عەبدولمونعیم ئەلڕوبێعی)، سەرۆکی تیپی پیادەی هەشت، وەڵامی داواکەی یوسفی دەداتەوە، کەتێیدا هاتبوو: (لەم کاتەدا، لەپێناوی کۆتایی هێنان بەخوێن رشتن و پڕکردنەوەی ئەو کەلێن و درزانەی کەکەوتۆتە نێوان عێراقییەکانەوە، وڵاتەکەمان پێویستی بەهەوڵ و خزمەتی هەموو هاوڵاتیەکی خێرخواز هەیە.. لەخودا دەپاڕێینەوە کەهەموو لایەکمان سەرخا لەپێناوی خێر و ئاشتی و هاوکاری و یەکگرتن، لەپێناوی بنیاتنانەوەی وڵاتەکەمان کەشەڕ وێرانی کردووە)[٢١].

ئەم وەڵامنامەیە، لەیەکە سەربازییەکانی حکومەت لەرواندزەوە دەگاتە دەستی سەرکردایەتی شۆڕش. لەم بارەیەوە، (موحسین دزەیی) لەبیرەوەرییەکانیدا، دەنووسێت: (لەبروسکەکەدا داوایان لەساڵح یوسفی کردبوو

بچێته ئەوێ- یەکه سەربازییەکان لەرەواندوز-. بارزانی ناردمیه شاری نەغەدە تا بچمه لای یوسفی کەئەوکاته بەخاو و خێزانەوە لەوێ بوون تا ئەو هەواڵەی پێ رابگەیەنم. بارزانی لەو پرسە هەندێك بەپارێز بوو، وتی پێش ئەوەی ساڵح یوسفی بچێته ئەوێ، با ببینم. کەناوەڕۆکی بروسکەکەم بەیوسفی راگەیاند، بەپەلە خۆی ئامادەکرد تا بڕوات، لەو بڕوایەدا بوو کەدەتوانێت رۆڵێکی ئەرێنی ببینێت)[٢٢]. ساڵح یوسفی و موحسین دزەیی، لەنەغەدەوە، بۆ تاوتوێ کردنی ئەم بروسکەیە و کۆبوونەوە لەگەڵ بارزانی دا دەگەنە بارەگای بارزانی لەحاجی ئۆمەران و شەوێکی تەواو بارزانی و یوسفی بەیەکەوە دەبن...

له ١٩٧٥/٣/٢١دا، یوسفی لەحاجی ئۆمەرانەوە دەگەڕێتەوە عێراق[٢٣].

هەرچەندە بارزانی ئامۆژگاری ئەوەی کردبوو کەباوەڕ بەبەڵێنەکانی رژێم نەکات، بەڵام ئەو هەر لەسەر چوونەکەی مکوڕ بوو، وای زەن دەکرد کەدەبێتە ناوبژیوانێکی خێر لەو ناوەدا[٢٤]. کەیوسفی دەگاتە بەغدا، لەهوتێلێك دایدەنێن. ناوبراو داوا دەکات چاوی بە (ئەحمەد حەسەن بەکر)، یان سەدام حوسێن بکەوێت، بەڵام رێگای پێنادەن، جگە لەچەند لێپرسراوێکی حزبی و حکومی نەبێت، چاوی بەکەسی تر بکەوێت... یوسفی بەلێپرسراوەکان دەڵێت: بارزانی ئامادەیه دانووستاندن بکات و پرسەکه بەرێگای ئاشتییانه کۆتایی پێ بێت... پاش چەند دیدەنی و دانیشتنێك، شاندەکەی حکومەت بەیوسفی رادەگەیەنن کەخودی سەرۆك کۆمار پێی وایە، بزوتنەوە چەکدارییە یاخیبووەکە کۆتایی هاتووە، ئامادەنین لەگەڵیان گفتوگۆ بکەین[٢٥].

لەماوەی ٣/١٩ تاوەکو ٣/٢٥، هیچ کۆبوونەوەیەکی تر ناکرێت و هیچ ئومێدێکی بەردەوامبوونی شۆڕش نامێنێت، بۆیە لە ١٩٧٥/٣/٢٥دا، هەموو سەرکردایەتی بەبارزانیشەوە دەچنە ئێران و[٢٦] لە ١٩٧٥/٣/٢٦، تەواو بوونی شۆڕش رادەگەیەنرێت[٢٧].

پاش بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی تێکچوونی شۆڕش و کێشانەوەی یارمەتیەکانی ئێران، لەلایەك و، دڵەڕاوکێ و نەبوونی بڕیارێکی یەکگرتووی سەرکردایەتی شۆڕش، لەلایەکی ترەوە... هەروەها دەرچوونی بڕیاری لێبوردنی گشتی لەلایەن حکومەتەوە، رۆژانە بەهەزاران پێشمەرگه لەهەموو

دەڤەرەكانەوە، بەچەك و بێ چەك، خۆیان رادەستی نزیكترین بنكە و بارەگای حكـومی و حزبـی و سـەربازگەكانی دەكـرد. هـەر بـۆ نموونـە: لـەرۆژی ٢٣/٣/١٩٧٥دا، (٦٤٧٥) پێـشمەرگە بـەخۆیان و چـەكەكانیانەوە لەشـوێنە جیاجیاكانەوە، تەسلیمی بەغدا بوونـەوە. لـەدهۆك و زاخـۆ (١١٠٠) پێشمەرگە. لەشـێخان (١٣٢٤)، لەئـەتروش (٦٧٠)، لەهـەولێر (٨٠٠)، لەكـەركوك (٥٤٦)، لەسلێمانی (٢٠٣٥)[٢٨].

بۆ گەڕانەوەی پێشمەرگە و ئاوارە كوردەكان لەئێران، حكومەتیش لێبـوردن لەسـەر لێبـوردنی، دەركـرد. لـەبڕیاری لێبوردنەكانـدا، بـەڵێنی ئـەوەیان دەدا كەهەركەسەو دەچێتەوە سـەر ئـیش و كـار و جێگـا و رێگـای خـۆی و لەهـەموو سزایەكیش دەبەخشرێن. ناوە ناوەش، بەنیازی گەڕاندنەوەیان، وەفدی حكومی و حزبـی دەنـاردە ئێـران و لەگـەڵ ئاوارەكانـدا كۆدەبوونـەوە. هەرچـەندە لەكۆبوونەوەكاندا لەلایەن ئاوارەكانەوە، تووشی پەرچـەكرداری تونـد و تیـژیش دەهاتن[٢٩].

لەم كاتەدا، (١٧٠) هەزار پەناهەندە لەئێران هـەبوون، لەگـەڵ لێبوردنـە یـەك لەدوا یەكەكانی حكومەتەوە، ئەم ژمارەیە وردە وردە كەم دەبـۆوە، كەلەسـاڵی (١٩٧٦)دا، تـەنها سـی و پێـنج (٣٥) هـەزار كـەس مابوونـەوە. ئەوانـەش لـەدوا لێبوردنی حكومەتی عێراق لەساڵی ١٩٧٦دا، زۆر لەوانەش گەڕانەوە[٣٠].

هەتا شۆڕش بەردەوام بوو، كەس دەنگی لێـوە نـەدەهات، بـەڵام كەشـۆڕش لەبارچـوو، دەلیڤەیـەكی فـراوان بـۆ رەخنـە گـرتن لەسـەركردایەتی شـۆڕش و سەرزەنشت كردنی، كرایەوە... ئـەوەی دوێنـێ شـان بەشـانی رێبـەری شـۆڕش لەیەك سەنگەر و خاوەن یەك بیروبۆچوون بوو، ئەوا پاش لەبارچـوونەكە كەوتـە رەخنەگرتن و خۆدزینەوە لەمەسئولیەت.. گەر شـۆڕش بەسـەركەوتوویی بـەدوا مەنزل بگەیشتابووایە دەیان خاوەن و پاڵەوانی دەبوو، وەلێ كەشكستی خوارد، كـەس خـۆی لەشكـستەكە بـەخاوەن نـەدەكرد. لەگـەڵ ئـەوەی كەبەشـێك لەسـەركردە و كەسـە دیـارە سیاسـی و سـەربازییەكانی شـۆڕش، لەیاداشـتە بڵاوكراوەكانیانـدا– هەنـدێكیان– خۆیـان لەشكستەكە بێبـەری دەكـەن، بـەڵام بڵـێین و نـەڵێین: هـەر كەسـەو بـەپێی شـوێن و پێگـەی خـۆی، لێپرسـراویەتی

شکستەکەی کەوتۆتە ئەستۆ، جا چ زۆر، یان کەم بوو بێت.. لەمە بەدواوە بیروبۆچوونی جیاجیا، نەخشە رێگا و پلانی جۆربەجۆر، سەریانهەڵدا. هەندێك لەخاوەنی ئەم بیروبۆچوونانە، هەموو تاوانەکانیان دەخستە ئەستۆی رێبەری شۆڕش. هەر زوو کەوتنە نووسین و بڵاوکردنەوەی رەخنەکانیان...

ئەم شۆڕشە گەورە و پان و پۆڕە، لەماوەی دوو هەفتەدا، بووە بەفری مانگی ئادار و، زوو بەزوو تاوایەوە. راستە پیلانەکە گەورە بوو، شوێنی دارشتن و رەنگرێژکردنی، پایتەختەکانی ئەوروپا و وڵاتە عەرەبیەکان بوو، بەڵام دەکرا گەر بۆ چەند مانگێکیش بوایە، هەر بۆ ئەزموون و پشت بەخۆ بەستن، بەردەوامی بەشۆڕش بدرابوایە، چونکە ئەو کاتە توانایەکی (بەشەری، ماددی، مەعنەوی)، باش هەبووە، وەك کەسە نزیکەکانی شۆڕش و سەرکردایەتی، دەگێڕنەوە، ئەوکاتە شۆڕش:

– لەنێوان ساڵانی (١٩٧٠–١٩٧٥)دا، بودجەکەی نزیکەی چل و هەشت (٤٨) ملیۆن دینار بووە.

– شەست (٦٠) هەزار چەکدار (پێشمەرگە)ی مەشق پێکراوی رێکوپێکی هەبوو. جگە لەهەزاران چەکداری تر کەلەژێر کۆنترۆڵی دا بوون.

– نزیکەی پازدە (١٥) ملیۆن گوللەی تفەنگ و رەشاشی هەبووە.

– پێنج (٥) هەزار نارنجۆك و تۆپی هاوەن و ساروخی بازوکا.

– زەخیرە و خواردنێکی زۆری عەمبارکراو، کەبەشی چەند مانگێکی بەرگری کردنی دەکرد.

– سەرباری هەموو ئەمانەش، جوگرافیایەکی چل هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە، خاکی ئازادکراو هەبوو[٣١].

بۆ مەسەلەی ئەو پێشمەرگانەی کەخاوەن ماڵ و منداڵ بوون و لەشارەکانی ئێران و رۆژهەڵاتی کوردستاندا، وەك پەناهەندە نیشتەجێ ببوون، وەك سەردەمی پێش لەبارچوونی شۆڕش، دەکرا خێزان و منداڵەکانیان نەکەنە بیانووی تەسلیم بوون بەئەمری واقیع، چونکە ئێران هەروەك جاران دەیهێشت ئەو خەڵکە وەك پەناهەندە بمێننەوە... لەم رووەوە کاتێك کەبارزانی و د. مەحمود عوسمان و موحسین دزەیی لە ١٩٧٥/٣/١١دا، شا دەبینن، لەدوا

برگەی گفتوگۆکانی نێوانیاندا، موحسین دزەیی لەشا دەپرسێت: ئەگەر شەڕی ئێمە و حکومەتی عێراق، بەردەوام بێت، ئێران ڕێگا دەدات پەنابەران و خێزانەکانیان لێرە بمێننەوە- ئێران-؟ شا بەئەرێنی و (بەڵێ)، وەلامی وەفدەکە دەداتەوە[٣٢].

## ٢- کۆبوونەوەکان لەرۆژهەلاتی کوردستاندا

زۆربەی سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی شۆڕش، لەبەر ئەوەی خانەوادەکانیان لەشارەکانی ئێران (بەتایبەتی رۆژهەلاتی کوردستان)دا، نیشتەجێ ببوون، گەڕانەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان، ئەوەی حەزیشی لەوەبوو کەتەسلیم بەحکومەت بێتەوە، جورئەتی ئەوەی نەدەکرد بەپیر بانگەوازی لێبووردنەکە بچێت، چونکە متمانەی بەبەڵێنەکانی حکومەت نەبوو. لەوە دڵنیا نەبوو، کەگەڕاوە، سزا نادرێت، یان لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، بۆیە چاوەڕوانی ئەنجام و چارەنووسی ئەوانەی دەکرد، کەتەسلیم ببوونەوە...

زۆربەی خەڵکەکە ئاوارە و سەرگەردانی ئێران بوون. لەدەرچەیەك دەگەڕان تاوەکو لەم قەیرانە سیاسی و دەروونیەدا، دەربازیان ببێت. زۆربەیان لەو کەسانە بوون کەحەزیان بەدرێژەدان بەشۆڕش، یان دووبارە تێهەڵچوونەوە، بەلام لەفۆرمێکی جیاوازتردا، دەکرد. هەر کەگەڕانەوە ئێران، دوو دوو و سێ سێ، یان لەشێوەی گروپی بچووك بچووك، لەماڵەکانیاندا کۆدەبوونەوە. لەخەمی دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێکی سەربەرزانەدا، بوون.

سێ هەفتە دوای تەواوبوونی شۆڕش، لەناوەڕاستی مانگی نیسانی ١٩٧٥دا، یەکەمین دانیشتنی ئەم دەستە تێکۆشەرە لەشاری ورمێ (رەزاییە)ی رۆژهەلاتی کوردستان دا کراوە. زیاتر لەسی (٣٠) کادیری پێشەوەی پارتی بەشداریان تیادا کردووە، لەوانە: عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، جەمال حەکیم ئاغا، کەمال محیەدین، رەسول مامەند... لەم کۆبوونەوەیەدا، بڕیارێکی یەکلاکەرەوە نەدرا، بەلام پێیان لەسەر ئەوە داگرت، کەدەبێت بەزووترین کات حزبێك لەکوردستاندا دروست بکرێت، چونکە ئەوان پێیان وابوو، پارتی ڕێکخستنەکانی هەڵتەکاوە، هەولێش بدرێت لەگەڵ حکومەت

هاوکاری بکەن، یان روونتر، مفاوەزات دەست پێ بکەن[٣٣].

هەر لەم سەرو بەندەدا، وەك قادر عەزیز دەڵێت: کۆبوونەوەیەکی تر لـەماڵی عـەلی عەسـکەری لەمـەهاباد دەکرێت، ئـەو کادیرانـەی کـەئامادەی قبـوڵکردنی هەرەس هێنانەکە نەبوون، زیاتر لەبیری بەرگری کردن و شۆڕش کردندا بـوون.. هەر زوو کەوتنەخۆ بـۆ ئـەوەی چـەند کۆبوونەوەیـەك بکرێـت، تـا بزانـرێ، چـی بکرێت. ئەوانە ژمارەیەکی زۆر بوون، لەوانە: عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، عەلی هەژار، د. مەحمود عوسمان، کاردۆ گەلاڵی، سـەعدی گـچکە، مـەلا ناسـیح ئیسماعیل، قادر عەزیز، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری کادیران... لەئورمیە و مەهاباد چەندین کۆبوونەوە کران، کەچی بکرێـت باشـە.. پـاش هـەموو کۆبوونـەوەکان، دوو بڕیاریـان پەسـەند کـرد و وتیـان، دوو ڕێگامـان لەپێـشە، ئـەوەی بـەنیازی شۆڕشکردنە، دەتوانێ بگەڕێتەوە عێراق، ئەوەی نیازی شۆڕش کردنیـشی نییـە دەتوانێ یا بچێ بۆ ئەوروپا، یان بۆ خـۆی ئێـران دەیگوازێتـەوە بـۆ شـارەکانی دەرەوەی رۆژهەڵاتی کوردستان[٣٤].

هـەروەها (عـەلی عەسـکەری)یـش بەهـەمان شـێوە (بەکـەمێك جیاوازیـەوە)، کەگەڕاوەتـەوە عێـراق، باسـی ئـەو کۆبوونـەوەی مـاڵی خۆیـان لەمـەهاباد بـۆ عەبدولستار تاهیر شەریف گێڕاوەتەوە... ناوبراو گوتوویەتی: (ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر مستەفا ئێمەیان ناردەوە بۆ عێراق، بەو مەبەستەی کەئـەوانیش دوای ئێمـە دەگەڕێنـەوە بـۆ عێـراق، ئەمـەش دوای کۆبوونەوەیـەك لەشـاری مـەهاباد لەماڵی ئێمەدا بەسـترا. لـەو کۆبوونەوەیـەدا: مـن و ئیـبراهیم ئەحمـەد و عومـەر مستەفا و دکتۆر خالید و سەعدی گچکە و عارف تەیفور و حەمـە رەزا و...تـاد، سـێ پـڕۆژە موناقەشـە کـرا. یەکـەمیان: بگەڕێینـەوە بـۆ عێـراق و حزبێـك دابمەزرێنن، یان لەدەرەوەی عێراق وەك نەیاری حکومەتی بـەعس کـار بکـەین، ئەگەر نا دووبارە بچینەوە شاخ و دەست بەشـۆڕش بکەینـەوە. ئـەوەبوو بڕیـار لەسـەر خـاڵی یەکـەم درا و لەسـەر داوای ئیـبراهیم ئەحمـەد، ئێمـە (عـەلی عەسکەری، عومەر مستەفا، دکتـۆر خالیـد) گەڕاینـەوە. دوای گەڕانـەوەمان بـۆ بەغدا، ئەوان پەشیمان بوونەوە و ئێمەیان تووش کرد)[٣٥].

(سەید کاکـە)ش، جـەخت لەسـەر ئـەم کۆبوونـەوەی مـاڵی عـەلی عەسـکەری

دەکاتەوە. ناوبراو دەڵێت: رۆژێك مامۆستا مەلا ناسیح و سەید مەجید لەنەغەد، لای من میوان بوون، پێیان گوتم: کاك عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و هەموو ئەوانەی کەکۆن لەگەڵ مام جەلال دا بووین، بەتەماین بگەڕێینەوە بۆ عێراق، هەروەها وەفدێکیشمان ناردۆتە لای حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی بارەگایەکمان بۆ بکەنەوە، یان رۆژنامەیەکمان بۆ دەربکەن، جا تۆش وەرە با بچینە لای عەلی عەسکەری کەماڵی لەمهابادە تاوەکو ئەگەر رژێم حیسابەکی بۆ کردین تۆش لەگەڵمان بە... منیش بەگەڵیان کەوتم، چوومە ماڵی عەلی عەسکەری لەمەهاباد... کاك عەلی گوتی: رژێم هیچمان بۆ ناکات، وەفدەکەشمان گەڕاوەتەوە، بێ ئەوەی هیچ شتەکی بۆ دیاری کردبێن، بەلام سەرەڕای ئەوەش هەر دەگەڕێینەوە، چونکە ناتوانین لێرە هیچ بکەین[٣٦].

ئەو کۆمەڵە خەڵکە، بڕیاری ئەوە دەدەن کەگەڕانەوە عێراق، لەچوارچێوەی یاساکانی عێراق حزبێك دروست بکەن[٣٧]. ئەمانە لایان وابوو سەرکردایەتی بارزانی بەو رێبازە سیاسییە چەوتەی کەلەچەند ساڵی رابردوودا گرتبووی، جولانەوەی کوردی تووشی هەڵدێران کردووە، رێکخستنەوەی پارتی لەسەر بنچینەیەکی پێشکەوتوو بەدۆستایەتی لەگەڵ بەعس و بەشداری لەداو و دەزگای حوکمی زاتی دا، ئەکرێ هەندێ لەدەستکەوتەکانی کورد، بپارێزرێ.. کاربەدەستانی بەعس لەسەرەتادا بەڵێنیان پێدان. بەو هیوایەوە بەکۆمەڵ گەڕانەوە عێراق. لەعێراق بەگەرمی پێشوازیان لێکردن، بەلام بەعس هیچ کام لەبەڵێنەکانی بەجێ نەهێنا[٣٨].

هەر لەمانگی نیسانی ١٩٧٥دا، کۆبوونەوەیەکی تر لەورمێ، لەماڵی عومەر مستەفا دەبابە دەکرێت. بەشداربووان بریتی بوون لە: عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، عەلی هەژار، ئیبراهیم ئەحمەد، کاردۆ گەلاڵی، جەمال حەکیم، رەسول مامەند، مەلا ناسیح، عەبدولڕەحمان گۆمەشینی[٣٩]، ملازم تاهیری عەلی والی، سەلیم ئاغۆك زراری، کەمال محیەدین... بڕیاری ئەوە دەدەن بگەڕێنەوە عێراق، لەوێوە دەست بەخەبات بکەن، ئەوانە، رایان وابوو کەبەناوی پارتی دیموکراتی کوردستان دەست بەخەبات بکەن، بەلام ئیبراهیم ئەحمەد پێشنیاری کرد کەبەناوێکی ترەوە خەبات بکەن چونکە ئەوە کێشە و دووبەرەکی لەگەڵ

سەرکردایەتی پارتیدا دروست دەکات[٤٠].

بێجگە لەم کۆبوونەوانە، کۆمەڵێك کۆبوونەوەی یەك لەدوای یەکی تر دەکرێت. زۆر خەڵکی تریش کەناویان لەم سەرچاوانەی کەباسکراون، نەهاتوون، بەشداریان تێدا کردووە. هەموویان لەهەوڵی ئەوەدا بووینە کەرێگا چارەیەکی سەربەرزانە، هەتا بکرێ، لەرێگای گفتوگۆوە لەگەڵ حکومەت، بدۆزنەوە..

لەخوێندنەوەی ئەم کۆبوونەوەو و راو سەرنجی کۆمەڵێك خەڵکی بەئاگا و نزیك لەرووداوەکانی ئەو سەردەمە، دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

١- هەر یەك، یان دوو و سێ کۆبوونەوە نەکراون، بەڵکو بەدەیان کۆبوونەوە لەشارەکانی (مەهاباد، نەغەدە، ورمێ)، لەماڵەکانی: عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، عەزیز شەمزینی،...تاد، کراون.

٢- هەر ئەم کەسایەتیانە بەشداریان نەکردووە کەلەسەرچاوەکاندا ناویان هاتوون، بەڵکو کۆمەڵێك خەڵکی تریش لەو کۆبوونەوانەدا بەشداریان کردووە و پرس و رایان پێکراوە، لەوانە: قادر شۆرش، بەکر عەلی، مەلا عومەری چل هەوێزە (١٩٣٧-١٩٨٣)، نورەدین عەبدولرەحمان[٤١]. بۆیە ئەگەر یەکێك لەم سەرچاوانەدا ناوی نەهاتبێت و لەسەرچاوەی تر ئاماژەی پێ درابێت، ئەوا دروستە، چونکە، زێتر لە (١٠٠-١٥٠) کەس لەم کۆبوونەوانەدا، بەشداریان کردووە.

٣- زۆربەی رایەکان لەسەر ئەوە کۆك بووینە کەبگەرێنەوە عێراق، لەوێوە بەهەر شێوەیەك بێت، لەرێگای گفتوگۆ و ئاشتییەوە، رێگا چارەیەك بدۆزنەوە.

٤- کەگەرانەوە عێراق، لەسایەی رژێم و لەچوارچێوەی یاسادا، بەمۆڵەتی فەرمی حزبێك دروست بکەن، بەڵام بەمەرجێك ئەم حزبە کارتۆنی و نەبێتە پاشکۆی حزبی بەعس. هەروەها رۆژنامەیەکیش دەربکەن. گەر توانرا بەشداری ئەم دەزگایانەش بکەن کەحکومەت لەیازدەی ئازاری ١٩٧٤، دایمەزراندوون.

٥- لەچوارچێوەی ئەم حزبە دامەزراوەدا، هەوڵبدەن دەستکەوتەکانی بەیانی یازدەی ئازار بپارێزن. ئەوان پێیان وابوو: زەرەر لەنیوەی بگەرێتەوە،

باشترە.

٦- ئـەو حزبـەی کەدروسـتی دەکـەن، هـەر بـەردەوامی پـارتی دیمـوکراتی کوردستان بێت، بەڵام بەناوێکی تر و بەپەیڕەو و پرۆگرامێکی رێك و پـێکتر و گونجاو لەگەڵ بارودۆخەکە.

٧- کەئـەو کۆمەڵـە خەڵکـە ئـەو کۆبوونەوانـە دەکـەن، (مەسـعود و ئیدریـسی بـارزانی)یـش، هـەر لەهەفتـەی یەکـەمی نیـسانی ١٩٧٥دا، پەیوەنـدییان بەکۆمەڵێك کادیری سەرکردەی پارتی، کەپەنابەر بوون لەئێران، کـردووە... لەکۆتایی نیسان و سـەرەتای گـوڵان، لەگـەڵ (جەوهـەر نـامیق سـالم، ئـازاد محەمـەد نـەجیب بـەرواری، محەمـەد مـەحمود عەبـدولڕەحمان "سـامی شنگاری"، فازیـل میرانـی، عـارف تـەیفور، عەبدولکـەریم سـوڵتان عەبـدوڵڵا "کەریم شنگاری"، محەمـەد رەزا، تەحـسین عەبـدوڵڵا ئەتروشـی، عەبـدوڵڵا سەدیق مایی، فرەنسۆ هەریری، کەمال کـەرکوکی، شـێخ عـەزیز سـەرگەڵو، یونس محەمەد سەلیم یونس رۆژبەیانی، شێرکۆ شێخ عـەلی، سـاڵح ئەحمـەد فـەتاح بێـداوی)، کۆبوونەتـەوە و دەسـتیان بـەبزاڤی سیاسـی نهێنـی، کردووە(٤٢).

٨- هەر لەم سەروبەندەدا، جەلال تاڵەبانی و کۆمەڵێك لـەهاوڕێکانی، لەسـوریا، خەریکی دامەزراندنی رێکخراوێکی سیاسی بوون.

## ٣- دامەزراندنی بزوتنەوە

دوای ئەوەی کەلەکۆبوونـەوەکانی شـارەکانی رۆژهـەڵاتی کوردسـتان لەسـەر ئەوە رێکدەکەون کەبگەڕێنـەوە عێـراق، تـاوەکو حزبێـك دروسـت بکـەن.. گـەر حکومەت لەگەڵیاندا بـاش و نـەرم بـوو، هەنـدێك لەداخوازییـەکانی کـوردی جـێ بـەجێ کـرد، ئـەوا ئـەوانیش لـەدامو دەزگاکـانی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی راگـەیانراو لەیازدەی ئازاری ١٩٧٤، بەشـداری بکـەن. خـەڵکیش لـەریزەکانی حزبەکەیانـدا رێکبخـەن. لەسـەرەتادا، حکومـەت پێـشوازییەکی گـەرمی لەگـەڕاوەکان کـرد. لەهـەموو جـۆرە سـزایەکی بەخـشین. بۆیـە ئەمانـە، تـاك تـاك و گـروپ گـروپ، لەماوەیەکی کەمدا، گەڕانەوە عێراق. ئەوانەی دەگەڕانەوە، بەنامەی نووسـراو و

زارەکـی داوایـان لەوانــە دەکـرد کەهێـشتا لـەئێران مـابوون، بـەزووترین کـات بگەڕێنـەوە، چـونکە پێیـان وابـوو: لـەئێران و ژیـانی ئاوارەییـدا، هـیچ شـتێك ناکرێت. هێندەی نەبرد، حکومەت کەوتە خۆ، لێپرسراوە دیار و بەناوبانگەکانی شۆڕشی ناونووس کرد و زۆربەیانی بۆ بەغدا و شارۆچکەکانی باشـوری عێـراق، راگواستن. هەر چەند خانەوادەیەکی بۆ شارۆچکەیەك دوور خستەوە[٤٣]. بـەڵام ئەوانــە، پەیوەندییــەکی تونــدوتۆڵیان، لەنێوانیانــدا هــەبوو. لەڕۆژهــەڵاتی کوردستانیشدا، پلانی ئەوەیان دانابوو کەگەڕانەوە عێراق بەردەوام بن لەخەبات و پەیوەندییــەکانیان بــەردەوام بێــت. بۆیــە کەهاتنــەوە عێــراق، هەرچــەندە لەیەکتریش دوور خرابوونەوە، لەگەڵ ئەوەشـدا بـەردەوام ئاگـاداری گـوزەران و شـوێن و کـار و کـردەی یــەکتر بـوون. زوو زوو ســەردانی یــەکتریان دەکـرد و بیروڕایان دەگۆڕییەوە. هەر زوو ڕێکخراوێکی سیاسییان دامەزراند.

أ- **دەستەی دامەزرێنـەر**: تـا ئێـستاکە، لـەزۆر سەرچـاوەی بڵاوکـراوە (چ لـەفۆرمی کتێـب، یـان وتـار و پـەراوێزی کتێـب)ەکانـدا، نـاوی زۆر کـەس دێـت کەدەستەی دامەزرێنەر بووینە، بەڵام زۆریـان لەگـەڵ ئـەو دەسـتەیەدا نـەبوون، کەیەکەمجار ڕێکخراوەکەیان دامەزراندووە، بەڵکو دواتر، بەچەند هەفتە و مـانگ پەیوەندیان کردووە و بوونەتە ئەندامی ئـەم ڕێکخـراوە تازەیـە. ئەگـەر سـەیری ئــەم سەرچــاوانە بکــەین، نــاوی ئــەم دوازدە کەســایەتیانە، وەك دەســتەی دامەزرێنەر دەبینین: (ساڵح یوسـفی، عـەلی عەسـکەری، دکتـۆر خالیـد سـەعید، عومەر مستەفا دەبابە، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، سەعدی گچکە، تاهیری عەلی والی، سەید کاکـە، نـورەدین عەبـدولڕەحمان، مـەلا ناسـیح ئیـسماعیل، رەسـول مامەند). بـەرای (قـادر عـەزیز)یش، فکـری داهێنـان و دروسـتکردنی بزوتنـەوە لەسەرووی هەموویانەوە هی ساڵح یوسفی بوو[٤٤].

هەندێك لەخاوەن، یان نووسەری ئـەم سەرچـاوانە، پەیوەنـدی راسـتەوخۆ و ئاگادارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی ناوی ئەو کەسانە نـەبووە کـەبۆ یەکـەم جـار و لەیەکـەم دانیـشتندا ناویـان بـەباڵای ئــەم ڕێکخـراوەدا، بڕیـووە. زۆربــەیان، بەشـێوەی زارەکـی لـەملا و لـەولایانی بیـستووە، یـان لەسەرچـاوەی دووەم و

سێیەمەوە، وەریانگرتووە. دەربارەی ئەم ناوانە، بەپشت بەستن بەگوتەی خۆیان و هەندێك سەرچاوەی باوەڕپێکراو، دەتوانین لەیەکیان هاوێر بکەین. بۆ نموونە:

– محەمەد فاتیح لەدیمانەیەکدا، کەلەرۆژی ۲۰۱۰/٤/۱۲، لەگەڵیدا سازکراوە، ناوی سەید کاکە وەك دەستەی دامەزرێنەر دەبات[٤٥]، بەڵام سەید کاکە، خودی خۆی ئەمە رەتدەکاتەوە.

– تاکە سەرچاوە چاوپێکەوتنەکەی (مەلا ناسیح)ە کەناوی نورەدین عەبدولڕەحمان دەبات[٤٦]، کەچی نورەدین عەبدولڕەحمان لەنووسینێکی کەدەربارەی عەلی عەسکەری نووسیویەتی و لەکتێبی (پیاونامە)دا، بڵاوکراوەتەوە، باسی دامەزراندنی بزوتنەوە دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە ناکات کەئەو دەستەی دامەزرێنەر بووە[٤٧].

– (سەعدی گچکە و خالید سەعید و عومەر دەبابە)ش، دوای چەند هەفتەیەك لەدامەزراندنی، ئینجا دەبنە ئەندامی سەرکردایەتی[٤٨]. کەواتە: (نورەدین عەبدولڕەحمان و سەید کاکە و سەعدی گچکە و خالید سەعید و عومەر دەبابە)، ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر نەبووینە و دواتر پەیوەندیان کردووە و بوونەتە ئەندامی سەرکردایەتی. تاکە سەرچاوە کەلەهەموویان متمانە پێکراوترە، قسەکانی (مەلا ناسیح)ە، کەخۆی لەبەغدا بووە و لەیەکەم دانیشتنی دامەزراندندا، بەشدار بووە کەرێکخراوەکەیان تێدا راگەیاندووە.

ناوبراو دەڵێت: دەستەی دامەزرێنەر لەشەش کەس پێك هاتووە کەئەمانەن: (ساڵح یوسفی، رەسول مامەند، نورەدین عەبدولڕەحمان، عەلی هەژار، تاهیری عەلی والی، مەلا ناسیح)[٤٩].

هەروەك لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێکردووە، نورەدین عەبدولڕەحمان، خودی خۆی باسی خۆی ناکات. یان ئەوەتا لەتەوازوعی خۆیەتی، یان (مەلا ناسیح)، بەهەڵە ناوی هێناوە. ئەوەی دەمێنێتەوە: (عەلی عەسکەری و کاردۆ گەلاڵی)یە. دەربارەی عەلی عەسکەری و بەشداریکردنی وەك دەستەی دامەزرێنەر، مام جەلال لەزاری ناوبراوەوە دەڵێت: (ساڵح یوسفی و عەلی هەژار و رەسول مامەند و مەلا ناسیح و چەند برادەرێکی تر چوونە بۆ رفاعی بۆ لای عەلی عەسکەری

تاوەکو پەیوەندیان پێوە بکات، بەڵام ئەو گومانیان لێدەکات و وا دەزانێ ئەمە بەهاوکاری رژێم هاتوون بۆیە دەترسێ و پەیوەندی ناکات و دەڵێ: بەخوا من وازم لەسیاسەت هێناوە. بەڵام ناشیەوێت لەگەڵیان بپچڕێت، دوای ئەوە جارێکی تر دەچنەوە لای و وردە وردە قەناعەتی پێ دەکەن کەکاریان لەگەڵدا بکات)[٥٠].

لەگەڵ ئەم راستیانەشدا هیچ گومانێك لەوەدا نییە کەهەردووکیان (عەسکەری و گەلالی)، هەر لەسەرەتاوە لەپەرۆشی دامەزراندنی ئەم رێکخراوەدا بوون و بەهەموو توانایەکیشیانەوە، هەوڵیان بۆ داوە، بەڵام ئەمانە لەگەڵ یەکەم کۆبوونەوەی دامەزراندنی بزوتنەوەدا، نەبوونە، بۆیە: ئەوان بەدەستەی دامەزرێنەر حسێب ناکرێن.

**ب- کاتی دامەزراندن:** بۆ دەستنیشانکردنی کاتی دامەزراندن، سێ بۆچوون هەن:

- یەکەم: مانگی کانوونی دووەمی ١٩٧٦.
- دووەم: نیسان، یان مایسی ١٩٧٦.
- سێیەم: ١٩٧٦/٨/٨.

گریمانەی سێیەم، هەر زۆر زۆر بێهێزە، یان دەتوانین بڵێین: هەڵەیەکی زەقە، چونکە لەم بەروارەدا، بەپێی شەن و کەوکردنی هەموو سەرچاوە و گریمانەکان، کاتی ناردنی یەکەم دەستە (مەفرەزە)ی چەکدارییە بۆ شاخ... چۆن رێی تێدەچێت رێکخراوێك هێشتا دانەمەزرابێت، یان ئەو رۆژە دامەزرابێت کەیەکەم مەفرەزەی تێدا ناردبێتە شاخ؟! ئەم دەستنیشانکردن و گریمانەیە، دوورە لەراستی و هەڵەیە.

بۆ دووەکەی تر: بەپشت بەستن بەکەسایەتییە بەشدار و زیندووەکان دەتوانین بڵێین: گریمانەی یەکەم (کانوونی دووەمی ١٩٧٦)، لەهەموویان راسترە، چونکە:

- بەپێی زانیاری و سەرچاوەی سەرەکی و پەیوەندیدار بەمێژووی بزوتنەوە، (لەیەکێ لەرۆژەکانی مانگی یەکی ١٩٧٦دا، کۆبوونەوەیەکی گرنگ و یەکلاکەرەوە دێتە ئاراوە، ئەم کۆبوونەوە، کۆبوونەوەی رێکخستن و یەکخستنی

بیروڕا و بۆچوونەکان لەچوارچێوەیەکی سیاسیانەدا دەبێ، ئەم کۆبوونەوەیە کۆبوونەوەی دامەزراندنی ڕێکخراوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان دەبێ)[٥١].

– قادر عەزیز دەڵێت: (فکرەی دروستکردنی بزوتنەوەی سۆسیالیست هەر لەدوای تێکچوونی شۆڕشی ئەیلول هەبوو، بەڵام ئیعلانکردنەکەی دوا کەوت و کەوتە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦. من لەشوباتی ١٩٧٦ کەئەوکاتە لەبەغدا بووم، ئەندامی بزوتنەوە بووم)[٥٢].

– لەمانگی تشرینی یەکەم یان دووەمی ساڵی ١٩٧٥، کاتێك کەسەید کاکە هەر لەئێران دەبێت، عەریف عوسمان دەچێتە لای و پێی دەڵێت: کاك عەلی هەژار و برادەرانی دەڵێن ئێمە خەریکین جووڵانەوەیەك دروست بکەین، قسەمان لەگەڵ سەید کاکە کردووە، با بێتەوە... چەند هەفتەیەك دوای ئەم دیدارە، سەید کاکە دەگەڕێتەوە عێراق... ناوبراو کەدەگاتەوە بەغدا– واتە: کۆتایی ساڵی ١٩٧٥–، لەمانگی کانوونی دووەمی ١٩٧٦دا، (پاش چەند ڕۆژێك شەهید دکتۆر خالید، شەهید سەعدی گچکە، بەدوایاندا ناردم و چووینە ماڵی دکتۆر خالید. دکتۆر خالید گوتی: ئێمە ڕێکخستنمان هەیە، کاتی خۆی کاك عەلی هەژار لەنەغەدە پێی گوتی و قسەت دایە کەبێیتەوە عێراق و لەگەڵماندا بیت.

گوتم: بەڵێ، من بۆ خەباتی چەکداری ئامادەم، بەڵام ڕێکخستنم بۆ ناکرێت. پێی گوتم: خەباتی چەکداریش دەکەین)[٥٣].

لەم کاتەدا– کانوونی دووەمی ١٩٧٦–، ڕێکخستنیان هەبووە... کەواتە، چۆن ڕێکخستنی سیاسی بێ ڕێکخراو و حزب دەبێت؟!

جگە لەم زانیارییانە: ئەحمەد حەمەد ئەمین، مامۆستای بەشی مێژوو لەزانکۆی سەلاحەدین، پاش بەراورد و وردبوونەوە و شەن و کەوکردنی زانیارییەکان، لەوتارێکی ئەکادیمیدا گەیشتۆتە ئەم قەناعەتە، کەبزوتنەوە لەکانوونی دووەمی ١٩٧٦دا، دروست بووە[٥٤].

**ج– یەکەمین بەیاننامە:** لەبارەی بڵاوبوونەوەی یەکەم بەیاننامەی ئەم ڕێکخراوەوە، سێ بیروبۆچوون و بەرواری جیاواز جیاواز هەیە[٥٥]. بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە دروستە، یەکەم بەیاننامەی ڕێکخراوی تازە دامەزراو، بەرواری

(١٩٧٦/٤/٧)ە. خـاوەنی رای دووەم (مایـسی ١٩٧٦)، لەنزیکـەوە ئاگـاداری رووداوەکانی دروستبوونی بزوتنـەوە نـەبووە. نـاوبراو، دوای ئـەوەی بزوتنـەوە دەبێتە حزب، ئینجا دێتە ریزی ئەم حزبەوە.

رای سێیەم، (١٩٧٦/٨/٨): دروست نییە. رای دووەم و سێیەم، دەبێت ئـەو بەیاننامانە بن کەدواتر دەرچوون، نەك یەکەم بەیاننامە.

**د- ناوی رێکخراوەکە:** لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، بەچاولێکەری (الحرکه التـصحیحیه)کـەی بـەعس لەسـوریا ئـەمانیش ناویـان لـەخۆ نـا (بزوتنـەوەی راستکردنەوە) گوایا چەوتی و لادانە سیاسیەکانی پـارتی راسـت ئەکەنـەوە[٥٦].

ئـەم بۆچـوونە، بەفـەرمی لەلایـەن (سـالّح یوسـفی) دامەزرێنـەر و داهێنـەر و دروستکەری بزوتنەوە، لەم نامەیەی کەلەپایزی ١٩٧٩، بۆ سەرکردایەتی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان- حسیك)، لەشاخ نـاردووە، پـشت راسـت کراوەتەوە، کەبزوتنەوە لەسەر مێژوو و رابردووی پارتی دیموکراتی کوردستان، دروسـت کـراوە و خۆیـان بەدرێژەپێـدەری پـارتی نـاوبراو، زانیـوە، بـەلاّم لەفۆرمێکی جیاواز و گونجاو لەگەلّ هەل و مەرجی تازەدا. لەنامەکەیدا هـاتووە: (پێویستە سەر لەنوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کـەحزبی نـوێ- مەبەسـت لەحزبی سۆسیالیـستی یـەکگرتووی کوردسـتانە کەلـە ١٩٧٩/٨/٨، دامـەزراوە. ئیـسماعیل-، درێـژەدانی سروشـتی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانە کەهـەر لەسەرەتای دروستبوونی بزوتنەوەی سۆسیالیست جەختمان لەسەر کردۆتەوە، بـەلاّم بەشـێوەیەکی پێـشکەوتوو. هەرچـەندە هەنـدێك کـەس بـەبێ بیـانوو دەیانەوێت ئەم رۆلّەی پارتی پشتگوێ بخەن)[٥٧].

ماوەیەکی کەم لەژێر ئەم ناوەدا، خەبات و جموجۆلّی سیاسی دەکەن، دواتر ناوەکـەی دەگـۆڕن و دەیکەنـە: (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردستان). وشەی (دیموکرات)ەکەی تا مـانگی ئـازاری ١٩٧٧ هـەر پێـوە لکـا بووە، چونکە لەو بەیاننامەی کەبەزمانی عەرەبی لە ١٩٧٧/٣/١دا، لـەژێر نـاوی (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردسـتان)، بلاّوکراوەتـەوە بـەروونی دەردەکەوێت. هەندەی پێ ناچێت، گوایـا لەسـەر داوای مـام جـەلال، لەیەکـەم کۆبوونـەوەی سـەرکردایەتی یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان (٨/٣١-

١٩٧٧/٩/١٢)، لەناوچەی برادۆست، وشەی (دیموکرات) لادەبەن. بەبیانووی ئەوەی حزبە سۆسیال دیموکراتەکانی رۆژئاوا کەلەدەسەڵاتن و هاوکاری ئیمپریالیزمی ئەمەریکا و جیهانی سەرمایەداری دەکەن. (رەسوڵ مامەند)یش لەراپۆرتی سیاسی یەکەم کۆنگرەی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە: کەزاراوەی سۆسیال دیموکراتی جیهانی، جێگای گومان بووە، لەبەر ئەوەی پشتی لەهزری شۆرشگێڕی کردووە، بۆیە دوای پرس و را وەرگرتن، وشەی دیموکراسی، لادرا[٥٨].

**هـ- رێباز و ئایدۆلۆژی بزوتنەوە:** بزوتنەوەیەکی ریفۆرمستی میانڕەو بوو، پێی وابوو دەکرێ لەرێگای گفتوگۆوە یاسای راگەیەنراوی ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٤، هەموار بکرێ و کورد بگاتە ئامانجەکانی[٥٩]. لەپێناوی هێنانەدی ئەم ئامانجە، لەم بەیاننامەی کەلە ١٩٧٦/٨/٨دا، بڵاویان کردۆتەوە، جەختیان لەسەر رێگا چارەی ئاشتیانەی دوور لەتوندوتیژی کردۆتەوە. ئەوان لەبەیاننامەکەدا روو لەجەماوەر و دەسەڵات دەکەن و دەڵێن: (ئەو کەسانەی گەڕاونەتەوە بۆ وڵات بۆ بەرگری کردن لەمافی گەلەکەمان... ئێمە بڕوامان هەیە کەکێشەی گەلان لەجیاتی ململانێ و ناکۆکی، پێویستە بەرێگای سیاسی و شێوازەکانی دیموکراتی دروست، چارەسەر ببێ... بۆیە جەخت دەکەینەوە، پابەند بین بەهەموو ملکەچیەك لەسەر خۆمان ئەگەر دەسەڵات هەندێك ئامادەکاری بکات بۆ دروستبوونی هەلومەرجێك ئەویش بەهەنگاوی عەمەلی بۆ ئەم مەبەستە، دانپێنان بەهەڵەکانی رابردوو و گەڕانەوە بۆ گیانی بەیانی ئادار)[٦٠].

هەروەها لەبەیاننامەیەکی تردا هاتووە و ئاماژەیان بەوە کردووە کەبزوتنەوە (رێکخراوێکی چەپی دیموکراتی شۆرشگێڕە و باوەڕی بەمارکسیزم و سۆسیالیستی زانستی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و مافی چارەی خۆنووسین و گرێدانی خەباتی نەتەوایەتی و خەباتی چینایەتی هەیە).

لەسەرەتای دامەزراندنیدا، باوەڕی بەوە هەبوو کەسوود لەهەموو ئەو چەمکە پێشکەوتنخوازانە وەربگرێت کەلەگەڵ کۆمەڵگای کوردیدا دەگونجێت و دەتوانرێت کێشەکانی کورد لەچوارچێوەی عێراقدا، چارەسەر بکات، نموونەی

(سۆسیالیستی، سۆسیالیستی زانستی، نەتەوەیی پێشکەوتنخواز، دیموکراتی، دیموکراتی شۆرشگێڕ، مارکسی). بەڵام دواتر، بەهۆی نەبوونی سیاسەتێکی روون و ترنجانی ئەم هەموو چمکە دژ بەیەکانە لەبەیاننامەکەدا، بزوتنەوە رووبەرووی قوڵبوونەوەی کێشەی ناوخۆیی کرد. سەرکردەکانی، هەندێکیان باوەڕیان بەسۆسیالیستی نەبوو، چ جای سۆسیالیستی زانستی... هەندێکی تریان وەك دەڵێن: زۆر لەمارکس و لینین، مارکسی تر بوون... ئەوە لەکاتێکدا بوو کە: (ساڵح یوسفی دامەزرێنەری سەرەکی بزوتنەوە، دژی هەموو جۆرە سیاسەتێکی پەڕگیری وەك چەپی توندڕەو و راستی توندڕەو، بوو.. ئەو پێی وابوو، سوود لەهەموو تیۆر و بیرۆکەیەك وەربگیرێ، وەك، سۆسیالیستی، دیموکراتی، نەتەوەیی... بەڵام ئەو بڕوای بەسۆسیالیستی زانستی نەبوو)[٦١].

هەروەها لەبەیانەکەی ١٩٧٦/٨/٨دا، جەختیان لەسەر ئەم خاڵانە کردۆتەوە و قورسایی خەباتیان خستۆتە سەر پراکتیزەکردنی:

– پشت بەستن بەسەرکردایەتیەکی بەکۆمەڵ و رێگەنەدان بەتاکڕەوی.

– حەرامکردنی شەڕی ناوخۆ، کۆکردنەوەی کەسانی سەر بەهەردوو باڵەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان.

– داڕشتنی بەرنامەیەکی زانستی کەپشت بەبنەما دیموکراتیەکان ببەستێ.

– هەڵوێست وەرگرتن و بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی بەعەرەبکردن و راگواستن و تۆقاندنی رژێمی عێراقی.

– رەتکردنەوەی هەر جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ وڵاتانی ئێران، تورکیا، سوریا، لەسەر حسابی نەتەوەی کورد بەگشتی.

– لەدواجاردا، بزوتنەوە درێژەپێدەری سروشتیانەی پارتی دیموکراتی کوردستانە و هەوڵی زیندووکردنەوە و جێ بەجێ کردنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ دەدات[٦٢].

**و– ناردنی یەکەم مەفرەزە بۆ شاخ:** بزوتنەوە هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە، ئەگەر ناچار نەکرابوایە، باوەڕی بەشەڕی چەکداری نەبوو، بەڵام بەهۆی توندوتیژی رژێم دەرهەق بەکورد، بیری لەکاری چەکداری کردۆتەوە، تاوەکو هەر هیچ نەبێت، حکومەت بەپیر داخوازییەکانیانەوە بچێت.

گرنگترین ئەم هۆكارانەی كەپەرچەكرداری لای بزوتنەوە دروست كرد، بریتی بوون لە:

١- لەم سەروبەندەدا، حكومەت بەتەواوی لەكورد بێ منەت ببوو، وای دانابوو، جارێكی تر ببڕای ببڕ، كورد بیر لەكاری ئۆپۆزسیۆنی و چوونەوە شاخ، ناكاتەوە... بۆیە بەردەوام بوو لەڕاگواستنی گوندەكانی سەر سنووری (عێراق- ئێران) و (عێراق- توركیا)... بەبیانووی پاراستنی كێڵگە نەوتیەكانیش، بەدەیان گوندیان لەدەڤەری كەركوك و موسڵ، ڕاگواست. لەشوێنی ئەوان، عەرەبی هاوردەی تێدا نیشتەجێ كردن. جگە لەتەعریب و ڕاگواستن، بەسەدان گوندیشی وێرانكرد[٦٣].

٢- لەو بەڵێنانەی كەلەلێبوردنەكان بەكوردی دابوو، پاشگەز بۆوە. بەسەدان خانەوادەی گەڕاوەی، بۆ شارەكانی باشوری عێراق دوور خستەوە.

٣- فشارێكی زۆری خستبووە سەر پێشمەرگە گەڕاوەكان بەتایبەتی و، تاكی كورد بەگشتی، تاوەكو بچنە ریزی ڕێكخستنەكانی حزبی بەعسەوە.

٤- لەناو سەركردایەتی بزوتنەوە، دوو ڕاوبۆچوونی جیاواز هەبوو، ڕای یەكەم كەسالح یوسفی و عەلی هەژار و كاردۆ گەلالی و ڕەسول مامەند، نوێنەرایەتیان[٦٤] دەكرد، پێیان وابوو جارێ هەل و مەرجی هەلگیرساندنەوەی شۆڕشی چەكداری لەئارادا نییە و هێشتا زووە بۆ شۆڕشی چەكداری. ئەوان، وا بیریان دەكردەوە كەتازە شۆڕش تێك چووە، كورد هێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆ، با بزانین حكومەت چی دەكات و چۆن بەتەنگ داخوازییەكانی كوردەوە دێت.

ڕای دووەم، عەلی عەسكەری و د. خالید سەعید و عومەر دەبابە و سەعدی عەزیز (گچكە) و مەلا ناسح و سەید كاكە، نوێنەرایەتیان دەكرد... ئەمانە پێیان وابوو: دەبێ شۆڕش بكرێ و بچینەوە شاخ، چونكە لەبەهێزیدا، ڕژێم گوێمان لێ دەگرێت[٦٥].

بەشێك لەوانەی خاوەنی ڕای دووەم بوون، خەڵكی عەسكەری و خاوەن ئەزموون بوون. لەشۆڕشی ئەیلولدا لێپرسراوی هێز و بەتالیۆن بوون.. بەشداری دەیان شەڕی گەورە گەورەیان كردبوو. جگە لەمەش، بەشێكی تریان

لەلێکترازانەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان لەساڵی ١٩٦٤دا، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوون... بەڵام خاوەن رای یەکەم، زێتر خەڵکی رێکخستن و حزبایەتی بوون. یەکێکی وەك ساڵح یوسفی هەردەم دژی شەڕ بووە. لەهەموو قۆناغەکانی شۆڕشی کورددا، لەشەڕ وەستان و دانووستاندنەکاندا، بەردەوام سەرۆك، یان ئەندامی شاندی دانووستاندن بووە... جگە لەمەش، ئەندامی چەندین رێکخراوی ناوخۆ و دەرەوەی ئاشتی بووە.

٥- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ساڵێك و دوو مانگ دەبوو کەلەسوریا دامەزرا بوو، جاری هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی دابوو. چەند مەفرەزەیەکی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)، لەشاخ بوون. پارتی دیموکراتی کوردستان- سەرکردایەتی کاتی (قیادە موەقەتە)، بەیاننامەی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی بڵاوکردبۆوە و چەند مەفرەزەیەکی چەکداری لەسنوورەکانی (عێراق و تورکیا)، هەبوو[٦٦].

٦- رژێم، بەنیازی گەڕانەوەی مام جەلال بۆ عێراق، عومەر مستەفا (دەبابە)ی بۆ سوریا ناردبوو، تاوەکو لەوێ باوەڕی ئەوەی بۆ دروست بکات کەبگەڕێتەوە عێراق و واز لەکاری بەرهەڵستکاری و چوونەوە شاخ بهێنێت... عومەر مستەفا نەیتوانیبوو مام جەلال قایل بکات، بەدەستی بەتاڵ گەڕابۆوە بەغدا.

٧- لەبری ئەوەی عومەر دەبابە مام جەلال رازی بکات کەبگەڕێتەوە، مام جەلال ناوبراو رازی دەکات کەزوو بەزوو لەگەڵ هەڤاڵەکانی لەبزوتنەوە بچنەوە شاخ. لەم بارەیەوە سەید کاکە دەڵێت: (لە ١٩٧٦/٧/١٥، کاك دکتۆر خالید لەبەغدا لەئەبو نەواس ناردی بەدوامدا، چووم دیتم کاك سەعدی- سەعدی گچکە-ی لەگەڵ بوو. گوتی: رژێم کاك عومەر دەبابەی ناردووە بۆ لای مام جەلال کەبێتەوە، بەڵام مام جەلال گوتوویەتی ئێوە زوو وەرنە دەرەوە... منیش چەکێکی زۆرم پەیدا کردووە، لیبیا و سوریا یارمەتیمان دەدەن. لەگەڵ د. خالید و کاك سەعدی دامانناا رۆژی ٨ی ئابی ١٩٧٦، سەعات دوازدەی نیوەڕۆ لەبەغدا ئامادەبین بۆ رۆیشتن)[٦٧].

٨- لەبەر ئەوەی سێ سەرکردەی خاوەن پێگە لەبزوتنەوە (عەلی عەسکەری،

د. خالید سەعید، عومەر دەبابە)، پێشتر لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی بوون. دۆستایەتیەکی پتەویان لەگەڵ (مام جەلال)دا هەبوو، کاری خۆیان دەکەن و دەتوانن بزوتنەوە بهێننە سەر ئەو باوەڕەی کەکاتی ئەوە هاتووە بەشەڕ کێشەکان لەگەڵ رژێم یەکلا بکەنەوە، چونکە: رژێم لەرێگای گفتوگۆ و ئاشتیانە، نایەتە ژێر باری چارەسەرکردنی کێشەی کورد. پەیامەکەی مام جەلال کاری خۆی کرد و بزوتنەوەی رازی کرد. بۆیە چۆن لەکۆبوونەوەی ١٩٧٦/٧/١٥، لەگازینۆی (ئەبو نەواس)، بڕیاریاندابوو، لەرۆژی ١٩٧٦/٨/٨دا، هەریەك لە (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید سەعید، سەعدی گچکە، سەید کاکە، قادر عەزیز، تاهیری عەلی والی، رەسول مامەند، یاسین قادر[٦٨]، جەوهەر سەعید، جەعفەر ئەسوەد[٦٩]) و چەند کەسێکی تر، لەمیحوەری سلێمانی و هەولێر، بەرەو قەندیل بەرێدەکەون و لەرۆژی ١٩٧٦/٨/١٥ دەگەنە قەندیل و دەست بەبەرگری چەکدارانە دەکەن. چەند هەفتەیەك دوای ئەم مەفرەزەیە، کۆمەڵێك تێکۆشەری تر لەشاری هەولێر و ناوچەی خۆشناوەتی و سلێمانی پەیوەندی بەمەفرەزەکەی شاخەوە دەکەن، لەوانە: قادر مستەفا، بەکر حەمە[٧٠]، عەولا سور، سەلیم کێشکەیی[٧١]، مەلای حاجی رەسوڵ...تاد.

بەم شێوەیە، پاش تێپەڕبوونی تەنها هەشت مانگ لەدامەزراندنی، بزوتنەوە دەکەوێتە ژێر باری ئەمری واقیع و دەبێتە هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی چەکداری دژ بەرژێم و بەردەوام دەبێت لەخەباتی شار و شاخ.

## ١- ڕێکخستنەکانی ناوخۆ[٧٢]

دەزگایەکی تایبەت بوو بەڕێکخستنەکانی (بزوتنەوە)، پاشان حزبی سۆسیالیستی کوردستان. دوای ئەوەی کەبزوتنەوە یەکەم دەستەی نارده شاخ و چووە ناو نیمچە بەرەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ەوە، بۆ ڕێکخستنی ئەندامەکانی بزوتنەوە لەشانە و ڕێکخراوی تۆکمە لەناوخۆ، دەزگای ڕێکخستنی[٧٣] نهێنی، بۆ چالاك کردن و سەرپەرشتی کردنی ئەندامەکانی دامەزراند. یەکەمین لێپرسراوی ئەم دەزگایە، (عەلی هەژار) بوو. (کاردۆ گەلاڵی)یش، هاریکارێکی چالاکی ناوبراو بوو. دوای ئەوەی کەبزوتنەوە لەشەڕی هەکاری کۆمەڵێك سەرکردەی، شەهید بوو، لەنیمچە بەرەی یەکێتی دەرچوو. سەرکردایەتی شاخ، داوای لەعەلی هەژار و کاردۆ کرد، پەیوەندی بەشاخەوە بکەن.

بۆ ئەم مەبەستە، عەلی هەژار (پێش گیرانی لەلایەن ڕژێمەوە)، لێپرسراویەتی ڕێکخستنەکانی شار (هەولێر)، تەسلیم بە (عەلی رەسول)[٧٤] دەکات. دوای گیرانی عەلی هەژار و کاردۆ، تەواوی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ جگە لەهەولێر، بەفەرمانی ساڵح یوسفی کەوتۆتە دەست (محەمەد شاکەلی).

لەم کاتەوەی کەدەزگاکە دادەمەزرێت، تاوەکو شوێنبزر کردنی هەردوو ناوبراو، شێوەی ڕێکخستنەکان، بەم شێوەیە بوو:

١- لقی هەولێر: لێپرسراوێکی دیاری کراوی نەبووە. مامۆستا سەعد عەبدوڵلا، عەلی رەسوڵ، عەبدوڵلا ئیسماعیل میرەکانی (مامۆستا فەرەیدون)، شەهید (مامە)[٧٥]، سەرپەرشتیان کردووە. کۆمەڵێك کادیری چالاکیش ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەناو ڕێکخستنەکانەوە، لەوانە: قادر شۆڕش، مەلا ناسیح، سەلیم ئاغۆك، مامۆستا ئەمین قادر، مەلا عومەری چل هەوێزە، ئەنوەر عومەر ساڵح (د. پەروەر)، قادر مەلا سابیر (بێکەس)[٧٦]، ئەبوبەکر سۆربەشی (دیار)[٧٧]، مەلا خدر، عەبدوڵلا رەشید، نەوزاد حەمە عەلی، موحسین عوسمان[٧٨]، مامۆستا حەمەدەمین، شێخ کەریم هیرانی، محەمەد مەنگوڕی، سەلام گۆمەشینی[٧٩]، سەمەد عەبدوڵلا (بەڵێن)[٨٠]، وەیسی ساڵح، سەلاحەدین

محەمەد ئیسماعیل (مامۆستا سەلاح)[٨١]، ئیسماعیل حوسێن، کاکل حەسەن (ئاسۆ)، سەمەد حەمەد (مامۆستا سەمەد)، عومەر محەمەد ئەمین (مامۆستا کاوە)، محەمەد عومەر ئەحمەد دۆڵەبەکرەیی (مامۆستا دارا)، عەبدوڵڵا ئەنوەر (سمکۆ)، یاسین محەمەد عەبدولقادر (د. سەردار)، عوبێد مەجید (عادل)، جەرجیس حەسەن جەرجیس، مەعروف پیرداودی، نەجمەدین سابیر، سەید جوامێر، ئیسماعیل حەمەد عەلی دۆڵەبەکرەیی[٨٢]، تاهیر عەبدوڵڵا، ڕێکار ئەحمەد...تاد.

٢- **لقی سلێمانی:** سەرەتا، جەمال حەکیم ئاغا، سەرپەرشتی کردووە. دوای ئەوەی بزوتنەوە لەیەکێتی دەردەچێت، جەمال حەکیم ئاغا، لەناو (یەکێتی)دا، دەمێنێتەوە. دوای ئەم ڕووداوە، لقی سلێمانی ڕێکخراوەتەوە. (جەمال حەمە نوقڵە) بۆتە بەرپرسی لقی سلێمانی و مولازم مەجید کاکەیی و ڕەشید عارف و عەلی سەرگەڵویی، بوونەتە ئەندامی لقی سلێمانی. لەم سەروبەندەدا، کۆمەڵێك ئەندامی چالاك لەلقی سلێمانی ڕۆڵی بەرچاو و دیاریان هەبووە، لەوانە: (شێخ عومەر عەواڵ، مەلا سابیر، سەردار جەباری، شێخ حەسیبی خەیات، دلێر جەلال، مامۆستا نیهاد، سەید خورشید جەباری...تاد). جگە لەمانە، بەتایبەتی دوای ساڵانی ١٩٨٣-١٩٨٤، چەندین ڕێکخراوی ڕێکخستن لەناو شاری سلێمانی هەبوو، کەڕۆڵی باشیان هەبووە و بەردەوام لەچالاکیدا بوون، لەوانە: (ڕێکخراوی ئاسۆس، ڕێکخراوی شەهید مام ئاراس). ئەمەی دواییان، محەمەد غەفور و نەبەز حاجی حوسێن و ئەحمەد عومەر و هاوڕێکانیان، سەرپەرشتیان کردووە، کەبەهێزترین ڕێکخراوی ناوشاری سلێمانی بوو.

٣- **لقی کەرکوك:** لەکاتی دامەزراندنی بزوتنەوەدا، نورەدین عەبدولڕەحمان ئەندامی سەرکردایەتی کاتی (سەرکردایەتی ناوخۆ)ی بزوتنەوە، سەرپەرشتی کردووە، تا دوورکەوتنەوە و پچڕانی لەساڵی ١٩٧٩دا. هەر ئەم کاتە (محەمەد فاتیح عەبدولڕەحمان)یش لێپرسراوی لق بوو. عەبدولکەریم حەسەن و محەمەد شێخ عزەدین و حەمە ئەمین سەمین و محەمد سەعید سابیر، ئەندامانی لق بووینە. دوای ئەوەی کەمحەمەد فاتیح لەساڵی ١٩٧٩، پەیوەندی بەشاخ

کـردووه و (نـورەدین عەبـدولڕەحمان)یـش دوورکەوتۆتـەوە، لقـی کـەرکوك سەرلەنوێ ڕێکدەخرێتەوە و دادەمەزرێتەوە. ئەمجارەیان محەمەد شێخ عزەدین بۆتە لێپرسراوی لقی کەرکوك. عەبدولکەریم حەسەن و محەمەد سەعید سـابیر و حەمەئەمین سەمین و کەریم قارەمانی، بوونەتـە ئەنـدامی لـق. جگـە لەمانـەش، کۆمـەڵێك خـەڵکی تـر، ڕۆڵـی دیاریـان هـەبووە، لەوانـە: (سـەید سـاڵح عەبـدولڕەحمان، مامۆسـتا شـەریف، سـەعید شـێخ عەبـدوڵڵا، مـەلا حەسـەن ئەحمەد، پەروێز کاکەیی، ئەحمـەد حـاجی فـەتاح، ئیکـرام کاکـە حەمـە، وریـا، سەدرەدین).

٤- **لقی دهۆك:** مەلا عەلی مزوری، لێپرسراوی لق بووە.

٥- **لقی بەغدا:** حەسەن عوسمان ناسراو بەمامۆستا عەبدولکەریم، بەرپرسی لـق بـوو. ئەنـدامانی لـق: خـەلیل سـەیفوڵڵا، حەسـەن حەمـە ناسـر، مامۆسـتا جەدعان، نەجمەدین عەلی، وسەین.

٦- **ڕێکخستنەکانی گەرمیان:** سـەرەتا، عـەلی ئەکبـەر فـەیزوڵڵا ناسـراو بـە (مامۆسـتا دلـشاد)، سەرپەرشـتی ڕێکخـستنەکانی شـاری خانـەقین و ناوچـەی گەرمیانی کردووە. دوای ئەوەی مامۆستا دلشاد پەیوەندی بەشاخەوە کردووە، (نیزامـەدین گلـی) بۆتـە لێپرسـراوی لـق. ئـەم لقـە کۆمـەڵێك ئەنـدامی چـالاکی هەبووە، لەوانە: (هاورێ کـاوە) لـەخورماتو. شـێخ حوسـێن، مـەلا قـادر سـاڵح، عومەری چوار شاخ، لەکفری. محەمەد مەجید عەزیز، عەبدولواحید عوبێد، مـەلا غەریب عەبدوڵڵا، مەلا حەسەنی زەرین لەکەلار و خانەقین.

هەروەها لەزانکۆکانی بەغداش، موحسین عەبدولڕەحمان (ڕێبـوار)، ئیحـسان گلی (خەسرەو)، فەرەیدون مورشید (فاروق)، ئاری، ڕۆڵی دیاریان هەبووە.

شایانی گوتنە، دوای ئەوەی کەبزوتنەوە لەریزەکانی یـەکێتی، دەردەچـێت، جگە لەبەشێکی کەم لەڕێکخستنەکانی سلێمانی، لقەکان و ڕێکخـستنەکانی تـر، هەمووی لەگەڵ بزوتنەوە بوون.

پاش دەستگیرکردنی کاردۆ و عەلی هەژار، ڕێکخـستنەکان، ماوەیـەك، کـپ و بێ دەنگ بووینە. شیرازەی ڕێکخستنـەکان، سست بووە. لەبەر ئەوەی، ئـەوان، ئیعترافیان لەسەر کەس نەکردووە، هـیچ ئەنـدامێك بـەهۆی ئەوانـەوە دەسـتگیر

نــەكراوە. دوای ماوەیــەك، ســەرلەنوێ، ڕێكخــستنەكان ڕێكخراونەتــەوە. بەرپرسیاریەتیەكان، دابەش كراونەتـەوە و دووبـارە دەسـت بەچالاكی نوانـدن، كراوەتـەوە. دوای ئـەوەی كـە (محەمـەد شـاكەلی)، بەرپرسـی ڕێكخـستنەكانی ناوخۆ، لەساڵی (١٩٨٢)، پەیوەندی بەشاخەوە كردووە، جـەمال حەمـە نوقڵـە، بۆتە بەرپرسی ڕێكخستنەكان.

ساڵی (١٩٨٧)، بەهۆی هەڵەیەكی نەخوازراوەوە، شـیرازەی ڕێكخـستنەكان، ئاشـكرا بووینــە. (جــەمال حەمــە نوقڵــە)، لەلایــەن دائـیرەی ئەمنــەوە، دەستگیركراوە. ملازم مەجید كاكەیی، لێپرسراوی لقی سـلێمانی و دایـە گوڵـە و مــەحمودی كـوڕی لەپــشدەر، لەلایــەن ڕژێمــەوە گـیراون و لەسـێدارە دراون. هــەروەها (نیزامــەدین گلــی)، بەرپرســی ڕێكخــستنەكانی گــەرمیان و بەغـدا، دەستگیركرا. مامۆسـتا حەسـەن عوسمـان ئاشـكرا بـوو و گـیرا. محەمـەد شـێخ عزەدین، بەرپرسی لقی كەركوك، فەرمانی گرتنی بۆ دەرچـوو، بـەڵام زوو بـەخۆ كەوت و خۆی شـاردەوە و دەسـتگیر نـەكرا. لەوەتـەی بزوتنـەوە، دواتـر حزبـی سۆسیالیـست دروسـت بـووە، گـەورەترین گـورز بـەر ڕێكخـستنەكان كـەوتبێت: ئاشكرا بوونی رایەڵەی ڕێكخستنەكان لەساڵی ١٩٨٧، بووە.

## ٢- ئەركی ڕێكخستنەكان

ڕێكخـستنەكانی حزبـی سۆسیالیـستی كوردسـتان، بەبـەراورد بەڕێكخـستنی حزب و لایەنە كوردستانییەكان، ڕێكخستنێكی خاوەن دیسپلین و جێگای متمانە بوون، بەتایبەتیش لەم كاتانەی كەئەنـدامێك یـان لێپرسـراوی شـانەیەك ئاشـكرا دەبوو، لەلایەن ڕژێمەوە، دەستگیر دەكرا، زۆر دەگمەن بووە ناوی ئەو كەسانە ئاشكرا بكات كەلەگەڵیاندا، كاری ڕێكخـستنی كـردووە. ئـەو ئەندامانـەی حـزب، لەژێر سایەی ڕژێم و لەخەباتی سیاسی ژێر زەمینیدا، زۆر ئەرك و كاری گرنگیان لەلایــەن حزبــەوە پــێ ســپێردرابوون، دەتــوانین گــرنگترین ئــەو ئەركانــەی كەرایانپەڕاندووە، لەم خاڵانەی خوارەوەدا، كورتیان بكەینەوە:

١- ئەركی كۆكردنەوەی هەواڵ، راپـۆرت نووسـین، دەستنیـشانكردنی كەسـانی سەر بەڕژێم و دیاریكردنیان بۆ هێزەكانی پێشمەرگە.

٢- بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، پڕوپاگەندە کردن بۆ حزب و شۆڕش و گەورە و بەهێز نیشاندانیان، بەپێچەوانەش، بچووککردنەوەی هەیبەت و سام و جەبەڕوتی هێزەکانی رژێم. هەروەها بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەر و نزیککردنەوەی بەدیهاتنی ئەو ئامانجە دوور و نزیکانەی کەحزب و شۆڕش لەپێناویاندا، داویانەتە شاخ.

٣- بڵاوکردنەوە و دابەشکردن و بەدیوار هەڵواسینی پۆستەری شەهیدان، بەیاننامە، چالاکییەکانی پێشمەرگە، بڵاوکراوەکانی حزب، لەشوێنە گشتییەکانی وەك: (شەقام، کۆڵان، قوتابخانە، دائیرەی حکومی، مزگەوت...تاد)ەکان.

٤- نووسینی دروشمەکانی حزب و هێزی پێشمەرگە، لەسەر دیوار و شوێنە گشتیەکان، کەبەشێوەی سەرەکی سوود لەتاریکی شەو وەردەگیرا و، بەدیقەتەوە، ئەنجام دەدرا. دوو تا سێ کەس، بەم کارە هەڵدەستان، کەیەك دوانیان، کاری ئاگاداری و چاودێرییان دەگرتە ئەستۆ و ئەوەی تریشیان، کارەکەی ئەنجام دەدا.

٥- کۆکردنەوەی ئابۆنە و گەیاندنیان بەدەزگاکانی حزب.

٦- زەمینە خۆشکردن بۆ راپەڕین و خۆپیشاندان لەدژی رژێم و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیان و بەشداری کردنیان بەشێوەیەکی کردەیی و کاریگەر، لەنێو خۆپیشاندانەکان.

٧- چاوساغی کردن بۆ هێزەکانی پێشمەرگە و رێنوێنی کردنیان، لەچوونیان لەشوێنێکەوە، بۆ شوێنێکی تر.

٨- شاردنەوە و ماڵ و شوێن دابینکردن و گواستنەوەی ئەو لێپرسراو و کادیرانەی کەبەنیازی کاری رێکخستن دەهاتنە ناو شار و شارۆچکە و گوندەکان، یان ئەو مەفرەزانەی پێشمەرگە، کەبەنیازی گورز وەشاندن لەدامودەزگاکانی رژێم و تەمبێ کردنی سیخوڕ و دار و دەستەکانی دەهاتنە ناو شارەکان.

٩- دابینکردنی دەرمان و گواستنەوەیان بۆ ناوچە ئازادکراوەکان. هەندێك جارانیش، هێنانی برینداره‌کانی هێزی پێشمەرگە بۆ ناو شارەکان و

شاردنەوەیان و پەیداکردنی دکتۆر و برین پێچی شارەزا و جێی باوەڕ و متمانە بۆ چارەسەرکردنیان.

١٠- هێنان و بردنی نامە، لەنێوان پێشمەرگە و کەس و کاریاندا. ئەوکات، شێوەی نامەکان: چوکلێتە نامە بوون. بۆ ئەوەی کەبەئاسانی بشاردرێنەوە نامەکان لەسەر کاغەزی زۆر تەنك دەنووسران. پاشان دەق و نوشت دەکران، تا قەبارەی چوکلێتێکی ئاسایی وەردەگرت، ئینجا بەتێپێکی نایلۆنی روون و تەنك دەپێچرا، تاوەکو زوو و بەئاسانی بشاردرێنەوە.. نامەکان، ئەوەندە بچووك دەکرانەوە، کەجاری وا هەبوو، لەکاتی تەنگانە و مەترسی گیرانیان، کەسی نامە هەڵگر، ئامادە بوو قوتی بدات، نەوەك لەدەستییەوە ئاشکرا بێت و بگیرێت.

١١- هێنانی گۆڤار و رۆژنامە و بڵاوکراوەکانی حزب، بۆ ناو شارەکان و دابەشکردنیان بەسەر رێکخستنەکاندا. لەم حاڵەتەشدا، زێتر سوود لەئافرەتان وەردەگیرا، چونکە کەمتر رووبەڕووی پشکنینی ورد و، کۆنترۆڵکردن، دەبوونەوە.

١٢- رێکخستنەکان، یارمەتی و هەوڵی گەیاندنی ژن و منداڵی پێشمەرگەکانیان بۆ ناوچە ئازادکراوەکان، دەدا.

١٣- بەشێوەیەکی کردەیی و کاریگەر، وەك پێشمەرگە، لەئەنجامدانی چالاکییەکانی پێشمەرگە لەناو شارەکاندا، بەشدار دەبوون.

١٤- رێنوێنی ئەو کەسانەیان دەکرد کەفیراری عەسکەری بوون و دەیانویست پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە، بکەن، لەلایەن رێکخستنەکانەوە، تەزکیە دەکران و دەگەیەنرانە ناوچە ئازادکراوەکان.

١٥- رێکخستنەکان، هەوڵیاندەدا، ئەو کەسانەی کەجێگای چاوانیان تێدا بوو، تاوان و کاری خراپیان دەرهەق بەمیللەت ئەنجام نەدابوو، لەنێو ریزی جاش و ئەمن و ئیستخبارات دەربکەن و بیانهێننەوە سەر رێگای نیشتمانپەروەری.

١٦- زۆر جاران، لەکاتی پێویستدا، لەپێناو کۆکردنەوەی پارە و پیتاك، نامەی حزبیان دەگەیاندە دەوڵەمەند و خاوەن کۆمپانیاکان و بەڵێندەرە خودا پێداوەکان و، هەروەها پارە و یارمەتیەکانیان، بەئەمانەتەوە، دەگەیاندە حزب.

## ٣- چوونە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان

دوای ئـەوەی کەلـەڕێگای هاتووچـۆوە، مـام جـەلال پەیوەنـدی بـەهاوڕێ دێرینـەکانی لەبزوتنـەوە (عـەلی عەسـکەری و د. خالیـد و عومـەر دەبابـە)وە، دەکات. ڕازیـان دەکـات کەبـچنە نـاو ئـەو ڕێکخـراوە نیـمچە بەرەییـەی یـەکێتی کەلەکۆتایی مایس و سەرەتای حوزەیرانی ١٩٧٥، لەدیمەشق دایمەزرانـدبوو... بەڵێنیشی پێدابوون، کەخۆیشی بەزووترین کات دەگەڕێتەوە کوردستان و چـەك و تفاقی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی چەکداری، لەڕێگای سوریا و لیبیاوە، پـەیدا کردووە. بەشێك لەدامەزرێنەر و ئەندامانی سـەرکردایەتی بزوتنـەوە، بـەوە ڕازی نەبوون بچنە ناو یەکێتییەوە، چونکە هـەر لەسـەرەتاوە، ئامـانج لەدامەزرانـدنی بزوتنەوە، جەخت کـردن بـوو لەسـەر چارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد لـەڕێگای گفتوگۆ و دانوستاندنی ئاشتیانە و دروسـتکردنی هێڵێکـی سیاسـی تـازە (هێڵـی سێیەم)، دوور لەئاراستەی جەلالی و مەلایی. ئەوانەی کەحەزیان نـەدەکرد بـچنە ناو ئەم بەرەیەی یەکێتی، بریتی بوون لە: (سـالح یوسـفی، عـەلی هـەژار، کـاردۆ گەلاڵی، ڕەسوڵ مامەند). ئەوانەش کەلایەنگیری ئـەوەبوون بـچنە نـاو یـەکێتی، بەڵام وەك ڕێکخراوێکی جیاواز، سەربەخۆیی خۆیان بپـارێزن، بریتـی بـوون لـە: (عـــەلی عەســـکەری، د. خالیـــد، عومـــەر مـــستەفا دەبابـــە، نـــورەدین عەبدولڕەحمان...). ئەمانە: پێشتر، لەریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردسـتان- باڵی مەکتەبی سیاسی، چالاك و کەسایەتی دیار بوون. دۆستایەتی و پەیوەنـدی باشـیان، لەگـەڵ (مـام جـەلال)دا، هـەبوو. سـەعدی گـچکە و سـەید کاکـەش، پەرۆشـی ئـەوە بـوون، زوو بـچنەوە شـاخ، چـونکە ئـەوان پێیـان وابـوو، لـەژێر سایەی حکومەت، سیاسەت نـاکرێ و لـەژیانی دوورخـراوەیش، بێـزار ببـوون... ئەوانە: هەرچەندە پێشینەی کارکردنیان لەگەڵ مام جەلال نەبوو، بەڵام لەخاڵی زوو چـوونەوە شـاخ و هەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش لەگـەڵ یـەکێتی و هەرسـێ ئەندامە دیارەکەی بزوتنـەوە، هاوڕابوون.

لەژێر فـشاری ڕازیبووەکـان، ناڕازییـەکانیش (ئەگـەر بەنابـەدڵیش بووبێـت)، بڕیـاری ئـــەوەیان دا، بـــچنە نـــاو یەکێتییـــەوە، بەمـــەرجێك کـــەدوور بـــن

لەدژایەتیکردنی پارتی و بنەماڵەی بارزانی، چونکە کورد لەم رووەوە، لەرابردوودا، زۆر زیانی گیانی و ماددی و مەعنەوی بەرکەوتووە.

دوای ئەوەی کەیەکەم دەستەی بزوتنەوە دەچنەوە شاخ، (عومەر دەبابە)ش، بۆ جاری دووەم و یەکجاری لە ١٩٧٦/١١/٦، لەبەغداوە دەچێتە سوریا و لەگەڵ دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی لەدیمەشق کۆدەبێتەوە. بەفەرمی پرۆتۆکۆڵی چوونە ناو یەکێتی، مۆر دەکات... لەوساوە، لەپاڵ (کۆمەڵە)، (بزوتنەوە)ش دەبێتە باڵێکی کاریگەر و سەنگینی ناو یەکێتی. تا مام جەلال بۆ یەکەم جار (پایزی ١٩٧٧)، دەگەڕێتەوە کوردستان، کاری سیاسی و رێکخراوەیی و پێشمەرگایەتی یەکێتی (بزوتنەوە، کۆمەڵە)، لەشاخ رێکخراو نەبوو... کار و چالاکی سیاسی و عەسکەرییان، پێکەوە دەکرد، بەڵام دیار نەبوو، کێ سەرکردەیە؟ کێ ئەندامی مەکتەبی سیاسییە؟ کێ لێپرسراوی هێزی پێشمەرگەیە؟ ئەوەی هەبوو، شتێکی خۆڕسك و ناڕێکخراو بوو. کەمام جەلال دێتەوە، لەیەکەم کۆبوونەوەدا، لەناوچەی برادۆست لە (٨/٣١ تاوەکو ١٩٧٧/٩/١٢)، هێزی پێشمەرگە رێکدەخەن. بۆ هەر ناوچەیەك، سەرکردەیەکی مەیدانی، دەستنیشان دەکەن. کۆمیتەیەکی سەرکردایەتیش لەبیست کەس پێکدەهێنن. کەشەشیان بزوتنەوە بوون، بریتی بوون لە: (عەلی عەسکەری، رەسوڵ مامەند، د. خالید سەعید، تایەری عەلی والی، سەعدی عەزیز، عومەر مستەفا)[٨٣]. ئەوانی تریش (کۆمەڵە و خەتی گشتی) بوون. لەناو ئەم بیست ئەندامەش، مەکتەبی سیاسی، هەڵدەبژێرن، کە (عەلی عەسکەری و رەسوڵ مامەند)، نوێنەرایەتی بزوتنەوەیان دەکرد.

دوای تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر یەکەم کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی، جارێکی تر، سەرکردایەتی یەکێتی لەشوباتی ١٩٧٨، لە (نۆکان)، کۆدەبێتەوە. ئەمجارەیان گۆڕانکاری لەئەندامەکانی بزوتنەوە لەسەرکردایەتی یەکێتی، دەکرێت. رەسوڵ مامەند و سەعدی گچکە، دوور دەکەونەوە. لەجیاتی ئەوان (حاجی حاجی برایم و سەید کاکە)، شوێنی ئەوان، دەگرنەوە... ئەندامەکانی بزوتنەوە لەسەرکردایەتی یەکێتی، بەم شێوەیە دەبێت: (عەلی عەسکەری، تایەری عەلی والی، خالید سەعید، سەید کاکە، حاجی

حـاجی بـرایم، عومـەر مـستەفا)[٨٤]. لـەدووەم کۆبوونـەوەدا، سـەعدی گـچکە لەکۆمیتەی سەرکردایەتی دەردەچێت. (رەسوڵ مامەنـد)یـش، بەهـەمان شـێوە دەست لەئەنـدامی سـەرکردایەتی و مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتی، دەکێـشێتەوە. ئـەمجارەیان عـەلی عەسـکەری و تایـەری عـەلی والی، لەمەکتـەبی سیاسـی، نوێنەرایەتی بزوتنەوەیان دەکرد.

لـەم کۆبوونەوەیـەدا، هـێڵ و ئامـاژەی نـەگونجان و ناکۆکییـەکانی نێـوان بزوتنـــەوە و کۆمەڵـــە، وردە وردە، دەردەکـــەون... رەســـوڵ مامەنـــد، ســـەرکردەیەکی دیـــاری بزوتنـــەوە بـــوو، کەچـــی هـــیچ لێپرســـراویەتیەکی لەسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی، وەرنەگرت، یان پێنەدرا.

## ٤- هەرێم و هێزەکان

بزوتنـەوە، تـا ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٧٧، لـەرووی رێکخـستنی هێزەکـانی پێـشمەرگەوە، شـێوە رێکخـستنێکی رێکخـراوی نـەبوو. هێـز و مـەفرەزەکان، بەشێوەیەکی رێك و پێك دابـەش نـەکرابوون. دوای ناوەڕاسـتی ١٩٧٧، خـەڵکی زۆرتـر، پەیوەنـدیان بـەهێزەکانی پێـشمەرگەوە کـرد. هێزەکـان، لـەرووی چـەندایەتی و چـۆنایەتییەوە، گەشـەکردنێکی بەرچـاوی بەخۆیـەوە بینـی. واقیعەکە، ئەوەی فەرز کـرد کەچاوێك بەپێکهاتـەی هێزەکانـدا، بخشێنرێتەوە. هێز و شـوێنی چالاکییەکانیان، لەیـەکتر جیـا بکرێنـەوە. هـەر لێپرسـراوێکیش، سنوری جوگرافی خەباتی خـۆی بزانێـت. ئـەوکات بزوتنـەوە، تەمـەنی خـەباتی شاخی تەنها سێزدە مانگ بوو... مام جەلال، بۆ یەکەم جار، لـەکۆتایی مـانگی ئـابی ١٩٧٧، گەڕایـەوە کوردسـتان. دەسـتوبردی کـرد، یەکـەم کۆبوونـەوەی سەرکردایەتیان لە ١٩٧٧/٨/٣١، لەناوچەی برادۆست گرێدا. تەواوی لێپرسـراوە باڵاکانی هەرسێ باڵەکەی یەکێتی (کۆمەڵـە، بزوتنـەوە، خـەتی گـشتی)، تیایـدا بەشـداربوون. کۆبوونەوەکـە دوازدە رۆژی خایانـد و لـە ١٩٧٧/٩/١٢، کۆتـایی پێهات. لەم کۆبوونەوەیـەدا لێپرسـراویەتی عەسـکەری و سیاسـی، دابـەش کـرا. وشەی (هەرێم) لەم کۆبوونەوەیەدا، لەجیاتی بەتالیۆنی جاران، داهێنرا.

(هــەرێم): (یەکەیــەکی جوگرافییــە، ســنووری بــەپێی پێویــستی شــەڕی

پێشمەرگانە، دیاریکراوە. لەئەیلولی ١٩٧٧، لەکۆبوونەوەی برادۆست، بۆ یەکەم جار داهێنرا.. کوردستان کرا بەهەشت هەرێم.. هەرێمی بادینان: حوسێن بابەشێخ، هەرێمی پێنجوین و هەورامان: تاهیری عەلی والی، هەرێمی دەشتی هەولێر: سەعدی گچکە، هەرێمی شارباژێڕ: نەوشێروان مستەفا، هەرێمی دەشتی کەرکوك و قەڵاسیوکە: ئەنوەری مەجید سوڵتان، هەرێمی قەرەداغ: عومەر عەبدوڵڵا، هەرێمی خۆشناوەتی: سەید کاکە، هەرێمی پشدەر: تالیب رۆستەم)[٨٥]، لێپرسراوی بوون. ماوەیەکی کەم تالیب رۆستەم لەفەرماندەی هەرێمی پشدەر دەمێنێتەوە، دوای ئەمە (قادر مامەند ئاغای پشدەر)، شوێنەکەی ئەو دەگرێتەوە. قادر مامەند ئاغا لەشەڕەکەی (هەکاری)دا، بەدیلی کەوتۆتە دەستی قیادە موەقەتە.

هەر هەرێمێك، لەچەند کەرتێك پێکهاتبوو، کەخۆی لە (٦-٧) کەرت داوە. هەر کەرتێکیش بریتی بووە لە (٢٠-٥٠) پێشمەرگە. ئەم ژمارەیە، بەگوێرەی کات و شوێن، گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. لەکەرتیش بچووکتر، مەفرەزە بووە. هەرێمەکان، لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە، وەك یەك نەبووینە. هەرێمی وا هەبووە، لەدوو سەد پێشمەرگە زیاتری هەبوو، هی وایش هەبووە، ژمارەی پێشمەرگەکانی لە (٥٠-٦٠) پێشمەرگە، تێپەڕی نەکردووە.

لەم لێپرسراویەتی دابەش کردنەدا، لەکۆی هەشت هەرێم، بزوتنەوە چواری بەرکەوتووە. واتە: نیوەی هەرێمەکان، فەرماندەکانیان بزوتنەوە بوون.

دوای ئەوەی کەبزوتنەوە ناتوانێت لەمە زیاتر لەنێو نیمچە بەرەی یەکێتی دا بمێنێتەوە، لەنەورۆزی ١٩٧٩دا، جیا دەبێتەوە. لەساتی جیابوونەوەی، تاوەکو بوونی بە (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، دواتر (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، تا راپەڕین، هەرێم و هێزەکان، بەم شێوەیە بوون:

### * یەکەم هەرێمەکان:

**- هەرێمی یەك (١):** بەهەرێمی (شارەزوور و هەورامان)یش بەناوبانگ بووە. شوێنی چالاکییەکانی، دەڤەری شارەزوور و هەورامان بووە. لەساڵی (١٩٨٢)دا، بارەگای سەرەکی لە (دەرەکۆر) بووە. لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٥دا، بارەگای

له (چەمەك)ی لای (شەخەل و مارین) بووە. لەئەیلولی ١٩٨٦دا، هەردوو هەرێمی (١و٢) کراونەتە یەك و (حاجی عەبدوڵڵا) کراوەتە فەرماندەی هەردوو هەرێمە یەکگرتووەکە.

**- هەرێمی دوو (٢):** بەهەرێمی دووی شلێر بەناوبانگ بووە. چالاکییەکانی لەسنووری پێنجوین بۆ تەوێڵە و بەمۆ بووە. لەساڵی (١٩٧٩- کۆتایی ١٩٨٢)، ئەنوەر سەعید والی، فەرماندەی بووە. دوای ئەوەی کەئەنوەر والی لەکارەساتی هەرەس هێنانی بەفری قەندیل لە ١٩٨٢/١٢/٢دا، شەهید بووە، مەلا نوری بۆتە فەرماندەی ئەم هەرێمە. لەناوەراستی ١٩٨٥دا، بارەگای هەرێم لەشاوڵێ و شلێر بووە.

**- هەرێمی سێ (٣):** لەئەیلولی ساڵی ١٩٧٩ بەولاوە، (عوسمانی قادر منەوەر)، فەرماندەی بووە. سنووری چالاکیەکانی، ناوچەی شارباژێڕ بووە. لەساڵی ١٩٨٢دا، بارەگاکەی لەعازەبان و شارباژێڕ بووە. تا دەچێتە

ناو پارتی دیموکراتی کوردستان، هەر عوسمان فەرماندەی بووە، (مام ئاراس)یش جێگری بووە. دوای عوسمان، (جەمالی حەمەلاو)، بۆتە فەرماندەی ئەم هەرێمە. دوای ئاشتبوونەوەی یەکێتی و سۆسیالیست، بارەگای هەرێم، لەنەورۆزی ١٩٨٦، بۆ شارباژێڕ و دەوروبەری شاری سلێمانی، دەگەڕێتەوە.

**- هەرێمی چوار (٤):** لەیەك کاتدا، شێرکۆ شێخ عەلی، هەم لێپرسراوی لقی سلێمانی حزب و هەم فەرماندەی هەرێمی چوار بووە. ئەم هەرێمە، بەهەرێمی چواری (جافایەتی)یش، بەناوبانگ بووە. پاش ئەوەی شێرکۆ لەشەڕی ناوخۆ لەگەڵ یەکێتیدا، شەهید بووە، مامۆستا شەریف بۆتە فەرماندەی هەرێم. لەساڵی (١٩٨٢)، بارەگاکەی لە (سێکانیان) بووە. دواتر، بۆ ناوچەی سورداش و دوکان، گواستراوەتەوە. کەمامۆستا (شەریف)یش شەهید بووە، (قادر چاوشین)، جێگاکەی ئەوی گرتۆتەوە. بۆ ماوەیەکی کەم، قادر چاوشین، ریزەکانی (سۆسیالیست)ی بەجێهێشتووە و پەیوەندی بە (پارتی)یەوە کردووە. دواتر، لەکۆتایی مانگی ١٢ی ١٩٨٥دا، گەڕاوەتەوە ناو سۆسیالیست. تا راپەڕین، ناوبراو فەرماندەی هەرێم بووە. بارەگاکانی هەردوو هەرێمی (٣و٤)، لەچنارەی شەخەل بووە. دوای ئاشتبوونەوە لەگەڵ یەکێتی، لەنەورۆزی

١٩٨٦دا، بارەگای هەرێم دووبارە گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی لەدۆڵی جافایەتی و دوکان.

- **هەرێمی پێنج (٥)**: ڕەئوفی خەلیفە سەعید، تارۆژی شەهید بوونی لە ٢١-١٩٨١/٧/٢٢دا، فەرماندەی هەرێم بووە. سنوری چالاکیەکانی، شارەزوور و قەرەداغ بووە. دواتر شوێنی چالاکیەکانی بۆ ناوچەی دەربەندیخان گواستۆتەوە. لەساڵی (١٩٨٥)دا، بارەگای سەرەکی هەرێم لەملەخورد و (پلەی مەلا مستەفا)، بووە.

- **هەرێمی شەش (٦)**: بەهەرێمی شەشی (پشدەر) بەناوبانگ بووە. چالاکیەکانی لەدەڤەری مەرگە و پشدەر، ئەنجام داوە. لەساڵی (١٩٨٣)دا، (عەبدوڵڵا بەگ) فەرماندەی هەرێم بووە. دواتر (موحسین باین)[٨٦]، بۆتە فەرماندە و تا ڕاپەڕین، هەر ناوبراو لێپرسراوی بووە.

- **هەرێمی حەوت (٧)**: بەهەرێمی (قەرەچوغ)یش بەناوبانگ بووە. لەدوای یەکەم کۆنگرەی حزب لە ١٩٨١/٥/١٥، دامەزراوە. غەفور دەروێش ئەحمەد مەحمود، ناسراو بە (مامە غەفە)، فەرماندەی بووە. دوای ئەوەی لەمانگی ئابی ١٩٨٤دا، ناوبراو، ڕیزەکانی سۆسیالیستی بەجێهێشتووە و پەیوەندی بە (یەکێتی)یەوە کردووە، سەید عەبدوڵڵا کەردزی[٨٧]، بۆتە فەرماندەی هەرێم.

- **هەرێمی هەشت (٨)**: بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر بەناوبانگ بووە. (قادر مستەفا)، فەرماندەی هەرێم بووە. دوای شەهید بوونی ناوبراو لە ١٩٨٥/١١/٥، محەمەد عەبدوڵڵا جێگاکەی گرتۆتەوە. پێش ڕاپەڕین، شێرزاد قادر مستەفا، بۆتە فەرماندەی ئەم هەرێمە. لەساڵانی (١٩٧٩-١٩٨٤)دا، هەرێمی هەشت لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە، یەکێك بووە لەهەرێمە چالاك و دەست وەشێنەکانی حزبی سۆسیالیست، دۆست و دوژمن، حیسابی زۆریان، بۆ کردووە.

- **هەرێمی نۆ (٩)**: بەهەرێمی نۆی (باڵەك)، یان (ڕۆست)یش بەناوبانگ بووە. چالاکیەکانی لەدەڤەری باڵەکایەتی ئەنجامداوە. لەساڵی (١٩٧٩-١٩٨١)دا، ئەحمەد فەقێ ڕەش[٨٨]، فەرماندەی بووە. تا شەهید بوونی ناوبراو لە ١٩٨٥/١١/٢٦، هەر ئەو لێپرسراوی هەرێم بووە.

– **هـــەرێمی دە (١٠)**: بەهـــەرێمی دەی (ســـەفین)یـــش بـــەناوبانگ بـــووە. چالاکیەکانی لەدەوروبەری چیای سەفین و خۆشـناوەتی، ئەنجامـداوە. لەسـاڵی (١٩٧٩–١٩٨٠)، (ئەحمەد خـان)[٨٩]، فەرمانـدەی بـووە. دوای ئـەوەی نـاوبراو شەهید بووە، عەلی مەولود، ناسراو بـە (عـەریف عـەلی)، بۆتـە فەرمانـدەی ئـەم هەرێمە.

– **هەرێمی یازدە (١١)**: بەهەرێمی (باواجی)یش بەناوبانگ بـووە. سـنووری چالاکییەکانی دەڤـەری چیای بـاواجی و ناوچـەی خۆشـناوەتی بـووە. لەسـاڵی (١٩٧٩)، تـاوەکو رۆژی شـەهید بـوونی، فەرمانـدەی خـاوەن ئـەزموون سـەلیم عەبدوڵڵا، ناسراو بە (سەلیم کێشکەیی)، فەرمانـدەی بووە. دوای نـاوبراو، بـەکر حەمە، (مەلا بەکر)، بۆتە فەرماندەی ئەم هەرێمـە. لەسـاڵی (١٩٨٥)، تەحـسین حەمە ساڵح[٩٠]، جێگای بەکر حەمەی گرتۆتەوە. دوای شەهید بوونی ناوبراو لـە (١٠/٤/١٩٨٧)، سابیر فەقێیانی، ناسراو بە (سابیر لاتە)، بۆتە فەرمانـدەی ئـەم هەرێمە.

– **هەرێمی دوازدە (١٢)**: بەهـەرێمی دوازدەی سـۆران، یـان (هەنـدرێن)یـش بەناوبانگ بـووە. دەڤـەری چـالاکییەکانی: حـەوزی رەوانـدز و دەوروبـەری ئـەم شارە بووە. عەبدوڵڵا موسلیح، ناسراو بە (عەبدوڵڵا بۆر)، تـاوەکو ئـابی ١٩٨٤، فەرماندەی ئەم هەرێمە بووە.

– **هەرێمی چواردە (١٤)**: چالاکییەکانی لەدەڤـەری (دۆڵـە رەقـە)، ئـەنجام داوە. عەبدوڵڵا سـور (عـەولا سـۆر)، تـا رۆژی شـەهید بـوونی لـە ١١/١١/١٩٨١، فەرماندەی هەرێم بووە. دوای ناوبراو (محەمەد)ی برای بۆتە فەرماندەی هەرێم. هەر دوای شەهید بـوونی عـەولا سـۆر، وردە وردە چـالاکیەکانی کـەم بۆتـەوە و لەکورتی داوە، دواتر کوێر بۆتەوە.

– **هەرێمی پازدە (١٥)**: بەهـەرێمی شـەهید (دکتـۆر خالیـد)یـش بـەناوبانگ بووە. چالاکییەکانی لەدەڤـەری رۆژهـەڵاتی کۆیـە و نزیـك رانیـە، ئـەنجام داوە. سەدیق کێخوا تەها کانی کـوردەیی، ناسـراو بـە (حەمەسـوور کـانی کـوردەیی)، فەرماندەی ئەم هەرێمە بووە، ژمارەی پێشمەرگەکانی، زۆر نەبووە.

– **هەرێمی حەڤدە (١٧)**: بەهەرێمی (کۆڕەك)یـش بـەناوبانگ بـووە. برهـان

حاجی عومەر بلەیی، تا پەیوەندی کردنی بەیەکێتی لەئابی ١٩٨٤، فەرماندەی هەرێمی کۆڕەك بووە.

**هەرێمی سێزدە (١٣)**، لەبەرئەوەی لەناو کوردەواریدا، وەك زۆربەی گەلانی جیهان[٩١]، سێزدە بەژمارەیەکی نەگبەت هێن بەناوبانگە، ئەم هەرێمە بوونی نەبووە. لەخوێندنەوە و دەورکردنەوەی هەموو ئەو سەرچاوانەی کەتایبەت بوونە بەبزوتنەوە (دواتر حزبی سۆسیالیست)، هەرێمی شازدەم بەرچاو نەکەوتووە. هەتا لەم کتێب و بابەتانەشدا کەلەپەراوێزدا باسی (حزبی سۆسیالیست)یان کردووە، شتێکی لەم شێوەیەم، نەبینیوە.

**لەقۆناغ و سەردەمی جیاجیاشدا، ئەم هەرێمانە بوونیان هەبووە:**

- لەساڵی ١٩٨٧-١٩٨٩، سمکۆ مەنتك، فەرماندەی هەرێمی (دێدەوان)[٩٢]، بووە.
- لەساڵی ١٩٨٧-١٩٨٩، بەکر حەمە، فەرماندەی هەرێمی پاراستنی بارەگای سەرکردایەتی بووە.
- ئەوکاتەی کەقادر عەزیز، لەساڵی ١٩٨٤ و ١٩٨٥دا، بەرپرسی لقی بادینان بووە، هەرێمی (زاخۆ)ش، هەبووە. لەچالاکیەکانی پێشمەرگەدا، ناوی هاتووە.

## * دووەم: هێزەکان:

ئەم هێزانەش (هێزی پێشمەرگەی حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، لەشوێن و قۆناغی جۆر بەجۆردا، بوونیان هەبووە و ناویان هاتووە. من دڵنیام زۆر لەمانە زیاتر بووینە کەمن باسیان دەکەم، بەڵام بەداخەوە، پاش سۆراخ کردن، هەر ئەوەندەم دەستکەوتووە. بۆ بەرز راگرتنی یاد و قارەمانێتی ئەم هێزانە و فەرماندە و پێشمەرگەکانی، پۆلینیان دەکەین:

- **هێزی هەیبەت سوڵتان:** دڵزار حوسێن[٩٣]، فەرماندەی بووە. ناوبراو، تاك و تەنیا، لەناو شاری کۆیە، لەبەهاری ١٩٨١، لەبۆسەیەك دا، بەرپرسی ئەمنی شاری کۆیە دەکوژێت. ئەم هێزە زۆر چالاك و ئەکتیڤ بووە.

- **هێـزی زورگـەزراو:** نـایف فـارس بـاوە، فەرمانـدەی بـووە. دوای ئـەوەی کەریزەکانی حزبی سۆسیالیستی بەجێهێشتووە و پەیوەندی بە (یـەکێتی)یـەوە کردووە، دکتۆر رەشید بۆتە فەرماندەی ئەم هێـزە. هێـزی زورگـەزراو، هێزێکـی چالاك بووە. دەیان چالاکی لەناو جەرگەی شاری هەولێر و دەوروبـەری ئـەنجام داوە. چەندین سیخوڕ و بـەکرێگیراوی، بەسزا گەیانـدووە. ئـەم هێـزە، لەسـاڵی (١٩٨١)ەوە تاوەکو بەهاری (١٩٨٦)یش، بوونی هەبووە.
- **هێـزی هــەورامان:** لەسـاڵی ١٩٨٢ تـاوەکو بـەهاری ١٩٨٦، لەچـالاکی ئەنجامدان بەردەوام بووە. لەساڵی ١٩٨٢دا، بارەگاکەی لە (بانی شار) بووە.
- **هێـزی دێـدەوان:** سـەید عەبـدوڵڵا کـەردزی فەرمانـدەی بـووە. لەسـاڵی (١٩٨١-١٩٨٤)، هێزێکی کاریگەر و دەست وەشێن بووە. دەیان چـالاکی لـەناو شاری هەولێر، ئەنجامداوە. تاوەکو بەهاری ١٩٨٦، چالاکی هەبووە.
- هێـزی جوتیـاران: لەناوچـەی شـارەزوور، چـالاکی ئەنجامـداوە. لەسـاڵی ١٩٨٦دا، هێزێکی چالاکی دەڤەرەکە بووە.
- **هێزی شەهید عەلی عەسکەری:** کەمال کێخوا عومەر، فەرماندەی بووە.
- **هێزی مەرگە:** محەمەد عەلی مامەند، برازای رەسول مامەنـد، فەرمانـدەی بووە.
- **هێـزی کـاژاو:** هێزێـك بـووە سـەر بـەلقی سـلێمانی. لەسـاڵانی (١٩٨١-١٩٨٥)دا، چالاکی هەبووە.
- **هێـزی سـیروان:** سـەر بـەلقی سـلێمانی و لەسـاڵانی (١٩٨١-١٩٨٥)دا، چالاکی هەبووە.
- **هێزی ئاسۆس:** چالاکییەکانی لەدەڤەری رانیە و قەڵادزە، ئەنجامداوە.

## ٥- رۆڵی هێزەکانی سۆسیالیست لەهەڵگیرساندنەوەی شۆڕشدا

بزوتنـەوە، (دواتـر حزبـی سۆسیالیـست)، کەدامـەزرا، بـەو نیـازە دانەمـەزرا کەرژێمی بەغدا بڕوخێنێت. ئەوان، کەسەرکردە و کادیری باڵای شۆڕشی ئەیلول بـوون، ئـەزموونێکی دەوڵەمەنـدیان هـەبوو، دەیـانزانی رژێمێـك کەهـەردوو جەمسەری رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا (وڵاتـە سۆسیالیـستەکان و سـەرمایەدارەکان)،

پشتگیری بکەن و خاوەن هێز و جبەخانەی زۆر و زەوەند بێت، کردەیی نییە کەبتوانرێت بەچەند چەکێکی کۆنی ژەنگاوی و، چەند سەد پێشمەرگەیەك، (کەبەشێکی زۆریان هەر چەکیان نەبووە)، بروخێنرێت... بۆیە چەك هەڵگرتن و دانە شاخیشیان هەر وەك نمایشێك بووە، بۆ نیشاندان و نمایشکردنی هێزی خۆیان بەرامبەر بەرژێم، تاوەکو ناچار بکرێت کەدان بەبوونیان بنرێت و ئامادەبن گوێ لەداواکانیان بگرن. ئەوکاتە (کۆتایی ١٩٧٥)، رێکخراوی (کۆمەڵە)ش، خەریکی کاری رێکخستن بوون. ئەوان (رێکخراوێکی بچکۆلانەی نهێنی لاواز و نەناسراو بوون. سنووری رێکخستنەکەشیان لەشارەکانی کوردستانی عێراق وەکو: سلێمانی، کەرکوك، هەولێر، خانەقین، هەڵەبجە لەگەڵ رێکخستنی بەغدا، تێ نەدەپەڕی. ژمارەی ئەندامەکانی لە ٣٠-٤٠ کەس لەهەر شارێك لەم شارانەی سەرەوە پتر نەبوو)[٩٤]. بۆ چەك هەڵگرتن و دانەوە شاخیش، کۆمەڵە و بزوتنەوە، لەدوو دیدگای جیاوازەوە، لەم پرسەیان دەڕوانی. لەم کاتەدا، شەهید ئارام (شاسوار جەلال)، بەهۆی گیرانی سەرکردە دیارەکانی تری ئەم رێکخراوە و نەبوونی کەسێکی تری شایستە، ببووە کەسی یەکەم و هەرە دیاری کۆمەڵە. ئەو، بڕوای وابوو (دەستەی چەکداری بچووك بچووك ئامادە بکرێ، کەئەرکی سەرەکیان هۆشیارکردنەوەی کۆمەلانی خەڵك بێت، پەلە نەکرێ لەشەڕ و پێکدادان و چالاکی سەربازی، لەو کاتەدا عەلی عەسکەری- کەسایەتی دیار و دەست رۆیشتووی بزوتنەوە- پێی وابوو تەنیا سەرکردایەتیەك هەرەسی هێناوە- مەبەست لەشۆڕشی ئەیلولە- دەنا جەماوەر هەمان جەماوەرە و رژێمیش هەمان رژێم و زوڵم و زۆرداریش هەر بەردەوامە... هەروەها عەلی عەسکەری سەرجەمی بیرکردنەوە و بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە دەردەبڕی: دەبێ خۆپیشاندانێکی چەکدارانە بکەین، بۆ ئەوەی رژێم مفاوەزاتمان لەگەڵدا بکات. بۆیە هەوڵیان دەدا بەکورترین ماوە گەورەترین ژمارەی چەکدار لەخۆیان کۆبکەنەوە. ئەنجام هەرواش کەوتەوە، بەچاوتروکانێك، سەدان چەکداریان لەخۆیان کۆکردەوە)[٩٥].

بەهۆی ئەوەی سەرکردەکانی بزوتنەوە (چ عەسکەری و چ سیاسی)، لەهەردوو باڵە سەرەکییەکەی بزوتنەوەی کورد (پارتی و باڵی مەکتەبی

سیاسی، یان مەلایی و جەلالی)، پێکهاتبوون، ئەوەیان بەرەوا دەزانی کەنوێنەرایەتی شۆڕش بکەن و جەماوەر بۆ خۆیان کۆبکەنەوە. جگە لەمەش، بزوتنەوە، خۆی بەنوێنەری تاکە چین و توێژێك نەدەزانی، بەڵکو خۆی بەدرێژەپێدەری پارتی دیموکراتی کوردستان، بەشێوەیەکی پێشکەوتوخوازانەتر دەزانی و، بڕوای بەگرێدانی خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی هەبوو. هەوڵیدەدا، لەشۆڕشی نوێدا، هەموو چین و توێژەکان، لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە.

کەجاڕی شۆڕشی چەکداری درا، کۆمەڵە، چەند مانگێك[٩٦]، پێش بزوتنەوە، مەفرەزەی چەکداری ڕەوانەی شاخ کردبوو، وەلێ ئەو دەست پێشخەریەی کۆمەڵە ڕێگای لەوە نەگرت، کەلەرووی چەندایەتییەوە، لەدوای بزوتنەوەوە بن. (هێزی چەکداری کۆمەڵە لەو کاتەدا بەپەنجەی دەست دەژمێردرا، لەچاو ئەو هێزەی لەدەوری بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان کۆببۆوە. بوونی دوو سیاسەت و جیهانبینی زۆر جیاواز، بوونی دوو هێز، یەکێکیان گەورە و ئەوەکەشیان زۆر بچووك، تەرازووەکەی بەتەواوی بەقازانجی بزوتنەوە داشکاندبوو)[٩٧].

پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، بەتایبەتیش لەدەشتی هەولێر و ناوچەی خۆشناوەتی، (لەناو هێزە زۆر و زەبەندەکانی پێشمەرگەی بزوتنەوە وجودیان زۆر لاواز و کز بوو)[٩٨]. بەهۆی بالا دەستی بزوتنەوە لەدەشتی هەولێر و کۆیە، کۆمەڵە ئەو هەلەی بۆ نەدەڕەخسا کەرێکخستنەکانی لەناو هێزی پێشمەرگەدا فراوان بکات، جگە لەوەش بەهۆی جیاوازی بۆچوون و جیهانبینییانەوە بزوتنەوە ئەو هەلەی بۆ کۆمەڵە نەدەڕەخساند. بەپێچەوانەی ئەوەوە، ئەوکاتە– ناوەڕاستی ١٩٧٨–، کۆمەڵە لەسنوری هەڵەبجە و هەورامان ڕێگەیان نەدەدا خەتی گشتی و بزوتنەوەی سۆسیالیست کاربکەن، بەتایبەتی لەدروستکردنی ڕێکخستنیان لەناو پێشمەرگەدا[٩٩].

لەگەڵ ئەو کێبڕکێ و ململانێیەشدا، دەکرێ بڵێین: لەدروستکردنەوەی شۆڕشی نوێ و مەفرەزە سەرەتاییەکاندا بزوتنەوە فەرماندەکانیان دەوری بەرچاو و کاریگەریان بینی[١٠٠].

پاش تۆختر بوونی ململانێکـان و شـەهید بـوونی عـەلی عەسـکەری و ئـارام و سەعدی گچکە و د. خالیـد و دەرچـوونی بزوتنـەوە لەنیمـچە بـەرەی یـەکێتی و راگەیانـدنی (حزبـی سۆسیالیـستی یـەکگرتووی کوردسـتان– حـسیك)، ئەگـەر گۆڕەپانی خەبات لەناوچەکانی سلێمانی گۆڕەپانی کۆمەڵە (یەکێتی) بـوو بێـت، ئەوا لەناوچـەکانی دەشـتی هـەولێر و کۆیـە و خۆشـناوەتی، گۆڕەپانەکـە لـەژێر دەسەڵاتی (حسیك)دا بووە. ئەوکاتە (١٩٧٩)، بەهۆی گرژتر بوونی بارودۆخەکە رووبەڕووبوونەوەی چەکداری لەنێوان (ینك و حسیك)، بەهۆی شەڕی نـاوخۆوە، لەم دەڤەرەی باڵا دەستی حسیك، وردە وردە پێشمەرگەی کۆمەڵە دادەنیـشتن یان دەڕۆیشتن و تەسلیم بەرژێم دەبوونەوە. تا کۆتایی مانگی تشرینی یەکـەمی ١٩٧٩، (٣٧) پێشمەرگە و کادیری کۆمەڵـە ئـەم رێکخـستنەیان بـەجێ هێشت، هەندێکیان چوونەوە ناو سۆسیالیـست و هەنـدێکی تریـشیان دانیـشتن[١٠١]. ئـەو رۆژگارە هێشتا کۆمەڵە بـوون لـەو ناوچـانەدا بـۆ پێـشمەرگە تـاك و تەرایـەکانی ناوچەکانی هەولێر تا رادەیەك بڤە بوو، چونکە هێزەکانی حسك[١٠٢] بـاڵا دەسـت بوون و کۆمەڵەیان بەنەیاری خۆیـان دەزانـی. ئـەو رۆژە لـەو ناوچـانەی هـەولێر بێجگـە لـەو کەرتـەی دەشـتی هـەولێر، مەفرەزەیـەکی بـچووکی خۆشـناوەتی و کەرتێکی دۆڵی خانەقا کەسی دیکە نەبوو[١٠٣]. ئەم کاتە، کەسی یەکەم و هـەرە دیاری کۆمەڵە و ینك لەو دەڤەرەدا، شـاخەوان عـەباس بـووە، ئـەویش هـەردەم لەژێر هەڕەشـە و چـاو لێـسوورکردنەوەی سۆسیالیـستدا بـووە[١٠٤]. بـۆ نموونـە ژمارە و قەبارەی هێز و لایەنەکانی سەر گۆڕەپانی خەبات بەتایبەتی لەدەشتی هەولێر و بەستی شرغە، بەم شێوەیە بووە:

– حسك: ٣٥٠–٤٠٠ پێشمەرگەی هەبووە.

– ینك: تیپی (٨٤)ی دەشتی هەولێری لێبووە کە (شاخەوان عەباس) سەرتیپی بـووە، هــەر (٥٠) پێــشمەرگەیەکی لەگەڵــدا بــووە، کەسۆسیالیــست هــیچ حـسێبێکیان بـۆ نـەکردووە، وەك لەنامەکـەی نەوشـێروان مـستەفا بـۆ (سـەید کەریم)، دەردەکەوێ.

– شـیوعی: بـەتالیۆنی پێنجـی دەشـتی هـەولێر کەکانـەبی گـەورە فەرمانـدەی بـەتالیۆنی بـوو. ژمـارەی هێزەکانیـان (٨٠) پێـشمەرگە و چـەند کـادیرێکی رێکخستن بووە.

- پاسۆك: دوو كادیر و چوار پێشمەرگەیان هەبووە، كادیرەكان: د. عەلی و شێركۆ بوون.
- پدك: تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٦، هیچ هێز و مەفاریزی لەدەشتی هەولێر نەبوو.
- سەرجەم پێشمەرگەكانی هەموو حزبەكان دەگەیشتە (٦٥٠) پێشمەرگەیەك[١٠٥].

جگە لەباڵادەستی حسك لەم دەڤەرە، ژمارەی پێشمەرگەكانیان لە (دەشتی هەولێر، دەشتی كۆیە، ناوچەی خۆشناوەتی) لەساڵانی (٨٢-٨٣)، خۆی لە (١١٠٠-١٢٠٠) پێشمەرگە دەدا.

(شەهید بوونی ئارام لە ١٩٧٨/١/٣١دا بۆشاییەكی گەورەی لەناو كۆمەڵە و هێزی پێشمەرگەدا دروست كرد و كەس نەیتوانی جێگەكەی پڕ بكاتەوە... ئەوانەی لەدوای ئەو هاتن، نەلەرووی تیۆری و نەلەرووی پراكتیكەوە، نەیان دەتوانی شان لەشانی ئەو بدەن... دروست بوونی ئەم بۆشاییە بەقازانجی ڕێبازی دووەم- بزوتنەوە- تەواو بوو)[١٠٦]. پاش نەمانی ئارام، ململانێ و دەركەوتنی باڵەكانی ناو كۆمەڵە زیاتر دەركەوتن و وردە وردە، بەئاشكرا دژایەتی یەكتریان دەكرد، تا كار گەیشتە لێكترازان.

لەگەرمەی شەڕی خوێناوی ناوخۆ، دوای ڕودانی شەڕی ئاشقولكە و پشت ئاشان لەیەكی ئایاری ١٩٨٣دا، هێزی پێشمەرگەی حزبی سۆسیالیستی كوردستان، تووشی پەرتەوازەیی و بێ هێزی بوون، گورزێكی وای بەركەوت كەزۆر لەگورزەكەی هەكاری گەورەتر و كاریگەرتر بوو... پاش ئەمە، ئیتر نەیتوانی بەهێزبوون و باڵا دەستی لەهیچ دەڤەرێك بەخۆیەوە ببینێ. كێشە ناوخۆییەكانیشی فراوان و، ئاشكراتر دەركەوتن، تا كار گەیشتە ئەوەی بەفەرماندەی هەرێمەوە پەیوەندی بە (یەكێتی)یەوە بكەن، یان كوشندەترین لێكترازانی لێ بكەوێتەوە[١٠٧]. ئیتر لەمە بەدواوە، ئەستێرەی درەوشاوەی حسك وردە وردە لەئاسمانی خەباتی كوردایەتیدا، بەرەو كز بوون و بچوك بوونەوە ڕۆیشت و نەیتوانی جارێكی تر، هەمان پرشنگی گەشاوەی خۆی بەسەر تەواوی كوردستاندا بدرەوشێنێتەوە.

## ٦- کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی

دوای ئـەوەی کەشۆڕشـی ئـەیلول لـەبار یەکـدی هەڵدەوەشـێتەوە، دکتـۆر مـەحمود عوسمـان لـەئێران دەمێنێتـەوە و دەچـێتە تـاران و کـاری پزیـشکی دەکات. دوای ئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردسـتان، لەدیمەشـق دادەمـەزرێت، مام جەلال پەیوەنـدی بـەدکتۆر مـەحمود دەکـات. نـاوبراو لەتارانـەوە دەچێتە دیمەشـق و (کۆمیتـــەی ئامـــادەکردنی پـــارتی دیمـــوکراتی کوردســـتان)، دادەمەزرێنێت و نامیلکەیەکی (١٦٠) لاپەڕەییش بـەناوی: (تقیم مـسیرة الثـورة الکردیة وانهیارها والدروس والعبر المستخلصه منها)، دەنووسێت و لەسـەرەتای کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا، یەکێتی بۆی چاپ و بڵاو دەکاتەوە. ناوبراو لەم نامیلکەیەدا هۆکارەکـانی دروسـتبوونەوەی شـەڕ لەسـاڵانی ١٩٧٤ و تێکـچوونی شـۆڕش و بڵاوبوونـەوەی گەنـدەڵی و بـوغرا بـوونی هەنـدێك لەفەرمانـدەکانی پێشمەرگە دەست نیشان دەکات و، لێپرسراویەتی سەرەکیش دەخاتە ئەستۆی سەرکردایەتی شۆڕش و خودی (مەلا مستەفا بارزانی)یەوە.

کۆمیتـەی ئامـادەکردن، لـەرووی چـەندایەتی (ژمـارە)وە، زۆر کـەم بـوون، گەشـەیان نـەدەکرد. کەسـایەتیە دیارەکانیـان بریتـی بـوون لـە: (د. مـەحمود عوسمـان، شەمسەدین مـوفتی، قـادر جـەباری، عـەدنان مـوفتی، مـلازم فوئـاد چـەلەبی، مـلازم جـەمال ئەحمـەد خۆشـناو، مـلازم کامیـل، جەعفـەر حوسـێن گردەسـۆری، مـستەفا خۆخـێ). دوای ئـەوەی کەئەمانـە لەگـەڵ مـام جـەلال، لەپایزی ١٩٧٧دا، دێنـەوە کوردسـتان و دوای رودانـی شـەڕی هـەکاری، لـەنزیك بارەگـای مـام جـەلال لـە (نـاوزەنگ)، بارەگـا دەکەنـەوە. ئەوکاتـە (هـەموو پێشمەرگەکانیان لە ٢٠-٣٠ کەس تێپەڕی نەدەکرد. لەهەموو پارێزگـای هـەولێر کاك جەعفەر حوسێن خەڵکی گردەسۆر لەگەڵ ئەودا بوو)[١٠٨].

هـەر زوو، (شەمـسەدین مـوفتی)، لەسـاڵی ١٩٧٩، دەچـێتە دەرەوەی وڵات. لەوێش، لەرێگای سەفارەتی عێراقەوە، خۆی تەسلیم کردۆتەوە. (ملازم جـەمال ئەحمـەد خۆشـناو)یـش، لەتـشرینی یەکـەمی ١٩٧٧، لەرووبەڕووبوونەوەیەکـدا لەگـەڵ هێزەکـانی رژێـم، شـەهید بـووە. ئـەم رێکخـراوە، بنکـەی جـەماوەرییان نەبوو، گەشەیان نەکردووە. بۆ ماوەیەك بەم قەوارە بچووکەوە مانـەوە. لەگـەڵ

(یـەکێتی)یـش، نەگەیـشتنە هـیچ ڕێککـەوتنێك، بۆیـە خۆیـان لـە (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی کوردسـتان)، نزیـك کـردەوە و[109] نـاکۆکی ریزەکـانی نـاو (یەکێتی)یان بەهـەل زانـی و لەگـەڵ بـاڵی رەسـول مامەنـد، بـەبێ ئـەوەی هـیچ بیانوویەکیان هەبێت، چوونە گوندی (گۆڕەشێر)[110].

لەدیـدگای (یـەکێتی)یـەوە د. مـەحمود، هانـدەر و هۆکارێـك بـوو بـۆ جیاکردنەوەی بزوتنەوە لەیەکێتی. پێیـان وابـوو نـاوبراو لـەپێناوی جـەماوەر و پێشمەرگە بۆ خۆ پەیداکردن و بـەهێزکردنی پێگـەی لەشۆڕشـی نوێـدا، ڕۆڵێکـی خراپی گێڕا... ئەگەر بزوتنەوە لەگەڵ کۆمەڵە و خودی (مام جەلال)دا، کێشەی هـەبووە، ئـەوا دکتـۆر مـەحمود، هـیچ کێشەیەکی دیـاری لەگـەڵ (یـەکێتی)دا، نەبووە. جیابوونەوە و ڕۆیشتنی ئەو، جگە لەبەرژەوەندی شەخسی خۆی، هیچ شتێکی تر، نەبووە.

لەراستیدا د. مەحمود لەگـەڵ یـەکگرتنی لەگـەڵ بزوتنـەوە، کەسـایەتیەکەی زیاتر دەرکەوت و توانی پێگەی خۆی لـەناو ڕێکخـستن و ریـزی پێـشمەرگەکانی سۆسیالیـست، بـەهێزتر بکـات و، ببێتـە ئاراسـتەیەك لـەناو سۆسیالیـست. ئـەم راستیەش، زێتر لەکاتی گرێدانی یەکەم کۆنگرەی حـزب (مایـسی ١٩٨١) و دوای راپـەڕینیش بەدیارکـەوت و ململانـێ و کێـشەکانی نـاو سۆسیالیـستی، قـوڵتر کردەوە.

## ٧- مفاوەزات و چوونی عەلی عەسکەری بۆ بەغدا

هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ و چوونەوەی مـەفرەزەکانی پێـشمەرگە بـۆ شـاخ، سـاڵێك و چـەند مـانگێکی تێپەڕانـد بـوو، چـەندین چـالاکی سیاسـی و عەسکەری لەدژی هێزەکانی حکومەت، ئەنجامدابوو... مام جـەلال، تـازە چـوار مـانگ بـوو، لـەدەرەوە گـەڕابۆوە و کۆبوونـەوەی لەگـەڵ سـەرکردە سیاسـی و عەسـکەرییەکانی هـەردوو باڵەکـە، ئەنجامـدابوو. لێپرسـراویەتی سیاسـی و عەسکەری دابـەش کرابـوو. هێـزی پێـشمەرگە، لـەفۆرمێکی تـازە و بـەگوێرەی جوگرافیـای ناوچـەکان، سـنووری چـالاکیەکانی، دیـاری کرابـوو. لـەم کاتـەدا حکومـەتی عێـراق، لـەرێگای (شـێخ محەمـەد رەشـید)ی سـەرۆك عەشـیرەتی

برادۆست لەلۆلان، پەیامێکی بۆ (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، ناردبوو. پەیامەکەی حکومەت، شتی تازە و روون و دیاری تێدا نەبوو، ئەوەی هەبوو، داوای رووکەش و گشتی و زۆر کەم بایەخ بوو، هیچ ناونیشانێکی نەبوو، نەدەزانرا ئاراستەی کێ و چ لایەنێك کراوە، لەکۆتایشدا ئیمزای هیچ کەس و لایەنێکی بەسەرەوە نەبوو. لەگرنگترین ئەو خاڵانەی کەلەپەیامەکەدا هاتبوو (حکومەت و شۆڕشی حەفدەی تەموزی پێشکەوتنخواز و سەرکردایەتیەکەی، وەك هەر لەسەرەتاوە بەڵێنی داوە، بەردەوام دەبێت لەگەشەپێدان و بوژانەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان و دامەزراوە حکومیەکان، بەهیچ شێوە و لەژێر گوشاری هیچ هێز و لایەنێك، لێی پەشیمان نابێتەوە... جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرك و پەیامە قورسەش لەکاتێکی وادا، هەڵبەت بێ کەم و کوڕی و هەڵە نابێت، بەڵام سەرچاوە و هۆکاری زۆربەی هەڵەکان ئێوەن، بۆیە بڕیاری لێبوردنی گشتیمان داوە و داواکارین بگەڕێنەوە ریزی نیشتمانی و هاوکارمان بن لەجێ بەجێ کردنی پەیامەکەمان).

پاش گەیشتنی پەیامەکەی حکومەت، سەرکردایەتی یەکێتی (بەهەردوو باڵە سەرەکییەکە، کۆمەڵە و بزوتنەوە)، کۆبوونەوەیەکی فراوانی ئەنجامدا، کەزۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی و کادیر و پێشمەرگە و فەرماندەی هەرێم و کەرتەکان، تێیدا بەشداربوون... دیراسەی داوا و پەیامەکەی حکومەتیان کرد، بەکۆی دەنگ بڕیاری ئەوەیان دا کەوەفدێك بنێرنە بەغدا و لەگەڵ حکومەت دانوستاندن ئەنجام بدەن. بزوتنەوە، هەر لەسەرەتای دروست بوونیەوە، باوەڕی بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد لەرێگای مفاوەزات و گفتوگۆوە هەبووە، لەهەموو راگەیاندن و بەیاننامەکانیدا، جەختی لەسەر ئەوە کردبۆوە... ناردنە دەرەوەی هێز و مەفرەزەی چەکداریش بۆ شاخ، زێتر بۆ فشار خستنە سەر حکومەت بوو، تاوەکو لەم رێگایەوە، ناچار بکرێت مل بنێ بۆ داوا رەواکانی کورد و جێ بەجێ کردنی تەواوی بەندەکانی بەیانی یازدەی ئازاری ١٩٧٠... بزوتنەوە، کردنەوەی ئەم دەلیڤەیەی پێخۆش بوو، بێ شەرم کردن و سڵەمینەوەش، لەزۆربەی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتیدا، بەبەردەوامی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە. ((کۆمەڵە))ش،

هاتنە ژێر باری رازیبوون[١١١].

بۆ ئەم مەبەستە، وەفدێکی یەکێتی ئامادەکرا کەبریتی بوون لەدوو ئەندامی سەرەکی (عەلی عەسکەری لەبزوتنەوە و عومەر عەبدوڵڵا لەکۆمەڵە)... یەکێتی، پەیامێکی هاوشێوەی حکومەت (بێ ناوونیشان و بێ ئیمزا)، بەوەفدەکە، بۆ بەغدا ناردبوو. هەندێ داوای گشتی و رووکەشی تێدا بوو، لەوانە:

- جێ بەجێ کردنی بەندەکانی یازدەی ئازار.
- راگرتنی هەڵمەتی تێکدانی گوندەکان و راگواستنیان بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکان.
- دەست هەڵگرتن لەشێواندنی جوگرافیای شار و شارۆچکە کوردنشینەکانی سنووری کوردستان.
- ئازادکردنی زیندانیە سیاسییەکان.
- گێڕانەوەی ئەو خانەوادە کوردانەی کەبەهۆی بەشداری کردنیان لەشۆڕشی ١٩٧٤، ئاوارەی بەغدا و شارەکانی باشوری عێراق کراون.
- سەرکردایەتی کورد، ئامادەیە بەرگری لەهەموو بستێکی خاکی عێراق بکات، بەکەنداوی عەرەبیشەوە.
- گەلی کورد باوەڕی تەواوی بەرەوایەتی کێشەی فەلەستین هەیە، بۆ ئەم مەبەستەش شان بەشانی عێراق و وڵاتە عەرەبیەکان و هێزە فەلەستینییەکان لەدژی ئیسرائیل و ئەمەریکی دەجەنگێ...

ئەمانە و چەندین پەیام و داواکاری و لێپرسراویەتی تر، لەپەیامەکەی یەکێتیدا، خرابوونە روو... رۆژی ١٩٧٧/١١/٣، لەکەرکوکەوە سێ هەلیکۆپتەری پڕ لەئازوقە و خواردن، دەگاتە ناوچەی برادۆست... لەگەڕانەوەشیاندا، وەفدەکە (عەلی عەسکەری و عومەر عەبدوڵڵا)، لەگەڵ خۆیان دەبەنە کەرکوك، لەوێوەش بۆ بەغدا. سەرەتا، چاویان بەسەعدون شاکر سەرۆکی دەزگای موخابەرات و عەدنان خەیروڵڵا، وەزیری بەرگری عێراق و چەند لێپرسراوێکی تری حزب و حکومی دەکەوێت... لەدواجاردا، (سەدام حوسێن)، جێگری سەرۆك کۆمار، دەبینن... ناوبراو، ناچێتە ژێر باری جێ بەجێ کردنی داواکانی وەفدەکە و بەراشکاوی پێیان دەڵێت: (ئێمە بەهیچ شێوەیەك، ئەگەر تەواوی

سوپای عێراقیشمان لەسەر دانابێت، دەست لەراگواستنی گوندە سنورییەکان هەڵناگرین، چونکە ئەوە پەیوەندی بەئاسایشی وڵات و نەتەوەییەوە هەیە، ئێمە حەز دەکەین بەتەنگ داواکاری و لێبوردنەکەمانەوە بێن و بگەڕێنەوە ریزی نیشتمانی و بەشداری بکەن لەئاوەدانکردنەوەی کوردستان و گەشەپێدانی دەزگاکانی حوکمی زاتیدا).

دوای سێ رۆژ مانەوەیان لەبەغدا، وەفدەکە لەرۆژی ١٩٧٧/١١/٦، بەنائومێدی و هەگبەیەکی بەتاڵ گەڕانەوە کوردستان و کۆتایی بەمفاوەزات هات. ناردنی ئەم وەفدە بۆ بەغدا، بیانووی دایە دەست هێزە عێراقییە ئۆپۆزسیۆنەکان، کەهێرشی توند بکەنە سەر یەکێتی، چونکە پێشتر، پەیمانی روخاندنی رژێمیان لەگەڵدا مۆر کردبوو.. سوریا و لیبیاش لەیەکێتی دڵگران بوون و بەیاننامەیان لەدژی دەرکرد و سەرکۆنەیان کرد. قیادە موەقەتەش، لەناوەوە و لەدەرەوە، لەرێگای دەرکردنی بەیاننامەوە، ئەم کارەیان شەرمەزار کرد[١١٢].

## ٨- شەڕی هەکاری

دوای ئەوەی کەمام جەلال لەپایزی ١٩٧٨، دەگەڕێتەوە کوردستان، لەهەندێك شوێن و لایەن، بەڵێنی چەك پێدانی پێدرابوو. بۆ هێنانی ئەم چەکانە لەسوریاوە بۆ کوردستان، مام جەلال لەگەڵ پارتی و گروپە کوردییەکانی باکوری کوردستان، لەوانە: کۆمەڵەی فەرهەنگی دیموکراتی شۆرشگێڕ (DDKD)، رێك کەوتبوو، کەئەوان چەکەکان لەسنوری سوریا بۆ ناو خاکی تورکیا بگوازنەوە و لەسنوری نێوان تورکیا و عێراق، تەسلیم بەهێزەکەی یەکێتی بکەن.

سەرکردایەتی یەکێتی، بڕیاری ئەوە دەدات، کەهێزێکی گەورە ئامادە بکات... هێزەکە باشترین و دیارترین سەرکردەی عەسکەری و مەیدانی سەرپەرشتی دەکرد. بەچەند رەتڵ و وەجبەیەك بۆ ناوچەی بادینان، بەرێدەکەون. ئەوکاتە ناوچەی بادینان (سنورەکانی عێراق و تورکیا) و ئەو گوندانەی باکوری کوردستان کەکەوتبوونە سەر سنوورەوە، لەژێر کۆنترۆڵی

سەرکردایەتی کاتی پارتی (قیادە موەقەتە)، دابوو، کە (سامی عەبدولڕەحمان)، سەرپەرشتی دەکردن و، کەسی یەکەمی ئەم سەرکردایەتیە بوو لەدەڤەرەکەدا.

بەپێی ئەو گێڕانەوانەی کەبڵاوکراونەتەوە و ئەوانەی کەتا ئێستاش لەدەمی بەشداربوانەوە دەبیسترێن، گێڕانەوەی جیاجیان. دیارترین سەرکردەکانی یەکێتی کەسەرپەرشتی هێزەکانیان کردووە، بریتی بوون لە: (عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، حوسێن بابەشێخ، سەید کاکە، ملازم تاهیری عەلی والی، ئازاد هەورامی، ملازم سەید کەریم، ئەحمەد فەقێ رەش، جەمال عەلی باپیر، محەمەدی حاجی مەحمود،...تاد). لەرووی ژمارەی ئەم هێزەش، گێڕانەوەی جیاجیا لەبەردەستدان. محەمەدی حاجی مەحمود، کەیەکێك بووە لەسەرکردەکانی ئەم هێزە و رۆژانەش رووداوەکانی تۆمارکردووە، دەنووسێت: هێزەکە، خۆی لە ٨٠٠ کەس دەدا کەنیوەیان بێ چەك بوون[١١٣]، بەو نیازەی کەگەیشتنە شوێنی مەبەست، بەچەکەوە بگەڕێنەوە. ئەوکات ئیمکانیەتی شۆڕش، سنوردار بوو، کەیەکێك دەبووە پێشمەرگە، زۆرجاران دەبوایە لەگیرفانی خۆی، چەك بۆ خۆی بکڕێت.. سەرچاوەیەکی تر پێی وایە: (سەرجەم هێزەکە ٧٢٦ کەس بووینە، کەچوار سەدیان بێ چەك بووینە)[١١٤].

هەندێکی تر بە (١٢٠٠) پێشمەرگەی چەکدار و بێ چەکی دەخەمڵێنێت. کەباشترین سەرکردە و کادیری سیاسی و عەسکەری یەکێتی رێبەرایەتیان دەکرد[١١٥]. بەهەموو شێوەیەك، ژمارەی هێزەکە خۆی لە (٩٠٠–١٠٠٠) پێشمەرگەی چەکدار و بێ چەك دەدا... یەکەمین رەتڵی ئەم هێزە، لەسەرەتای مانگی چواری ١٩٧٨، لەقەندیلەوە بەرەو سێکوچکەی سنورەکانی (عێراق، ئێران، تورکیا) بەڕێدەکەون. رەتڵەکانی تریش، یەك لەدوای یەك، بەدوای ئەوانەوە دەڕۆن... ئەو رەتڵەی کەمحەمەدی حاجی مەحمود سەرپەرشتی کردووە، لە ١٩٧٨/٤/١٧، لەگۆڕەشێرەوە بەرەو هەکاری بەڕێدەکەون. هەر لەسەرەتای رۆیشتنەکەیاندا، لەلایەن هێزەکانی عێراق و ئێران، بەفڕۆکە و تۆپی دوور هاوێژ، بەچڕی بۆردومان دەکرێن. بۆ نموونە: لە ٤/٢٩، ئێران بۆردومانی کردن، عێراقیش بەفڕۆکە. لە ١١/٥یش، جارێکی تر لەسنوری برادۆست رژێم

هێرشی بۆ کردن. هەندێك لەپێشمەرگەکان، بریندار بوون. لەبەر سەرما و سۆڵە و برسێتی و دووری رێگا، پەرێشان دەبن. رۆژی ١٩٧٨/٥/١٦، د. خالید و عەلی عەسکەری و تاهیری عەلی والی لەشەمزینانەوە نامەیەك بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی دەنێرن. لەم نامەیەدا، باسی رووداوەکانی رێگای چوونیان بۆ هەکاری دەکەن و دەنووسن:

– رۆژی ١٩٧٨/٥/١٥، گەیشتینە د. خالید و ئەوان، لەرێگادا، عێراق و ئێران بەتەیارە و تۆپ لێیاندایین و چوار رۆژ بەردەوام بوو... تەمومژ و کەش و هەوا سەری لێ شێواندین. ماوەی ٢٤ رۆژ پێشمەرگە بەهۆی کەمی ئاو و خواردن و نوستن و ماندوبوون و شەڕ، شەش کەس شەهید بوون و حەوت کەسیش لەسەرمان مردن. زیاتر لە ٤٥ پێشمەرگەش بەهۆی بۆردومانی عێراق بریندار بوون. لەناوچەی نەینەوا سەلاح کاکەشین و زیاتر لە ٢٠ کەسی تر بەچەك و هاوەن، خۆیان تەسلیمی عێراق کردەوە و نزیکەی ٢٦ کەسیش خۆیان تەسلیمی ئێران کرد، لەوانە ئەنوەری مەجید سوڵتان و جومعەی عەلەکە و بەکری حاجی سەفەر. کاك تاهیری عەلی والی بریندار بووە، هەروەها کاك ئەنوەر و کارزان و شێخ کامیل بەسووکی بریندار بوون(١١٦).

ئەوانە، وردە وردە لەئامانجەکەیان نزیك دەبنەوە. هێزێکی زۆری قیادەی موەقەتە کەعەشیرەتە کوردەکانی باکور، پاڵپشتی دەکردن، چاوەڕوانی گەیشتنی هێزەکەی یەکێتی بوون. قیادەی موەقەتە، وای لەگوندنشینەکانی باکور گەیاندبوو کەئەوانە جەلالی و بەعسین و پیاوی سەدامن، هاتوون ژن و منداڵان دەبەن و ماڵان تاڵان دەکەن(١١٧)، پاش ئەوەی کەلەیەکتر نزیك دەبنەوە، هەوڵی ئەوە دەدەن شەڕ هەڵنەگیرسێ، بەڵام هەوڵەکان بێ ئاکام دەبن... لە ١٩٧٨/٦/٢وە، لەهەموو لایەکەوە شەڕ دەست پێدەکات و تا ٦/٥ بەردەوام دەبێت... لە ١٩٧٨/٦/١٩، تەواوی هێزەکە شکست دەخوات و گورزێکی کەمەر شکێنی بەردەکەوێت. سەرچاوەکانی یەکێتی دەڵێن: ئامانج لەناردنی ئەم هێزە (هێنانی چەك و تەقەمەنی و چەکدارکردنی بێ چەکەکان و هاوکاری و چەسپاندنی هەرێمی بادینان بەسەرکردایەتی حوسێن بابەشێخ)(١١٨) بووە. بەڵام لایەنی دووەم و بەرامبەر ئەم بۆچوونە رەت دەکەنەوە. بەلای

ئەوانـەوە، یـەکێتی هـەوڵی ئـەوەی داوە تـەواوی ناوچـەکانی کوردسـتان پـاوان بکات و نەهێڵێت جارێکی تر هێزەکانی قیادە موەقەتە پێ بنێتە کوردستانەوە. سـامی عەبـدولڕەحمان کەسەرپەرشـتی ئـەو هێـزەی کـردووە کـەدژی یـەکێتی جەنگاون، کەسی یەکەم و دەست ڕۆیشتووی قیـادە موەقەتـە بـووە، دەڵێـت: (ئەوان هاتنە هەکاری بۆ لـەناوبردنی سـەرکردایەتی کـاتی. نامـەکانی تاڵـەبانی کـەبۆ هەنـدێك کـەس لـەباکوری کوردسـتانی نووسـیبوو کەوتـە دەسـت پـارتی کەتێیدا هاتبوو سەرکردایەتی کاتی خـائین لـەپارێزگاکانی هـەولێر و سـلێمانی و کـەرکوك لـەنێوبران و هێزێـك دەنێرنـە بادینـان تـا لـەوێش لـەناو بـبرێن و داوای هاوکـاری دەکـات. مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتیش لـەیۆبیلی زێرینیـدا دەڵـێ: لەبەهاری ١٩٧٨ لەکاتێکدا هێزێکی پێشمەرگە بەرەو سنوری عێراقـی– تـورکی بـەرێگاوەبوون بـەنیازی ئـازادکردنی ئـەو ناوچـەیە لەکۆمـەڵێك عەشـایەری کۆنەپەرست بەهاندان و پاڵپێوەنانی لایەنێکی گومان لێکراو ئابلۆقە دران)[١١٩].

کەواتە بەپێی گێڕانەوەکانی هەردوو لایـەنی شـەڕکەر، ئامـانج لـەناردنی ئـەم هێزە هەم هێنانی چەك و یارمەتی بووە، هەمیش دانـانی بارەگـا و بـەهێزکردنی پێگەی یەکێتی بووە لەدەڤەری بادینان، جگـە لەکۆنـەقینی مێـژوویی( ١٩٦٤-١٩٧٠)ی نێوان ئەم دوو هێزە. زۆرجـاران، نووسـەر و سـەرکردەکانی یـەکێتیش ئەم پرسیارە لەخۆیان دەکەن، بۆ دەبێت بۆ هێنـانی چـەك، ئـەم هـەموو هێـزە بنێردرێت؟! بەقسەی ئەوان (ناردنی ئەم هێزە بەم شـێوەیە هەڵـە بـوو... ئـەو کارەساتە دەرهاویشتەی زەمینەیەك بوو کەبڕیارێکی سیاسـی هەڵـە و نابـەجێی سەرکردایەتی یەکێتی خوڵقاندی و ئەوسات و پاشتریش باجەکـەی گـران لەسـەر یەکێتی کەوت)[١٢٠].

دەبـێ ئـەوەش بگوترێـت کـەپێش بەڕێکـەوتن بـۆ هـەکاری، کـادیرانی پێـشکەوتووی بزوتنـەوە لـە ١٩٧٨/٣/٢٥ لـەنۆکان کۆبوونـەوە. باسـەکانی کۆبوونەوەکە بریتـی بـوون لـە: هەڵسەنگاندنی بـارودۆخی نـاوخۆی بزوتنـەوە، ڕێکخـستنی پەیوەنـدی نێـوان سـەرکردایەتی شـاخ و شـار، هەڵـسەنگاندنی پەیوەندی نێـوان بزوتنـەوە و کۆمەڵـە، تـاوتوێ کردنـی کێـشەکانی نـاو خـودی بزوتنـەوە بەتایبـەتی پەیوەنـدی نێـوانی عـەلی عەسـکەری و ڕەسـوڵ مامەنـد،

هەڵسەنگاندنی بڕیاری ناردنی پێشمەرگە بۆ بادینان، پڕکردنەوەی شوێنی بەتاڵی سەعدی گچکە و بایز عەباس ئاغا لەسەرکردایەتی بزوتنەوە. کۆبوونەوەکە لەبارەگای تاهیری عەلی والی لەنۆکان بەستراو سی (٣٠) کادیر بەشدار بوون تێیدا. سەید کاکە و حاجی حاجی برایم لەجێی سەعدی و بایز عەباس ئاغا دانران و قادر عەزیز و ئەحمەد فەتحوڵلا و ئەحمەد فەقێ رەش بەئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی دیاری کران. ناوی بەشێك لەبەشداربووانی کۆبوونەوەکە: عەلی عەسکەری، رەسوڵ مامەند، تاهیری عەلی والی، خالید سەعید، مەلا ناسیح ئیسماعیل ئەحمەد، سەید کاکە، حاجی حاجی برایم، قادر عەزیز، بەکر حەمە، جەمال کوردە، ئەنوەر سەعید والی، ئەحمەد فەقێ رەش، ئەحمەد فەتحوڵلا، عەلی سلێمان، مریەم خان، عەزیز بەگ، مەحمود پیرۆت، رەئوف مستەفا بەگ، رۆستەم مستەفا[١٢١].

سەرەنجام: ئەو هێزە پوخت و کاریگەرەی یەکێتی تەفر و تونا بوو... باشترین و دیارترین سەرکردەی سیاسی و عەسکەری لەدەستدا، کەنموونەی هەرە دیاریان: (عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید و حوسێن بابەشێخ)، بوون. لەهێزێکی گەورەی نزیك لەهەزار کەسی، ئەوەی شەهید بوو، ئەوەی بەدیل گیرا، ئەوەی بەزۆر لەژێر فشاری ناچاریدا تەسلیم بەرژێم بۆوە، تەنها و تەنها هەشت کەس: (تاهیری حاجی عەزیز، مەحمود زەردۆیی، رەفیق پارەزانی، حەمەڕەش گرێزەیی، جەمال عەلی باپیر، بەکرە سوور، ئاوات گەڕەدێی، محەمەدی حاجی مەحمود)، رزگاریان بوو و بەسەلامەتی گەڕانەوە سەرکردایەتی لەناوزەنگ.

بەشێوەیەکی گشتی، زیانەکە لەیەکێتی کەوت، بەڵام گورزە کەمەر شکێنەکە بەر بزوتنەوە کەوت، چونکە دوو سەرکردەی سیاسی و مەیدانی دیاری لەدەست چوو. (ئەگەر لەبەهاری ١٩٧٨– پێش کارەساتی هەکاری–، بزوتنەوە لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەوری سەرەکی دەگێڕا... ئەوە بێگومان لەپایزی ١٩٧٨– پاش کارەساتی هەکاری–، کۆمەڵە رۆڵی سەرەکی لەناو یەکێتی گێڕا)[١٢٢] و بووە باڵی یەکەم و دەست رۆیشتووی نێو ئەم نیمچە بەرەیە و توانی سۆز و لایەنگیری مام جەلال بەلای خۆیدا بکێشێ.

پاش ئەم ڕووداوە نەخوازراوە کەبووە مێژوویەکی ڕەشی شەڕی نێوخۆیی نێوان لایەنە سیاسییەکانی کوردستان، کۆمەڵێك بابەتی لەسەر نووسرا و بڵاوکرایەوە، کەدیارترینیان ئەم نامیلکەیە بوو کەنەوشیروان مستەفا، بەناوی (کارەساتی هەکاری) نووسیویەتی و لەساڵی ١٩٧٩دا، بڵاویکردۆتەوە. پاشان چەند جارێکی تر، چاپ و بڵاوکرایەوە. نەوشیروان، خودی خۆی، بەشداری شەڕەکە نەبووە، بەڵام (لەئەنجامی گوێگرتن لەگێڕانەوەی ئەو کەسانەی کەلەکارەساتەکە دەرباز بوو بوون)[١٢٣]، ئەم نامیلکەیەی نووسیوە. کەسە دەربازبووەکانیش زێتر ئەو هەشت کەسەن کەبەدیل نەگیران و توانیویانە زانیاریەکان بگەیەننە سەرکردایەتی لەناوزەنگ. یەکێك لەوانە: محەمەدی حاجی مەحمود، بووە، کەتەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ مام جەلال و نەوشیروان گێڕاوەتەوە. هەر لەوێ نەوشیروان داوای لێکردووە، ڕووداوەکانی بەشێوەی نووسین بداتێ. ئەویش، ژمارە و مێژووی شەڕ و ڕووداوەکانی نووسیوەتەوە و لەقەبارەی ١٠–١٥، لاپەڕەدا، تەسلیم بەناوبراوی کردووە[١٢٤].

## ١- كۆچی نەورۆز

شەوی نەورۆزی ساڵی ١٩٧٩، پاش ئەوەی بزوتنەوە لەوە دڵنیا دەبێت: کەچیتر ناتوانێت لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەگەڵ (کۆمەڵە)دا، هەڵ بکات، لەیەکێتی دەچێتە دەرەوە. بارەگاکانی لەگوندی (شێنێ)، کەهەر تەنها (٢٥-٣٠) خولەکێك لەبارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی دوور بوو، دەگوازێتەوە گوندی (گۆڕەشێر). پێشتریش، بەهۆی نزیکیان لە (لیژنەی تەحزیری پارتی- بەرێبەرایەتی دکتۆر مەحمود عوسمان)، لەسەر ئەوە رێککەوتبوون کەپێکەوە بڕۆن. بۆیە لە (کۆچی نەورۆز)ی بزوتنەوەدا، ئەوانیش هاوڕێ و هاوئاراستەیان بوون. ئەوانەی رۆیشتن، ئەو سەرکردانەی بزوتنەوە بوون کەرۆژێك لەرۆژان خەباتیان لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی کەبە (جەلالی)، ناسراو بوون، نەکردبوو. ئەوکاتەی کەباڵی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ حکومەتی عێراق لەسەنگەرێکدا بوون، ئەوان لەریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول، دژایەتیان دەکردن. بەدیوێکی تر: ئەوان (مەلایی) بوون و (جەلالی) نەبوون.

لەکۆنە جەلالییەکان، تەنها (عومەر مستەفا دەبابە)، لەناو یەکێتی، مایەوە... هەر بۆ نموونە: رەسول مامەند، تاهیری عەلی والی، سەید کاکە، سەعدی گچکە، حاجی حاجی برایم، محەمەد رەحیم (خاڵە حاجی)، قادر عەزیز، ئەحمەد فەقێ رەش و لەلیژنەی کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتیش: د. مەحمود عوسمان، عەدنان موفتی، قادر جەباری، هیچ کامێکیان پێشینەی جەلالیان نەبوو. (ئەمانە لەبەراییدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر پێشمەرگەیان لەگەڵ چووبوو، بەتایبەت پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر. ئێمە- کۆمەڵە- ژمارەیەکی کەم مابووینەوە لەکادیرەکان)[١٢٥]. هەروەها، مام جەلال رایدەگەیەنێت کە: (ئەو برادەرانە بەجیابوونەوەیان ١٥٠٠ پێشمەرگەیان برد، واتا نزیکی سێیەکی هێزی پێشمەرگەیان جیاکردەوە لەئێمە)[١٢٦]. جیابوونەوەی باڵی بزوتنەوە تا رادەیەك لەرووی چەندایەتییەوە پارسەنگی هێزی تێکدا بوو[١٢٧]. تەلاری رێکخراوەیی و چەکداری یەکێتی دوو کەرت کرد... پاش کارەساتی هەکاری، ئەمە کوشندەترین گورز بوو کەبینای یەکێتی شەق کرد و سەنگەرێکی دیکەی

خوێنـاوی لەسـەر جەسـتەی بزوتنەوەکـە هەڵکەنـد... پارسـەنگی تـەرازووی هێزەکانی لەسەر جوگرافیای شۆڕشی نـوێ، لـەنگ کـرد... لەشـارباژێڕ، دۆڵـێ، بەری کۆیـە، خۆشـناوەتی و هـەولێر، هێـزی بزوتنـەوە بـەهێز و بەرچـاو بـوون. لەهەنـدێك ناوچـەدا، کـۆنترۆڵی تـەواویان کـرد و کێـشەی جیـدیان بـۆ یـەکێتی دروست کرد(١٢٨).

دەربارەی ژمارە و قەبارەی ئەو هێزەی کەلەگەڵ باڵەکەی (رەسوڵ مامەند)، رۆیشتن، کۆمەڵێك شاهید حاڵی رووداوەکە، کەکاراکتەری زیدوو و دیاری کۆمەڵە بوون، گـەواهی ئـەوە دەدەن کەبزوتنـەوە راسـتەقینەکە رۆیـشتن و نـەمان. بـۆ نموونە، نەوشیڕوان مستەفا دەڵێت: زۆربەی هەرە زۆری پێـشمەرگە و لێپرسـراو و ئەندامـەکانی بزوتنـەوە لەگـەڵ رەسـوڵ رۆیـشتن، تـەنیا عومـەر دەبابـە مایـەوە(١٢٩). بـرایم جـەلالیش دەڵێـت: (دەتـوانم بەراشـکاوی بڵـێم کەکـەمترین ژمارەی پێشمەرگە و کادریان لەگەڵ کـاك عومـەر دەبابـە مانـەوە کەبەپەنجـەی دەست دەژمێردران)(١٣٠).

هەموو گەواهی و بەڵگـەکان، ئـەوە دەسـەلمێنن، کەبزوتنـەوە راسـتەقینەکە رۆیشتن و نەمان. بۆیەش گەواهی و قسەکانی سەرکردە و کـادیرانی کۆمەڵـەمان وەك دیکۆمێنتێك هێناوەتەوە، چونکە ئەوکات، ئەوان لەگەڵ بزوتنەوە کێشەیان هەبوو، دانوویان بەیەکەوە نەدەکولا... کەواتە: ئەگەر نـەیار و دژ بـەرێك ئـەوە بڵێت دەبێت خاوەن ماڵ چی بڵێت؟!

بەجیابوونەوەی بزوتنـەوە، کـەلێنێکی تـر کەوتـە جەسـتەی شۆڕشـی نـوێ. پێشبینی روودانی گرژی و شەڕی ناوخۆ، لەزەردەپەڕی ئاسۆ، رونـتر دەرکـەوت، چونکە عەقڵیەت و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردایەتی، ئەو واقیعەی پێ هەزم نـەدەکرا. هـەر شـەوێك دوای ئـەم رووداوە، لەیەکـەم کاردانـەوەدا، کۆمیتـەی سەرکردایەتی یەکێتی بەیانێکی توندی رەخنە ئامێز و پڕ لەتۆمەتی لەدژی ئـەم باڵە دەرکرد و بەخائین و دەستی رژێم و بـەزیو، نـاوزەدی کـردن. بەیانەکـەش، لەیەکەم پەخشی (ئیستگەی دەنگی یەکێتی)، زۆر بەحەماسەوە، چـەندین جـار بڵاوکرایەوە و خوێندرایەوە... ئەو کاتە: (سەنگەرەکان نەیانـدەتوانی بەئاشـتی پێکەوە هەڵبکەن. هاوسەنگەرە شۆرشگێڕەکانی رۆژی پێـشوو، لەگـەڵ زەنگـی

شوومی جیابوونەوەدا، بوون بە ناشۆڕشگێڕ، کافر، لادەر، شۆفار و گەجەر و گوجەری نێو بزوتنەوەی کوردایەتی!)[131].

## ٢- هۆکارەکانی دەرچوونی بزوتنەوە

پێکهاتەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، راستە لەسێ باڵ پێکهاتبوون: (بزوتنەوە، کۆمەڵە، خەتی گشتی)، بەڵام لەسەر زەمینەی واقیعی و کردەوەدا، هەردوو باڵەکەی (بزوتنەوە و کۆمەڵە)، هێزی سەرەکی و داینەمۆی یەکێتی و هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ بوون. ئەوانیش، هەر لەسەرەتای دروستبوونی یەکێتییەوە، لەگەڵ یەك تەبا نەبوون. هەردەم کێشەیان لەنێوانیاندا هەبوو. بزوتنەوە، لەبنچینەدا، جگە لەهەندێك کەسایەتی سەربەخۆ، ئەوانی تر پێشینەیەکی پارتی (مەلایی) و مەکتەبی سیاسی (جەلالی)یان، هەبوو. کۆمەڵە، نەك هەر دژی کۆنە پارتی و مەلاییەکانی ناو بزوتنەوە بوون، بەڵکو زۆر دژایەتی کۆنە جەلالییەکانی ناو بزوتنەوەشیان دەکرد.. بەشێکی زۆری کۆمەڵە، باڵی شەهید ئارام (شاسوار جەلال)، هەر زۆر دژی ئەوان بوون. (کاك ئارام رای جیاواز بوو، نەیدەویست کۆمەڵە بەو خەستیە لەگەڵ بزوتنەوەدا بێت و برا بەش و هاوبەش بن... جگە لەوەی حەزی بەهاتنەوەی مام جەلال و ئەوانەی کۆن جەلالی بوون نەدەکرد، دژی سەرانی بزوتنەوە بوو، بەتایبەتی کاك تاهیر و خالید و عەلی عەسکەری، هەتا لەناو کۆمەڵەش هەر کەس نزیکی ئەوان بوایە حەزی لەچارەی نەدەکرد)[132]. نەك هەر خودی ئارام، بەڵکو ئەوانەی لەگەڵ باڵەکەی ئەودا بوون و پاش نەمانی ئارام خۆیان بەدرێژەپێدەری رێبازەکەی ئەو دەزانی، لەبرا بەشی و حەز لەچارە نەکردنی بزوتنەوە گەڕێ، بەڵکو لەو کاتە ناسکەی سەرەتای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، کەپێویستی بەخەباتێکی ناوکۆیی و هەوڵی هاوبەش هەبوو، دژی ئەوە بوون بزوتنەوە بەشداری شۆڕشی نوێ بکات. مەلا بەختیار کەخۆی بەجێگرەوەی ئارام دەزانی، (لە ١٩٧٦/٧/١٢دا، پێیوابوو رێگە نەدرێ سەرانی بزوتنەوە وەك سەرکردایەتی شۆڕش و پێشمەرگە بەشداری لەشۆڕشی نوێدا بکەن)[133].

دوای ئەوەی کەمەسئولیاتی هەرێم و شوێنی جوگرافیان دیاری دەکرێت،

لـەپایزی ١٩٧٧دا، مـەلا بـەختیار وەك سـەرکردەیەکی کۆمەڵـە دێتـە دەشـتی هەولێر، بەنیازی گەشەپێدانی ڕێکخستن و چالاکییەکانی کۆمەڵە، لـەم دەڤـەرە. ئەوکات، سەعدی گچکە (بزوتنـەوە)، لێپرسـراوی هێزەکـان بـوو لـەم سـنوورە، کەچی مەلا بەختیار حسێبێکی ئەوتۆی بۆ ناکات... شـاخەوان عـەباس، یـەکێك بووە لەکادیر و پێشمەرگەکانی مـەفرەزە سـەرەتاییەکانی شـۆڕش و کۆمەڵـەش بووە. ناوبراو، لەبیرەوەرییەکانیـدا، باسـی کێشەی نێـوان ئـەم دوو لێپرسـراوە دەکات و دەنووسـێت: (کاتێـك کەمـەلا بـەختیار لـەپایزی ١٩٧٧ دێتـە دەشـتی هەولێر، کۆبوونـەوە بەخـەڵك دەکـات و دەڵێـت مـن نوێنـەری مـام جـەلالم. لـەو کاتەدا سەعدی گچکە لێی زویر دەبـێ و پێـی دەڵـێ: سـنوور سـنووری هـەرێمی هەشـتە و مـن مەسـئولی هـەرێمم، تـۆش مەسـئولی لقـی کـەرکوکی، وەك مـن سەرکردایەتی، بۆ تۆ نوێنەری مام جـەلالی، بـۆ مـن نوێنـەری مـام جـەلال نـیم؟ لەهەر دێیەك کۆبوونەوە بـەجوتیارەکان دەکـەی بـەناوی نوێنـەری مـام جـەلال تقدیم دەکرێی. پێنج سـەد ٥٠٠ دینـارت لـە ع.ق وەرگرتـووە، لـەجیاتی ئـەوەی لەگـەڵمان دابنیـشی و باسـی بکـەین، پـارەت بەسـەر پێـشمەرگەکانی کۆمەڵـە دابەش کردووە، ئەی ئەوانەی لەگـەڵ ئێمـەن، پێشمەرگە نـین؟ کێشەکە بـووە عاجزی...)[١٣٤].

(پشکۆ نەجمەدین)یش، یەکێك بووە لـەهاوڕێ و هاوڕێبـازە نزیکـەکانی مـەلا بەختیار، کەسێکی بەئاگا و خاوەن هەڵوێست بووە لەڕووداوەکاندا، ئەویش پێی وابووە بوونی بزوتنەوە و کۆمەڵە و خەتی گشتی لەیەك ڕێکخراوی وەك یەکێتیدا شتێکی ناواقیعی بـووە، هـەر لەسـەرەتای دروسـتبوون و پێکـەوە کارکردنیـان، کێشە و ململانێی زۆر لەنێوانیاندا هـەبووە. ئـەو دەنووسـێت: (مـن لەسـەرەتای دەستپێکدا، هەسـتم بـەجیاوازی بەرچـاوی نێـوان کـادر و پێـشمەرگەی کۆمەڵـە لەلایەك و خەتی گشتی و بزوتنـەوەی سۆسیالیـست لەلایـەکی دیکـەوە دەکـرد. ناکۆکی و ململانێکان دیاربوون. ڕەفتار و ئاکارەکان جیاواز بوون. تێگەیـشتن و بۆچوونەکان لەمەڕ شۆڕش و هیواکانی ئاینـدە، لێـك دوور بـوون)[١٣٥]. ئـەم دوو ڕێکخـراوە، لـەدوو کـاتی جیـاواز و زەمینـەی جیاجیـادا دروسـت بـوون، بۆچوونەکانیشیان دەربـارەی شـۆڕش و هەڵوێـست وەرگـرتن لـەرابردوو ئاینـدە

بیـنین جیـاواز بـوو. ئـەوان: (دوو بـاڵی سـەرەکی و خـاوەن بڕیـار بـوون، دوو ڕێکخراوی جیا بوون کەجگە لەبارودۆخی ئەوسـای پـاش ئاشبەتاڵ و دڕندەیی دەسەڵاتی ڕژێم و پەرۆشی بۆ شۆڕشی کورد، هیچ خاڵێکی تری نـاوکۆیی کـاری هاوبەشیان تێدا نەبوو...)[١٣٦].

خاڵێکی تری سەرەکی ناکۆکییەکان و تەبا نەبوون، هەڵوێست وەرگـرتن بـوو لەپارتی دیموکراتی کوردستان وماڵباتی بارزانی... بزوتنەوە، ئەوانی بەگرفت و کێشەی خۆی نەدەزانی. ئەوان، پێیان وابوو، بۆ ئەوە دروسـت بووینـە تـاوەکو چیتر ئەو کێشە و دووبەرەکییـە مێژوویيـە درێـژە نەکێـشێ. لەئایندەشـدا ببنـە هێزی سێیەم و ئەندام و هەواداری هەردوو لایـەن بـۆ لای خۆیـان کـێش بکـەن و لەبۆتـەی (بزوتنـەوە)دا، بیانتوێننـەوە. ئاینـدەبینی بزوتنـەوە وابـوو، کەچـی ئـەوان، (کۆمەڵـە) و (قیـادە موەقەتـە)، بەبۆچـوون و تێزێکـی تـر لەئاینـدەیان دەڕوانی... قیادە موەقەتە، یان (پارتی، یـەکێتی بەخەنیمـە دێرینەکـەی خـۆی دەزانی... پارتی، نەك هەر یەکێتی و بەشێکی سەرەکی لەفیکر و سیاسەتەکەی بۆ نەفیکردنەوەی جەستەی فیکری و سیاسی ئـەو جێگـۆڕکێی مـەلا مـستەفا و جەلال تاڵەبانیـە... یـەکێتی نیـشتمانی بـەو بۆچـوونە فیکـری و جیهـان بینینـە توندڕەوەی خۆیەوە، لەگەڵ لەدایك بوونیدا تـۆوی زەبـر و بـەتۆبزی سـەپاندنی پێشڕەوایەتی خۆی هەڵگرتبوو)[١٣٧].

بزوتنەوە، هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ پارتی و بارزانیـدا نـەبوو، بـەڵکو خۆیـان بەدرێژەپێـدەری پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان لـەفۆرمێکی تـازە و مۆدێرنـدا، دەزانی... ئامادەش نەبوون جارێکی تر بچنەوە ناو ئەو جۆرە ململانێیە، ئەوان دەیانویـست هەرچـی زووتـرە ئـەو دووبـەرەکی و ڕق و قینـەی کەکۆمـەڵی کوردەواری دابەشی سەر دوو جەمسەر کردووە، بڕەوێننەوە... ئامـادە نـەبوون ببنـە تـەرەف گـیری لایـەنێك و دژی لایـەنێکی تـر، سـەنگەر بگرنـەوە. کەچـی کۆمەڵـە (نەوشـێروان و گروپـی زینـدان لایـان وابـوو کـەناکۆکی لەگـەڵ پـارتی و بنەماڵەی بارزانی ناکۆکی سەرەکییە و هەر جۆرە سـازانێك لەگەڵیانـدا خیانەتـە لەمارکسیزم و مەسـەلەی شـۆڕش)[١٣٨]. هەوڵیانـدەدا، زەمینـەی دژایـەتیکردنی پـارتی سـاز بکـەن. (دەبـوو ئـەو مەسـەلەیە لای هـەموو پێـشمەرگەیەك و لای

خەڵكی كوردیش بكرێتە قەناعەتێكی گومان هەڵنەگر كە: بێ پاكتاوكردنی فیكر و جەستەی قیادە موەقەتە و بنەماڵەی بارزانی، هیچ دەرفەتێك بۆ رزگار كردنی كوردستان و سەركەوتنی شۆڕشی نوێ نییە)[١٣٩]. ئەو بۆچوونەش، لەرووی تیۆری و پراكتیكییەوە بەبزوتنەوە هەزم نەدەكرا... مەبدەئیەن دژی ئەم بۆچوونە بوون. هەربۆیە، ئەوە دەبێتە خاڵێكی تری ناكۆكی نێوان بزوتنەوە و كۆمەڵە. سەید كاكە، كەفەرماندەیەكی مەیدانی شۆڕشی ئەیلول و سەركردەیەكی دیاری بزوتنەوە بوو، سەردەمانێكیش ئەندامی سەركردایەتی یەكێتی بووە، لەبیرەوەرییەكانیدا دەنووسێت: (جیابوونەوەمان لەگەڵ یەكێتی هەر لەسەر پارتی بوو. نەك بۆ بەرگری كردن لەپارتی، بەڵكو ئێمە شەڕی براكوژیمان بەهیچ جۆرێك لا پەسەند نەبوو)[١٤٠].

جگە لەبوونی ناكۆكیەكی زۆر لەناو هەرسێ باڵەكەی كۆمەڵە، نەوشیروان مستەفا، كێشە و گرفتی لەگەڵ سالار عەزیز و جەماعەتی كۆمیتەی هەرێمەكان، باڵی شەهید ئارام هەبوو. (لەگەڵ بزوتنەوەش كێشەی هەبوو بەتایبەتی لەگەڵ شەهید دكتۆر خالید. لەیەكێك لەكۆبوونەوەكاندا، دكتۆر خالید بەكاك نەوشیروانی وتبوو: ئەگەر بمزانیبایە ئاشووبە دەنێیتەوە، نەمدەهێشت بێیتەوە بۆ كوردستان. لەكوێوە هاتووی دەتنێرمەوە بۆ ئەوێ... كاك نەوشیروانیش بەكاك خالیدی وتبوو: ئێمە نەبواین تۆ ئێستا هەر لەشەماعیە دەبوویت.. حەساسیەت لەنێوان ئەوانەی دەرەوە- ئەورووپا- و ناوەوە، هەبوو. ئەوانەی ناوەوە وایاندەزانی ئەوانەی دەرەوە جێگایان پێ لێژ دەكەن و مەسئولیات وەردەگرن. ئەوانەی دەرەوەش، خۆیان بەقیادەی شۆڕش دەزانی)[١٤١].

دانووستاندن لەگەڵ حكومەت، هۆكارێكی تری رووكەشی قوڵبوونەوەی ناكۆكیەكان بوو.. بەشێك لەسەركردەكانی كۆمەڵە، پێیان وابوو دەبێت رژێمی عێراق بڕوخێنرێت، ئەوان و مام جەلال كەوتبوونە ژێر كاریگەری ئۆپۆسیۆنی عێراقی، بەتایبەتیش حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست- ئەو باڵەی كەدژی بەعسی عێراق بوو، سوریا و لیبیا هاوكاری دەكردن-. هەرچی بزوتنەوە بوو، وەك لەنامەكانی سەیدا ساڵح یوسفی بۆ شاخ و بەیاننامەكانی بزوتنەوە دەردەكەوێت، ئەوان تا دوا هەل لەگەڵ چارەسەركردنی كێشەی كورد بوون

لـەعێراق بـەرێگای ئاشـتی و دانووسـتاندن و دیـالۆگ... دوا شانـسیان دابـووە شەڕی چەکداری... لەگەڵ ئەوەش باوەڕیان بەروخانـدنی ڕژێـم نـەبوو، چـونکە هەم ئەم کارەیان بەئـەرکی کـورد نـەدەزانی، هـەمیش لـەباری خۆیـان گوێزیـان دەژمارد، ئەو هێز و توانایەیان نەبوو ڕژێم بـڕوخێنن، چـونکە ئـەوکات، زۆربـەی وڵاتانی جیهان، بەهەردوو بلۆکەوە، دۆست و پاڵپشتی عێـراق بـوون. (دروشمـی سەرەکی یەکێتی: روخاندنی رژێمی فاشی عێـراق بـوو. ئـەوان ئـەم دروشمـەیان پەسەند نەدەکرد– مەبەست لەبزوتنەوەیە–. لایان وابوو جێ بەجێ کردنی ئەم دروشمە لەتوانای کورد بـەدەرە، بـەڵکو هەنـدێکیان لایـان وابـوو حزبـی بـەعس لەهاوپـەیمانی ستراتیجی کوردە و جوڵانەوەی کورد ئـەبێ دەسـت لـەو دروشمـە هەڵبگرێ و، لەرێگای گفتوگۆ لەگەڵ بـەعس هـەوڵی چـاك کردنـی داو و دەزگـای ئۆتۆنـۆمی بـدات... لـەناو سـەرکردەکانی بزوتنـەوە لەشـاخ، رەسـوڵ مامەنـد کەوتبووە ژێر تەئسیری ئەم بیروڕایانـەوە و دیفـاعی لێ ئـەکرد. هەنـدێ لـەبیر و بۆچوونەکانیان جۆرێ لەراستیشی تێدا بوو)[١٤٢].

بەهۆی ئەم ناکۆکیانەوە، پـێش ئـەوەی سـەرکردایەتی یـەکێتی هێـز ئامـادە بکـات بـۆ هێنـانی چـەك و ناردنیـان بـۆ هـەکاری، رەسـوڵ مامەنـد لەمەکتـەبی سیاسی یـەکێتی، دەسـتی لـەکار کێشایەوە و بەشـداری هـیچ کۆبوونەوەیـەکی نەدەکرد. زێتر خەریکی کاری سیاسی و رێکخستنی بزوتنەوە بوو... ئەوەندەی لەخـەمی بزوتنــەوە بــوو، چــارەکێك لەخــەمی (یــەکێتی)دا، نــەبوو. کێـشە و گرفتەکان، تەشـەنەیان کردبـوو، رۆژی ١٩٧٨/٥/٢٣، عـەلی هـەژار دەچێتە لای کـەریمی حیـسامی لەبەغـدا و داوای لێـدەکات لـەرێگای رێکخـستنەکانیانەوە– رێکخـستنی حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران– نامەیـەکیان لــەرێگای سەنگەسەرەوە بۆ شاخ ببات... هـەر لەوێـدا باسـی ئـەوەی کـردووە کەهەنـدێك نـاکۆکی کەوتۆتـە نێـوان بزوتنـەوە و یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتانەوە[١٤٣]. کەهێزەکـەش بـەرەو هـەکاری بەڕێکـەوت و ئەنجامەکـەی بـەخراپ شـکایەوە، گورزێکی کەمەرشکێن بەر بزوتنەوە کەوت، چونکە (ئەو هێزەی چووە هـەکاری سێ چارەکی هێزی بزوتنەوە بوون)[١٤٤]. ئەو هێزە زۆرە تـەنها هەشـت کەسـیان بەسەلامەتی گەڕانەوە سەرکردایەتی، ئـەوانی تـر شـەهید بـوون، بـەدیل گـیران،

تەسلیمی عێراق بوونەوە. دوو سەرکردەی دیاری شەهید کران (عەلی عەسکەری و د. خالید)، کەدوو دۆستی دێرینی مام جەلال بوون. سەنگ و قورسایی تایبەتیان هەبوو لەناو یەکێتیدا بەتایبەتی یەکەمیان، (رۆڵی تایبەتی و دەسەڵاتی دووەم کەسی یەکێتی بوو)[١٤٥].

بەشەهید بوونی سەرکردەکان و لەناوچوونی هێزە سەرەکیەکەی بزوتنەوە، (بەهۆی دروست بوونی بۆشایی لەقیادەدا، نەوشیروان بوو بەئەندامی مەکتەبی سیاسی، کەپێشتر مەسئولیەتی وای نەبوو)[١٤٦]. سەرکردە شەهیدەکانی بزوتنەوە، هاورێی مام جەلال بوون، کەئەوان نەمان، (مام جەلال هەم بەلای کۆمەڵەدا دایدەشکاند و هەمیش لەهەوڵی گەشەپێدان و بەهێزکردنی خەتی گشتی دا بوو.. مام جەلال لەسەرەتای هەفتاکاندا، دەست پێشکەر و دامەزرێنەری کۆمەڵە بوو)[١٤٧]. لەناو سەرکردایەتی بزوتنەوەشدا، بۆشایی دروست بوو... بۆیە (قادر عەزیز و ئەحمەد فەقێ رەش و محەمەد فەتحوڵڵا لەئەندامی یەدەگەوە دەبنە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە)[١٤٨]. لەسەرکردایەتی بزوتنەوەدا، هیچ کەسێك نامێنێت رکابەری رەسوڵ مامەند بکات، بۆیە دەبێتە کەسی یەکەم و دەست رۆیشتووی بزوتنەوە. جێ بەجێ کردنی بۆچوونەکانی ئاسانتر دەبێت. لەبەر ئەوەی رەسوڵ مامەند لەسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی نەبوو، بەڵکو بەئاشکرا دژایەتی هەڵوێستەکانی یەکێتی دەکرد، بەتایبەتیش دەربارەی هەڵوێست وەرگرتن لەشەڕی قیادە موەقەتە و گفتوگۆکردن لەگەڵ حکومەت، بۆیە (مام جەلال زۆر بیانووی دەگرت. دەیگوت نوێنەری بزوتنەوە دەگۆڕین، تەنها رەسوڵ مامەند نەبێت، هەر کەسێك دادەنێن باشە. جارێکی تر دەیگوت: ئێوە لەبزوتنەوە دروشمی نەمانی رژێمتان هەڵنەگرتووە... دەیویست شەڕی قیادە موەقەتە بکەین... هەروەها کاك رەسوڵ زۆر هاتوچۆی چادرەکەی د. مەحمودی دەکرد، مام جەلال پێی ناخۆش بوو)[١٤٩]. جگە لەمانەش، کەسەرکردە و پێشمەرگەکانی بزوتنەوە بەدیل دەکەونە دەستی قیادە موەقەتە، رەسوڵ مامەند هەوڵی ئازادکردنیان دەدات، بۆ ئەم مەبەستە، (نامەی بۆ سامی عەبدولڕەحمان ناردبوو، سامی گوێی پێنەدابوو... مام جەلال لەوە دەترسا

بزوتنەوە نێوانی لەگەڵ قیادە موەقەتـە خۆش بکـات، لـەکاك رەسـوڵ سـارد بوو)[150].

هەرچەندە بزوتنـەوە لەسـەرەتای هاتنـە دەرەوە و تـا کارەسـاتی هـەکاری، لەپارێزگای هەولێر و ناوچەکانی رانیە و پشدەر و خۆشناوەتی، هێزی سـەرەکی بوون، دەیان شەڕی گەورە و سەرکەوتوویان لەدژی رژێـم ئـەنجام دابـوو، بـەڵام دوای هـەکاری، ئـەو هێزەیـان نـەما و لـەناو سـەرکردایەتی یـەکێتی، حـسێبی جارانیان، بۆ نـەدەکرا. کۆمەڵـە، زاڵـتر بـوو، بەئاشـکرا دژایـەتی سـەرکردەکانی بزوتنەوەیان دەکرد، (کاك تاهیری عـەلی والی و کـاك رەسـوڵ مامەنـدیان بـەباڵی راست و عەشایەری بزوتنەوە دادەنا... کاك رەسـوڵیش هـەتا بڵێـی دژی مـام جـەلال و کۆمەڵـە بـوو...)[151]. کەچـی پێـچەوانەی ئەمـە لەناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٧٧، کەمام جەلال ببووە سکرتێر، یەکێك لەوانەی پێی خۆش بوو مام جەلال بکرێتە سکرتێری هەردوو بـاڵی بزوتنـەوە و کۆمەڵـە، تـاهیری عـەلی والی بـوو... نـاوبراو چـەندین جـار لای محەمـەدی حـاجی مـەحمود باسـی ئـەوەی کـردووە کەراستە کاك ئارام و عەلی عەسکەری بەتوانان بەڵام وەك مام جـەلال نـین. مـام جەلال پیاوێکی بەتوانای ناوچەیی و جیهانییە[152].

لەمەسەلەی دابەشـکردنی پۆسـت لـەدەزگای رێکخـستن و پێـشمەرگایەتیدا، سەرکردەکانی کۆمەڵە بەدابەشکردنی وەك یەك (نیوە بەنیوە)، لەگەڵ بزونـەوە رازی نەبوون، هەربۆیە: (لەدەورەی یەکەمی کادیران پاش کارەسـاتی هـەکاری، لەمانگی هەشتی ١٩٧٨، لەچواردە کـادیر تـەنیا یـەك کـادیری بزوتنـەوەی تێـدا نـەبوو. لەدروسـتکردنەوەی هەرێمـەکان لەهەشـت هـەرێم تـەنیا دوو هـەرێم لێپرسـراوەکەیان بزوتنـەوە بـوو. لەدابەشـکردنی چـەکدا، کەلـەکۆتایی مـانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ نزیکەی چـەند سـەد چـەکێك گەیـشت دیسان زۆری درا بەپێشمەرگەکانی کۆمەڵە)[153].

سـەرەڕای ئەمانـەش، سـەرکردایەتی نـاوخۆ (شـار)ی بزوتنـەوە، کەسـاڵح یوسفی و عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی سەرکردایەتیان دەکرد، لەگەڵ ئەوە بوون، بزوتنەوە خاوەن هەڵوێستی خۆی بێت و لەشـەڕی قیـادە موەقەتـە کـردن دوور کەوێتـەوە. بـۆ ئـەوان باشـترە لەیـەکێتی جیـا ببنـەوە و وەك رێکخراوێکـی

سەربەخۆ خەبات بکەن. (لیژنەی ئامادەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان)یش کە د. مەحمود عوسمان ڕێبەرایەتی دەکردن، بریتی بوون لەچەند کەسێك کەسەرکردە دیارەکانیان بەپەنجەی دەست دەژمێردران، ئەوانە لەناوەڕاستی ١٩٧٧ کەلەگەڵ مام جەلال هاتبوونەوە کوردستان، جەماوەرێکی ئەوتۆیان نەبوو، لەهەڵوێستیش دەربارەی قیادە موەقەتە و ڕژێم، لەگەڵ بزوتنەوە هاوڕا بوون. ئەوانیش هەردەم پشتگیری دانووستاندنیان دەکرد. حەزیان دەکرد، بزوتنەوە لەیەکێتی جیا بێتەوە و لەگەڵ ئەوان یەکبگرن.

لەم سەروبەندەشدا، دەنگۆی ئەوە بڵاوکرایەوە کە: (لەشارەوە نامەیەکی عەلی هەژار گەیشتبووە دەستیان- بزوتنەوە-، کەتێیدا هانی دەدان لەیەکێتی جیاببنەوە و وەك ڕێکخراوێکی سەربەخۆ کاربکەن)[١٥٤]. هەموو ئەو هۆکارانە یەکیان گرت و بوونە هۆی ئەوەی کەبزوتنەوە شەوی ٢٠-١٩٧٩/٣/٢١، لەیەکێتی نیشتمانی کوردستان جیابێتەوە. لە (زەڵێ)وە چوونە گوندی (گۆڕەشێر)، زۆربەی هەرە زۆری پێشمەرگە و سەرکردەکانی بزوتنەوە بەگەڵ ڕەسوڵ مامەند کەوتن، تەنها عومەر دەبابە وەك ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە لەناو یەکێتیدا مایەوە. لیژنەی ئامادەکردنی پارتیش، لەگەڵ بزوتنەوە ڕۆیشتن. دوای ئەم ڕوداوە و کۆچکردنە، لەناو ئەدەبیاتی شۆڕش و بیرەوەریەکاندا، بە (کۆچی نەورۆز)، ناوزەد کرا.

### ٣- بزوتنەوە داتاشراوەکە

ئەم گروپەی بزوتنەوە کەلەناو یەکێتیدا مانەوە و بەگەڵ ڕەسوڵ مامەند و (بزوتنەوە) ڕەسەنەکە نەکەوتن، لەڕووی ژمارەوە، زۆر کەم بوون. جگە لەعومەر دەبابە، کەسایەتیەکی وایان لەگەڵدا نەبوو کەببێتە واجیهە و لەناو خەڵکدا بەبزوتنەوە بناسرێنەوە... بۆ ئەوەیش کەکۆمەڵە لەناو یەکێتیدا زاڵ نەبێت، مام جەلال، هەر زوو دەست و بردی کرد، چەندین نامەی بۆ هاوڕێکانی ناردە شارەکان و، داوای لێکردن کەبێنە شاخ و، بەڵێنی ئەوەشی پێدان کەبیانکاتە ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراویەتیان پێ ببەخشێت.. ئەو بزوتنەوە بیژۆکەی، کەدوای جیابوونەوەی ڕەسوڵ مامەند، لەلایەن مام

جەلالەوە دروست کرا، لەدیدی دۆست و نەیار، کۆمەڵە و ئەندام و هەوادارانی یەکێتیەوە، بەبزوتنەوەیەکی (ساختە، دروست کراو، باڵە گۆجەکە...تاد)، ناوبانگی دەرکردبوو. لەشاخ و لەشار، پێشمەرگە و ڕێکخستنێکی وایان نەبوو، کەبتوانن کێبڕکێ لەگەڵ کۆمەڵەدا بکەن و، خۆیان پێیانەوە بابدەن... (کۆمەڵە، لەدیدی مام جەلالەوە نەدەبوو وەك تەنیا سواری نێو یەکێتی بمێنێتەوە، بۆیە بەپەلە کەوتە هەوڵی راکێشانی ئەو کادر و ئەندامانەی بزوتنەوە کەپێشینەی جەلالییەتیان لەنێو شاردا هەبوو)[١٥٥]. کۆمەڵێك خەڵك بەدەنگ داواکەی مام جەلال هاتن و روویان کردە شاخ. لەوانە: جەمال حەکیم ئاغا، حاکم عومەر عەزیز، عەزیز بەگ. مامۆستا نازم عومەر دەباغ و عەلی حەوێزیش[١٥٦] بەگەڵ رەسول مامەند نەکەوتبوون. دوای ماوەیەکیش، (سوارەی عەباس ئاغای ئاکۆ)ش لەئێرانەوە پەیوەندی بەمام جەلالەوە کرد... وردە وردە خەڵکیان کۆکردەوە. سەرکردایەتیەکیان لە (عەلی حەوێز، جەمال حەکیم ئاغا، حاکم عومەر عەزیز، مامۆستا نازم عومەر، سوارەی عەباس ئاغا، مامۆستا شەریف، یوسف کەرکوکی، مامۆستا هەندرێن)، پێکهێنا. پاش تێپەربوونی دە مانگ بەسەر لێکترازانەکە، لە ١٩٧٩/١٢/١دا، بەیانێکیان بەناوی کۆمیتەی سەرکردایەتی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان بڵاوکردەوە و هێرشێکی توندیان کردبووە سەر باڵی رەسوڵ مامەند و کۆمیتەکەی دکتۆر مەحمود عوسمان[١٥٧]. دوای خۆڕێکخستنەوەیان، نوێنەریان لەیەکێتی دا، دەست بەکار بوو.

ئەو (بزوتنەوە)یە، لەدیدی کۆمەڵەوەش، ڕێکخراوێکی دروستکراو بوو، سەنگ و رەنگیان لەناو یەکێتیدا، نەبوو. هەر بۆ منافەسەی بزوتنەوە رەسەنەکە، دروست کرابوو.. هەر لەناو کۆمەڵەدا، دژی عەلی حەوێز کەوەك پەندە کوردییەکە گۆتەنی (لەپڕێکەوە ببووە کوڕێك)، وا بڵاو دەکرایەوە کە (عەلی حەوێز هاتبووە دەرەوە، خوا خوای بوو بیکەن بەکارمەند لەئیزاعە، خۆی دەیوت: دەنگم بۆ سەر ئیزاعە خۆشە لەدژی بزوتنەوە و رەسوڵ مامەند، رۆژی دوایی بوو بەئەندامی سەرکردایەتی ئەو بزوتنەوەی کەدروست ببوو)[١٥٨].

ئەو بزوتنەوە داتاشراوە، ژمارەیان ئەوەندە کەم بووە، هەرکەسێك سڵاوی

لێکردبن کراوەتە لێپرسراو و ئەندامی سەرکردایەتی، هەر بۆ ئەوەی لێنەگەڕێن (کۆمەڵە) تاك و تەنیا لەناو یەکێتیدا سواری مەیدان بێت... زۆر لەوانەی کەکراونەتە سەرکردایەتی بزوتنەوە، خەڵك نەیناسیون و پێشینەی سیاسیشیان نەبووە. خەڵك هەبووە لەترسی عەسکەری فێراری کردووە و پەنای بۆ ناوچە ئازادکراوەکان بردووە تاوەکو لەوێ خۆی پەنا بدات کەچی باز لەسەر سەری نیشتۆتەوە و کراوەتە ئەندامی سەرکردایەتی[١٥٩].

مام جەلال، بۆ بەهێز بوونی پێگەی خۆی، نەیدەهێشت کۆمەڵە بالا دەست بێت و کۆنترۆڵی تەواو بکاتە سەر یەکێتی. بۆیە لەهەموو بۆنە و رووداوەکاندا، رۆڵی ئەو بزوتنەوە دروستکراوەی ئیبراز دەکرد و هاوشانی ئەندامانی کۆمەڵە حسێبی بۆ دەکردن، (دەیویست قەناعەت بەخۆی و بەخەڵکی دیش بهێنێت کەبزوتنەوەی لەیەکێتی دەرچوو، باڵی لادەر و ناڕەسەنە و داتاشراوەکەش باڵی رەسەنی بزوتنەوەیە. ئەم باڵە دروست کراوە لەنێو کادر و ئەندامانی کۆمەڵەدا بەباڵە گۆجەکە ناوی دەرکرد)[١٦٠] بوو.

هەموو سەرکردە و کەسایەتیە دەست رۆیشتوو و دیارەکانی ناو یەکێتی، نموونەی نەوشیروان، رێباز، حاجی مەمۆ، پشکۆ نەجمەدین، برایم جەلال، فەرەیدون عەبدولقادر...، لەنووسین و یاداشتەکانیاندا، دان بەم راستیەدا دەنێن کەبزوتنەوەی رەسەن، لەگەڵ رەسول مامەند رۆیشتن. فەرەیدون عەبدولقادر[١٦١]، لەبەشی سێیەمی بەرنامەی (پەنجەمۆر)ی تەلەفزیۆنی (رووداو)دا، کەلەرۆژی هەینی ٢٢/١/٢٠١٦دا، بڵاوکرایەوە، لەوەڵامی (کاوە ئەمین)ی ئامادەکار و پێشکەشکاریدا گوتی: (... وەڵڵاهی ئەگەر بەهەقیقەت باسی ئەوانە بکەین- بزوتنەوە داتاشراوەکە-، ئەوە زۆری لەسەر گوتراوە و نووسراوە. کەئێمە هاتینە دەرەوە- ساڵی ١٩٧٩-، گوتیان: ئەوە عەلی حەوێز و نازانم کێ و کێ. بەڵام بەهەقیقەت بزوتنەوەی هەقیقی جیا ببوونەوە. بەرەحمەت بێت کاك رەسول مامەند و شەهید تاهیری عەلی والی بەگ، ئەمانە جیا ببوونەوە. فەرماندە چاکەکانی وەك سەید کاکە و ئەوانی تر، هەموو لەگەڵ ئەوان رۆیشتبوون. ئەوانەی تریش وەك عەلی عەسکەری، ئەوە لەکارەساتی هەکاری فەوتا بوون. ئەوەی کەمابوونەوە، سێ چوار کەسێك دەبوون، وەك:

عەلی حەویز و مامۆستا نازم و دواتر ناردیان بەدوای کاك جەمال ئاغا لەشارەوە هاتنە دەرەوە. ئەوانە، بەهەقیقەت نەیانتوانی ببنە دەم و چاوی زۆر گەش و کاریگەر و شوێنی بزوتنەوەی هەقیقی، بگرنەوە، کەیەکێتیان بەجێ هێشت. بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە مام جەلال بوو، ناوی نان بزوتنەوە)(١٦٢).

ئەو (بزوتنەوە)یە، دوو بڵاوکراوەشیان دەردەکرد، کەئەمانە بوون:

یەکەم: بزوتەوە: ئۆرگانی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان. یەکەم ژمارەی لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٠دا، دەرچووە. لەماوەی دوو خولدا، شەش ژمارەی لێدەرچووە. عەلی حەویز و چەتۆ حەویزی و فەرید زامدار، سەرپەرشتیان کردووە.

دووەم: سۆسیالیست: گۆڤارێك بوو لەساڵی ١٩٨٢دا دەرچووە. تەنها دوو ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە. تا ئێستا هیچ ژمارەیەکی لێ نەدۆزراوەتەوە(١٦٣).

لەدواجاردا، ڕێکخراوی خەتی گشتی (هێڵی پان) و بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، لەکۆبوونەوەیەکدا لە ١٩٨٢/٩/١١دا، یەکیان گرت و ڕێکخراوێکیان بەناوی (یەکێتی شۆرشگێڕانی کوردستان)، دروست کرد. بەم شێوەیە، ئاگردانی بزوتنەوە، لەناو یەکێتیدا، بەیەکجاری خامۆش بوو، شتێك نەما بەناوی (بزوتنەوە)وە.

## ٤- گیرانی کاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژار

عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی، دوو ئەندامی سەرکردایەتی چالاك و دیاری بزوتنەوە بوون، لەشۆڕشی ئەیلولدا، هەردووکیان لەناو ڕێکخستنەکان و ڕێکخراوە پیشەییەکاندا، دوو کەسایەتی بەرچاو و ناسراو بوون. یەکەمیان لەڕێکخراوی جوتیاران و ڕێکخستن و سەرکردایەتی پارتی و لێپرسراوی لقی هەولێر و... ئەوی تریان، لەمەیدانی ڕێکخستن و کاری ڕێکخراوەیی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا. دوای تێکچوونی شۆڕش، بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێکی تر، لەهەموو کۆبوونەوەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان و دوای گەڕانەوەش لەبەغدا و شارەکانی کوردستاندا، بوونیان هەبووە. بۆیە: لەناو خەڵکدا ناسراو بوون... جگە لەم پێشینەیەش، کەبزوتنەوە راگەیەنرا، ئەوانە بوونە ئەندامی

سەرکردایەتی و سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنەکانی ناوخۆیان پێ سپێردرا. ئەڵقەیەکی ئەکتیڤی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان شار و شاخ بوون. یەکەمیان: بەو سیفەتەی لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ بوو، بەردەوام لەنێوان بەغدا و شارەکانی کوردستاندا لەهاتووچۆدا بوو. ئەوەی دووەمیشیان، سەرەڕای مەسئولیاتی سەرکردایەتی بزوتنەوە لەناوخۆ و هاریکاری عەلی هەژار، دامەزرێنەر و بەرپرسی یەکەمی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)یش بوو. ئەم یەکێتییە، لەبەیاننامەکانیاندا، خۆیان بەدرێژەپێدەری (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ی سەر بە (پارتی دیموکراتی کوردستان)، دەزانی. (مامۆستا ئەمین قادر و سەلاح محەمەد ئیسماعیل و ئاسۆ حەسەن و ڕێبوار عەبدولڕەحمان و ئیحسان گلی، هاوکار و ئەندامی چالاکی ئەم ڕێکخراوە بوون، جاروباریش محەمەد کەیانی هاریکاری دەکردن)[١٦٤]. هەردووکیان لەدڵسۆزیان بۆ بزوتنەوە و ئیلتیزامەکەیان، زۆر ئاگاداری ئەنجامدانی چالاکیەکانی خۆیان نەبوون. حسێبێکی ئەوتۆیان بۆ ئەوە نەدەکرد، کەئەوان لەڕێکخراوێکی سیاسی و چەکداری یاساغ و دژ بەرژێم، لەناو جەرگەی شارەکاندا، خەبات دەکەن و بەبچووکترین هەڵە و درزەکردنی هەواڵ، گیانیان دەکەوێتە مەترسییەوە. کەئەوان لە ١٩٧٩/٤/٩دا، دەگیرێن، بزوتنەوە، تازە هەژدە ڕۆژێك بوو، لە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) جیاببۆوە. بەکۆکردنەوەی هەموو دەنگ و باس و بۆچوونەکان و لێوردبوونەوەیان، دەگەینە ئەنجامی هۆکاری ئاشکرا بوونی ئەوان و گیرانیان، کەگرنگترینیان لەم خاڵانەدا، خۆیان دەنوێنن:

١- سەعد عەبدوڵڵا، ئەندامێکی چالاك و ڕۆڵی لێپرسراویەتی لەناو تۆڕی ڕێکخستنەکانی هەولێردا هەبوو... بەقسەی ڕێکار ئەحمەد، (ڕۆژێ پێش گیرانی عەلی هەژار و کاردۆ، سەعد لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیر دەکرێ و بۆ ڕۆژی دواتر بەر دەبێت... ئەوانەی سەر بەسەعد بوون، زۆر دەشڵەژێن و زوو هەواڵەکە دەگەیەننە کاردۆ و عەلی هەژار)[١٦٥]، بەڵام ئەوان، هەرچەندە بەهەواڵەکەیان زانیوە، ئەوەندە ئیهمال بووینە، ئەم ئاگادار کردنەوە و مەترسییەیان، بەهەند هەڵنەگرتووە.

٢- هەردووکیان، لەبەرئەوەی پارێزەر و لێپرسراویش بوون، پەیوەندییەکی

فراوانیان لەگەڵ خەڵك و ڕێكخراوەكانی بزوتنەوە هەبوو... خەڵكی خەت مائیل و گومان لێكراویش، لەنێو ڕیزەكانی ڕێكخستنەكاندا، هەبوون.

٣- كاردۆ، ئەوەندە گرنگی بەچاودێری ڕژێم و هاوكارەكانی نەدەدا، هاوڕێكانی دەگێڕنەوە كە: لەساڵانی ١٩٧٦-١٩٧٧دا، كاتێك كەناوبراو لەبەغدا خوێندكاری زانكۆ بووە لەگەڵ عەزیز گەردی، لەژوورێكدا پێكەوە ژیاون... لەپاڵ خوێندنی زانكۆ، لەكۆڕی زانیاری كوردیش، كاری هەڵەچنی كردووە. هەمیشە ژێر قەرەوێڵەكەی خەوتنی پڕ بووە لەبڵاوكراوە و بەیاننامەی بزوتنەوە و حزبە كوردییە ئۆپۆزسیۆنەكان[١٦٦].

لەم كاتەی كەحزبی شیوعی عێراق لەگەڵ ڕژێم لەیەك بەرەدا بوون و ئەندامەكانیان لەدام و دەزگا كارتۆنیەكانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی كوردستان، لێپرسراو و كاربەدەست بوون، كاردۆ، پەیوەندییەكی فراوان و ئاشكرای لەگەڵ ئەندام و ڕێكخستنەكانی حزبی شیوعی دا، هەبوو[١٦٧].

٤- كەبزوتنەوە لەیەكێتی جیا دەبنەوە، یەكێتی لەشار و لەشاخ، دەكەوێتە دژایەتی كردنیان... هەر لەیەكەم ڕۆژی جیابوونەوەیاندا، كاتێك كەبۆ یەكەم جار، (ئیزگەی دەنگی یەكێتی نیشتمانی كوردستان)، دەكەوێتە كار، لە ١٩٧٩/٣/٢١دا بەوتارێكی مام جەلال دەستی بەپەخش كردن كرد. مام جەلال لەوتارەكەیدا سەرزەنشتی دەرچوونی بزووتنەوەی كردو[١٦٨] ڕەخنەی لێگرتن[١٦٩]، دەیان ناو و ناتۆرەی بۆ دروست كردبوون... بەدار و دەستەی ڕژێمی بەعسی لەقەڵەم دابوون... پاش وتارەكەی مام جەلال، هەر لەئیستگەكەیانەوە، چەند جارێك ناوی (كاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژار)ی دەهێنا و دەیگوت: ئەگەر ئەوانە پیاوی ڕژێم نین، چۆن سەركردەی بزوتنەوەن و لەشارن؟ حكومەت نایانگرێت و دەستیان لێنادات؟! چەندین جوێن و ناو و ناتۆرەی سووكی دەخستنە پاڵ، وەك: (جووجەڵە ڕەسوڵیەكان)، كەمەبەستی لە (جووجەڵە)، خاڵە حاجی و (ڕەسول)، ڕەسوڵ مامەند بوو... ناوهێنانی ئەم دوو سەركردەیەی بزوتنەوە، لەلایەن ڕادیۆی یەكێتیەوە، شتێكی شاراوە نەبوو، چەندین سەركردەی بزوتنەوە وەك سەید كاكە و دواتر (حسك)ی وەك: عەدنان موفتی و عادل موراد، لەدیمانەكانیان ئەم بۆچوونەیان پشت ڕاست كردۆتەوە.

بەداخەوە لەکاتی بارگرژی و ناکۆکی دروست بوون لەنێوان حزبەکانەوە، ئەم جوێن و تۆمەت بەخشینەوە، ئەوکات، دیاردەیەکی باو بوو، فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی حازر بەدەستیان، لەبەردەست دا بوو.. دەربارەی بوونی ئەو پەیوەندییەی نێوان بزوتنەوە و رژێم و پڕوپاگەندەکانی یەکێتی، دوای چەندین ساڵ تێپەڕبوون، یەکێك لەدامەزرێنەرەکانی یەکێتی، کەلەقۆناغە جیاجیاکاندا ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە، ئەوە رەت دەکاتەوە(١٧٠).

ئەم دوو سەرکردەیە، چەند رۆژێك پێش گیرانیان بەنیازی دەرچوون بوون بۆ شاخ. لەسەرکردایەتی شاخەوە داوایان لێکرابوو زوو پەیوەندی بکەن، بەلاّم بەوە راناگەن و دەگیرێن.. دوای گیرانی ئەوان، شیرازەی رێکخستنەکان، دەشلەژێت، بۆ ماوەی چەند مانگێك چالاکییەکانیان رادەگرن. سەعد عەبدوڵلا و ئەمین قادر و قادر شۆڕش، یەکسەر دەچنە شاخ. بەلاّم لەبەرئەوەی کاردۆ گەلالّی و عەلی هەژار ئیعترافیان لەسەر کەس نەکردبوو، کەس نەگیرا و رێکخستنەکان تووشی زیان نەهاتن و دووبارە دەستیان بەچالاکی نواندن، کردەوە.

سکرتێری حزب، (رەسوڵ مامەند)، لەساڵیادی دەستگیرکردنیان، لەوتارێکیدا لە ٩/٤/١٩٩٣دا دەنووسێت: (بەهەڵوێستی ئازایانە و خۆڕاگریانەیان، گیانی سەدان تێکۆشەری ناو رێکخستنەکانیان لەگرتن و ئەشکەنجە و سێدارە رزگارکرد و بەشەرەفیشەوە ئەمانەتی لێپرسراویەتی خۆیان بەباشترین شێوە ئەنجام دا)(١٧١).

## ٥- مفاوەزاتەکەی پایزی ١٩٧٩

لەمێژ بوو زەمینەسازی بۆ ئەنجامدانی ئەم مفاوەزاتە دەکرا. بزوتنەوە، هێشتا هەر لەناو یەکێتی بوو، کەلەهەوڵی ئەوەدا بوون. هەوڵەکانیشیان بەئاشکرا بوو، لەکۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتیدا، راشکاوانە دەیاندرکاند.. یەکەم هەوڵی سەرنەگرتوویان، هەوڵەکەی عەلی عەسکەری بوو. خودی د. مەحمود عوسمان، ئەو کاتەی کەرابەرایەتی رێکخراوی (کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی)، دەکرد، ئەو هەوڵەی داوە. ناوبراو، پاش ئەوەی لەگەڵ

مـام جـەلال، بـۆ یەکـەم جـار دێتــەوە کوردســتان و لـەناو زەنـگ دا، بارەگـا دادەمــەزرێنێ، لــە ١٩٧٨/١/٦دا، نامەیــەك بــۆ کــەریمی حیــسامی (ئەنــدامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستان– ئێران)، دەنێرێت، کەئـەوکات، ناوبراو، (حیسامی)، لەنێوان بەغدا و ئەوروپا لەهاتوچۆدا بـوو. لەنامەکەیدا: د. مەحمود دەنووسێت: (پێویـستە هـەوڵ بـدرێت کەرێککـەوتن لەگـەڵ حکومـەتی عێراق بکرێت. ئەگەر ئەوان هاتنە پێشەوە و ئامادە بوون بگەڕێنەوە بـۆ ڕۆحـی بەیانی یازدەی ئازار و وازیان لەو سیاسەتە هێنا کەبوو بەهۆی ئەوەی ڕۆڵەکانی کوردستان لەعێراقدا، جارێکی تر بێنەوە چیا و دەست بدەنەوە چـەك... وەکـو پارتیەکی دۆست– مەبەسـت لـەحزبی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێرانـە–، هـەوڵ بدەن زەخت بخەنە سەر حکومەتی عێراق بۆ ئەم مەبەستە)[١٧٢].

لەکۆتایی مانگی ئابی ١٩٧٨، قاسملو، دوای ئەوەی قسە لەگەڵ د. مەحمود دەکـات، بـۆ نێوەنـدگیری دەچێتە باڵوێزخانـەی عێـراق و دەڵێـت: بـۆ ئـەوەی پێـشنیارەکانی د. مـەحمود بگەیـەنم پێویـستە قـسە لەگـەڵ قیـادەی بـەعس بکەم... بەعسیش واسیتەیەکی ئاوای لەخودا دەویست[١٧٣].

ئەم هاتووچۆ و هەوڵی زەمینەسازی کردنە، بەردەوام بوو. لەبەغداش سەیدا ساڵح یوسفی، وەك کەسایەتیەکی سیاسی خاوەن پێشینەی وەفدی مفـاوەزات، لەرێگای ناردنی نامە و پێشنیاری لەم جۆرە بـۆ سـەرکردایەتی حزبـی بـەعس و کاربەدەستە حکومییـەکانی، بەبـەردەوامی، لەهـەوڵی زەمینـە سـازکردندا بـوو. (سەدام حوسێن)، تازە دوو مانگ و چەند رۆژێـك بـوو، ببـووە سـەرۆك کۆمـاری عێـراق و (ئەحمـەد حەســەن بـەکر)ی لەکودەتایـەکی نهێنــی و ســپیدا، لـەکار لادابوو. چەندین سەرکردەی دیاری حزبی بەعسی، لەسێدارە دابـوو، پێویـستی بەوە هەبوو هەست و سۆز و لایەنگیری بەشێك لەپێکهاتەکانی عێراق (بەتایبەتی کورد)، بۆ لای خۆی رابکێشێ. جگـە لەمـەش، بـۆ پتـەوکردنی پێگـەی خـۆی، پێویستی بەبەرقەرار کردنی ئاشتی و ئارامی هەبوو... لەگەڵ هاتنە سەر کـاری، لێبووردنێکی گشتی دەرکرد، کەبەم هۆیەوە، سـەدان کـورد لەزیندانەکانـدا ئـازاد کران، کەپێشتر بەتۆمەتی ئەندام لەپارتە ئۆپۆزسیۆنە کوردییەکان، گیرا بـوون. سەدام، بەخۆشیەوە، بەپیر داخوازییـەکانی (حزبـی سۆسیالیـستی یـەکگرتووی

کوردستان)ەوە چوو، ئامادەیی خۆی بۆ مفاوەزات، راگەیاند.

سەرەتا، هەوڵەکان، نهێنی بوون، بەڵام خەڵکی ناوچەکە، هەستیان بەم هەوڵە دەکرد، بەچاوی خۆیان هاتن و چوونەکانیان، دەبینی. بۆیە: مام جەلال لە ١٩٧٩/١٠/٢دا، نامەیەك بۆ (حزبی شیوعی عێراق)، کەئەوکاتە هاتبوونە شاخ، دەنووسێت و دەڵێت: (ئەمڕۆ لەرێکخراوێکمان لەگوندی سریجە، هەواڵمان بۆ هاتووە کە لە ١٩٧٩/٩/٣٠دا، حاجی حاجی برایم و فەرماندەی لیوای قەڵادزە کۆبوونەتەوە و پێکەوە نانیشیان خواردووە... لەرۆژی دواتر- ١٠/١- هەلیکۆپتەرێك هاتووە و د. مەحمود و رەسوڵ مامەند بەپیریەوە چوون... دەنگۆی ئەوە هەیە کەئەوانی بردبێتە بەغدا... لەم هەواڵانەی لەقەڵادزێ وە دەگەن، دەڵێن: هەفتەیەکی تر نابات جەماعەتی د. مەحمود و رەسوڵ مامەند، دێنەوە ناو حکومەت... باوەڕمان وایە: هیچ دوکەڵێك بەبێ ئاگر نابێت)[١٧٤].

ئەم هەواڵانەی کەبۆ سەرکردایەتی یەکێتی چوو بوو، تەواو راست و دروست بوون. لەرۆژی ١٩٧٩/١٠/١دا، وەفدی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، کەلە (د. مەحمود عوسمان- سەرۆکی وەفد-، عەدنان موفتی و ملازم کامیل، ئەندامانی وەفد)، پێکهاتبوون، لەرێگای هەلیکۆپتەرێکەوە، لەگوندی (سریج)ی سەر بەقەڵادزێوە بەرەو کەرکوك، لەوێشەوە بەرەو بەغدا، بەرێدەکەون.

وەفدەکە، لەم سەردانەیاندا، چاویان بە (سەعدون شاکر)، وەزیری ناوخۆ و (فازیل بەراك)، بەرێوەبەری گشتی ئاسایش، دوای ئەوانیش، (سەدام حوسێن)ی سەرۆك کۆمار، دەکەوێت... وەفدەکەی (حسیك)، پاش دانیشتن و گفتوگۆ کردن، داواکانیان، لەچەند خاڵێکدا چڕ دەکەنەوە و، دەیخەنە بەردەستی سەدام حوسێن و کاربەدەستانی عێراق. گرنگترین داواکانی وەفدەکە بریتی بوون لە:

١- جێ بەجێکردنی رێککەوتننامەی یازدەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠، لەرادیۆ و تەلەفزیۆنی ناوەندی عێراق، بخوێندرێتەوە.

٢- راگرتنی سیاسەتی تەهجیر و تەعریب و گەڕاندنەوەی ئەو گوندنشینانەی کەگوندەکانیان تێکدراون، بۆ شوێنی خۆیان.

٣- ئەو خەڵكانەی کەبۆ ناوەڕاست و باشوری عێراق، بەهۆی بەشداریکردنیان لەشۆڕشی ئەیلول، دوورخرابوونەوە، بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان.
٤- دابینکردنی کاری سیاسی ئازاد و، باوەڕ بوون بەفرە حزبی.
٥- ئازادکردنی گیراوە سیاسییەکان.
٦- هەڵوەشاندنەوە و هەڵگرتنی باری نائاسایی لەناوچە کوردنشینەکاندا.
٧- داوایان لەحکومەت کردبوو: وەفدێك بۆ لای (یەکێتی)ش بنێرن، تاوەکو ئەوانیش بەشداری ئەم مفاوەزاتە بکەن.

سەرکردایەتی شاخ، لەگەڵ سەرکردایەتی شار، بەردەوام لەپەیوەندیدا بووە و داواکارییەکانی وەفدی مفاوەزاتیان، بەسەرکردایەتی ناوخۆی حزب گەیاندووە. بۆ ئەم مەبەستە: (حاجی حاجی برایم، وەك نوێنەری شاخ هاتۆتە هەولێر و لەگەڵ کاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژار و عەلی رەسوڵ، لەماڵی عەلی هەژار کۆبوونەتەوە)(١٧٥).

بەڵام لەراستیدا: ئەم بۆچوونە زۆر دوورە لەراستیەوە و هیچ بنچینەیەکی نییە، چونکە ئەوکاتە، عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی لەزینداندا بووینە، لەوانەیە مەبەستی ئەم سەرچاوەیە، سەرکردەکانی تری شار وەك: (ساڵح یوسفی و محەمەد شاکەلی) و هەڤاڵەکانی تریانەوە بووبێت.

وەفدەکە، ماوەی سێ رۆژ لەبەغدا دەمێنێتەوە و بەوەرگرتنی هەندێك بەڵێنی رووکەش، بەنائومێدی، لە ١٩٧٩/١٠/٣دا، دەگەڕێتەوە شاخ. لەشاخ، لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق و سەرکردایەتی نەتەوایەتی و سەرکردایەتی هەرێمی حزبی بەعس، کۆدەبنەوە و ئەنجامی گفتوگۆکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراق، روون دەکەنەوە. لەمبارەیەوە (فەوزی راوی)، ئەندامی سەرکردایەتی نەتەوایەتی و هەرێمی حزبی بەعس، رۆژی ١٩٧٩/١٠/١٠، دەچێتە سەردانی حزبی شیوعی و ئاگاداریان دەکاتەوە کەدوێنێ- واتە: ١٩٧٩/١٠/٩-، چاوی بەدکتۆر محمود کەوتووە و بەدرێژی باسی سەفەرەکەی بۆ کردووە کەلەرێگای ئامیر لیوای قەلادزێوە چۆتە بەغدا و چاوی بەوەزیری ناوخۆ، سەعدون شاکر و مودیری ئەمنی گشتی فازیل بەراك و سەدام حوسێن کەوتووە. سەدام حوسێن، ماوەیەکی باش، قسەی لەگەڵ کردوون و گوتوویەتی: ناهێڵین

هیچ ناکۆکیەك لەخاکی عێراق بمێنێ... هەروەها دکتۆر مەحمود گوتبووی: ئێمە لەبێ پارەیی و دەست کورتی و کەم دەرامەتی و هێرشی توندی یەکێتی ناتوانین تا سەر بەردەوام بین. ورەی پێشمەرگە نزمە، ژمارەیەکیان تەسلیم بوونەتەوە.. ئەم هۆیانە پالی بەئێمەوە ناوە لەگەل عەدنان موفتی و ملازم کامیل بچینە بەغدا[١٧٦]. هەروەها، وەفدەکە ئەنجامی گفتوگۆکانیان بۆ حزبی شیوعی، روون کردۆتەوە. رۆژی ١٢/١٠/١٩٧٩، هاورێ یوسف (ئەبو حیکمەت)، چاوی بەهەڤالانی حسیك کەوتووە، ریپۆرتاژێکیان پێشکەش کردوون، کەهیچ جیاوازییەکی تێدا نەبووە لەگەل گێرانەوەکانی فەوزی راوی و جەلال تالەبانی، تەنها ئەوە نەبێت کە د. مەحمود گێرابوویەوە کەسەدام گوتبووی: جەلال تالەبانی داوای لێکردبووم نامەی بۆ بنووسم، بۆ ئەوەی شانازی و پروپاگەندەی پێوە بکات[١٧٧].

دوای گەرانەوەی وەفدەکە لەبەغدا، هەرچەندە بەبێئومێدی گەرابوونەوە، بەلام هێشتا تەواو تەمایان دانەنابوو، چاوەروانی وەلامێکی دلخۆشکەریان لەحکومەت دەکرد. بۆ ئەم مەبەستە، بۆ جاری دووەم، دکتۆر مەحمود لەرۆژی ١٥/١٠/١٩٧٩، لەنزیك قەلادزێوە چاوی بەدوو نوێنەری عێراق دەکەوێت و بەلێنی ئەوەی پێدەدەن کەبەم زوانە موافەقەت لەسەر داواکانیان، دەکەن[١٧٨].

لەلایەکی ترەوە، یەکێتی و حزبی شیوعی، ئەم مفاوەزاتە تاك لایەنەی (حسیك)یان پێ ناخۆش دەبێ، بەردەوام لەرێگای رادیۆ و بلاوکراوەکانیان، بەتایبەتی هی یەکێتی، تانەی لێدەدەن و لەناو خەلکی سووك و ریسوایان دەکەن. هەردوولا، لەرۆژی ١/١١/١٩٧٩، یاداشتێکی دوور و درێژ بۆ حسیك دەنووسن و داوای لێدەکەن واز لەبەغدا بهێنێت و گیروگرفتەکان، لەناوخۆ چارەسەر بکەن[١٧٩].

دوای درێژەکێشانی مفاوەزات و بەلێن دان و ئەم دەست و ئەو دەست پێکردن، حسیك تەواو بێ ئومێد دەبێت و، لەبەیاننامەیەکدا کەلەرۆژی ١٥/١/١٩٨٠دا، بلاویانکردۆتەوە کۆتایی بەمفاوەزات دەهێنن. لەو بەیاننامەیەدا، باسی ئەوەیان کردووە کەهەموو هەول و تەقەلاکانیان لەگەل رژێم بەفیرۆ رۆیشتووە و نەگەیشتوونەتە هیچ ئەنجامێك کەسوودی بۆ گەلی

کوردی تێدابێت[١٨٠]. حکومەت، هەر بۆ مەبەستی کات کوشتن و دروستکردنی دووبەرەکی، مفاوەزاتی لەگەڵ لایەنەکان دا کردووە، دەنا هیچ کاتێك ئامادە نەبووە بەرێگای ئاشتی و لەسەر مێزی گفتوگۆ، کێشەکانی کورد، چارەسەر بکات... ئامادە نەبووە، سەرجەم لایەنە کوردییەکان، پێکەوە بەشداری مفاوەزات بکات... هەربۆیە، پێش رۆژێك لەبڵاوکردنەوەی بەیاننامەکەی حسیك و کۆتایی هێنان بەمفاوەزات، حکومەت لەرۆژی ١٩٨٠/١/١٤، چەند کەسایەتیەکی ناردۆتە لای یەکێتی و داوای مفاوەزاتی لێکردوون. یەکێتیش بەئیجابی، وەلامیان داوەتەوە[١٨١].

## ٦- حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان (حسیك)

(کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی) و (بزوتنەوە)، پێکەوە (یەکێتی)یان جێهێشت، هەردوولا لەرووی بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیەوە، زۆر لەیەکدیەوە دوور نەبوون، بەتایبەتی لەم قۆناغەدا. ئەوەی زێتر لەیەکتری نزیك دەکردنەوە، گوشاری بەردەوامی یەکێتی بوو بۆ سەریان، لەگەڵ هاوهەڵوێستیان دەربارەی مان و نەمانی حکومەتی بەعس و دانووستاندن لەگەڵیدا. هەردوو لایان پێیان وابوو، دەکرێ لەرێگای گفتوگۆی بەردەوام و نەرمی نوادن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، لەگەڵ حکومەت، بگەنە ئەنجامێك... بۆ مەسەلەی هەڵگرتنی دروشمی (روخاندنی رژێم)، ئەوان لەگەڵ ئەوەدا نەبوون و بەئەرکی سەرەکی شۆڕشی کوردستانیان نەدەزانی. لەکۆتایی مانگی ئازاری (١٩٧٩)دا، بۆ رێکخستنی هێزەکانی پێشمەرگە و هەڵوێست لەسەر رووداوەکان و دروست کردنی سەنتەری بڕیار، زێتر لەیەکتر نزیك بوونەوە، بەنیازی یەکگرتن، کۆنفرانسێکی بەپەلەیان بەست، کەبەشێکی زۆر لەکادر و فەرماندەکانی پێشمەرگە، تیایدا ئامادەبوون. لەم کۆنفرانسەدا سەرکردایەتیەکی هاوبەشیان لە هەر یەکە لە: (رەسول مامەند، دکتۆر مەحمود عوسمان، ملازم تاهیری عەلی والی)؛ پێکهێنا. ئەوان، بەپراکتیك یەکیان نەگرتبوو، بەلام بەپەرۆشەوە، لەهەوڵی یەکگرتندا بوون... ئەم سەرکردایەتیە کاتییە، بەنیازی یەکگرتن لەرێکخراوێکی تازەدا، لەهەوڵی بەردەوامدا بوون. لەرۆژانی ٣-٦/٨/١٩٧٩،

لەماوەی سێ ڕۆژدا، کۆنفرانسێکیان لەگوندی (دۆڵەتوو) گرێدا، کەزیاتر لە (١٥٠-١٦٠) لەئەندامانی سەرکردایەتی، فەرماندەی هەرێمەکان، کادیر و ئەندامانی هەردوو ڕێکخراوەکە، بەشداریان تێدا کرد. لەم کۆنفرانسەدا باسی هۆکارەکانی دەرچوون لەیەکێتی و بارودۆخی کوردستان و عێراق، دانانی پڕۆژە و پلان بۆ داهاتوویان کرد و کۆمیتەی ناوەندیان هەڵبژارد، کەپێکهاتبوون لە: (ڕەسول مامەند، د. مەحمود عوسمان، تاهیری عەلی والی، قادر جەباری، مەلا ناسیح، عەدنان موفتی، سەید کاکە، قادر عەزیز، ئەحمەد فەقێ ڕەش، شەوکەتی حاجی مشیر[١٨٢]، ملازم ئەنوەر مەجید سوڵتان، شێروان شێروەندی، ملازم فوئاد عومەر چەلەبی)[١٨٣]. هەر لەم کۆنگرەیەدا یەکگرتنی هەردوو ڕێکخراوەکەیان بەتەواوی ڕاگەیاند و کردیانە (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، کەکورتکراوەکەی بووە (حسیك). دوای دوو ڕۆژ لە ١٩٧٩/٨/٨، بەیاننامەیەکیان دەرکرد و ئاماژەیان بەیەکگرتنی هەردوو ڕێکخراو و کارکردنی لەمەولایان لەژێر ناوی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، کردبوو.

ئەم یەکگرتنە بووە مایەی خۆشحاڵی ڕێکخستنەکان و جەماوەری هەردوولا. بەگەشبینییەوە، لەئایندەیان، دەڕوانی. خودی دامەزرێنەری بزوتنەوە، سەیدا ساڵح یوسفی، لەنامەیەکدا، پیرۆزبایی و دەست خۆشیان لێدەکات و دەنووسێت: (پشتگیری تەواوی ئەم یەکگرتنەی نێوان بزوتنەوە و لیژنە دەکەم، پیرۆزبایتان لێدەکەم. پێم باشتر بوو لەجیاتی حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان، تەنها حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بوایە. مادام یەکتان گرتووە، پێویستی بەوشەی یەکگرتوو نەدەکرد).

هەروەها دەربارەی ئایدۆلۆژی و پەیڕەو و پڕۆگرامی ئەم حزبە تازەیە، بۆچوونی خۆی دەخاتەڕوو و دەنووسێت: (... پەیڕەو و پڕۆگرامی پارتی دیموکراتی کوردستان، پڕۆگرامێکی باش و پێشکەوتنخوازانەیە، بەڵام گرفت لەپراکتیزە کردنیدا بووە... ئەوانەی سەرکردایەتیان دەکرد، نەیانتوانیوە بەدروستی پیادەی بکەن... هیوادارم خۆتان بەمیراتگری پەیڕەو و پڕۆگرامی پارتی بزانن و بەرەو پێشتری ببەن... زۆر لەم دەنگۆیانەی (سۆسیالیزمی زانستی) بێزارم، چونکە ئەو تیۆرە لەگەڵ کۆمەڵی کوردەواریدا ناگونجێ،

لەدواجاردا، ئەمەش دەبێتە حزبێکی دکتاتۆری)[١٨٤].

ئـەم یەکگرتنـە، لەبەرئـەوەی لەسـەر بنەمایـەکی دروسـت دانەمـەزرابوو، نـەیتوانی لەئاسـت چـاوەڕوانی و خواسـتەکانی خـودی دامەزرێنـەر و ئەنـدام و لایەنگرانی هەردوولا بێـت. هـەر زوو دیـاردەی دەسـتەو جەمـسەربەندی، لـەنێو ریزەکـانی پێـشمەرگە و رێکخـستنەکاندا، ئەگـەر بەئاشـکراش نـەبوو بێـت، هەسـتیان پێـدەکرا و، سـەریانهەڵدا... دوو کەسـایەتی و سـەرکردەی دیـاری هەردوو رێکخراوەکە، پـاش تێپـەڕبوونی چـەندین سـاڵ بەسـەر ئـەم رووداوەدا، بۆچوونەکانی خۆیان، دەخەنەڕوو. د. مەحمود عوسمان پێیوایە: (ئەو یەکگرتنە، هیچ بنەمایەکی هزری و ئایدۆلۆژی نەبوو، بەڵکو زیاتر بنەمایەکی تاکتیکی بوو)[١٨٥]. هەروەها، قادر عەزیز، کەدواتر لەئابی ١٩٨٥ لەسۆسیالیست جیـابۆوە و حزبـی زەحمەتکێـشانی لەبـەهاری ١٩٨٨دا، دامەزرانـد و بـووە سکرتێری ئەم حزبە، نـاوبراو دەڵێـت: (یـەکگرتنی بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی و لیژنەی ئامادەکاری پارتی، کەمتر بنەمای هزری هەبوو، بەڵکو زیـاتر کاردانـەوە و دروسـت کردنـی هێـزی سـێیەم لەگۆڕەپانەکـە لەبەرامبـەر فـشار و گێـچەڵی یەکێتیدا بوو)[١٨٦].

## ٧- بـەرەی جوقـد

لیبیـا و سـوریا، دوو وڵاتـی عـەرەبی بـوون کەبـەوڵاتانی (بـەرەی خـۆڕاگر و بەرەنگار بوونەوە) دژی ئیسرائیل، ناسراو بوون. ئەم دوو وڵاتە، زۆر دژی عێراق بـوون، زۆربـەی کەسـایەتی و رێکخـراو و حزبـە بەرهەڵـستکارەکانی عێـراق، بەتایبەتیش عەرەبییەکان، پەیوەندییان لەگەڵ ئەم دوو وڵاتەدا هەبوو، یارمەتی مـاددی و راگەیانـدنیان، لێـوەردەگرتن. جگـە لەمـەش، زۆربـەی بارەگـا و کەسایەتییە دیارەکانیان، لـەم دوو وڵاتـەدا، نیـشتەجێ ببـوون. (مـام جـەلال)، لەزووەکـەوە لـەوێ بـوو، یەکێتیـشی هـەر لـەوێ دامەزرانـد. بەشـێکی زۆری سەرکردەکانی حزبی شیوعی لەوێ بـوون. د. مـەحمود عوسمـان و هاوڕێکـانی، بەماڵ و منداڵەوە، لەتارانەوە، بۆ سوریا، گواستبوویانەوە.

بەرەی نیشتمانی و نەتەوایەتی دیمـوکراتی (جوقـد)، لـەپێناوی بـەهێزکردنی

پێگەی بەرهەڵستکارانی عێراقی، بەهاندان و پشتگیری سوریا و لیبیا لەرێکەوتی ١٩٨٠/١١/١٢، لەدیمەشــق دامــەزرا و، هــەر لــەوێش راگەیانــدرا و یەکــەمین بەیاننامــەی دامەزرانــدنی، لەراگەیاندنــەکانی ئــەم دوو وڵاتــەدا، بەچــڕی بــڵاو کردەوە. ئەم حزب و لایەنە عێراقی و کوردییانەی کەلەم بەرەیەدا بەشدار بوون و، ئیمزایان لەسەر کردبوو، بریتی بوون لە:

١- حزبی سۆسیالیستی عەرەبی عێراق: ئەمانە بەشێك بوون لەپاشماوەی ناسرییەکانی عێراق، لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو، لەلایەن (رەشید موحسین)، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی عێراق لەسەردەمی (عەبدولڕەحمان عارف) و چەند هەڤاڵێکی تریەوە، دامەزرابوو. دوای مردنی رەشید موحسین لەقاهیرە، (د. مبدر الیوس)، بوو بەسەرۆکی ئەم حزبە.

٢- پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست (باڵی سەرکردایەتی هەرێمی عێراق): نزیکەی سی (٣٠) کەسێك دەبوون، کەلەناوەڕاستی ١٩٧٩دا، گەیشتبوونەوە ناوزەنگ، بەسەرکردایەتی و کادیر و چەکدارەکانیانەوە، ژمارەیان بەپەنجەی دەست، دەژمێردران. هەڵسوکەوت و فیزی ئەوەیان لێدەدا و خۆیان وا دەردەخست کەئەمان نوێنەری باڵیۆزخانەی وڵاتێکی دەسەڵاتدارن لەناو شۆڕشی کوردستان و، ڤیتۆ لەسەر زۆربەی کارەکان، لەدەستی ئەوان دایە... ئەم تاقمە، بەهۆی کەڵەکە بوونی ناکۆکیەکانی عێراق و سوریا و دژایەتی یەکتری کردن، لەسەرەتای حەفتاکان، بەیارمەتی و پاڵپشتی کردنی رژێمی سوریا، دروست کران. ئەم تاقمە لەگەڵ چەند هێزێکی بچووك بچووك، رێکخراوێکیان بەناوی (گردبوونەوەی نیشتمانی عێراقی)، بنیات نابوو[١٨٧].

٣- یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

٤- حزبی شیوعی عێراق.

٥- حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان.

٦- رێکخراوی سوپای رزگاریخوازی گەلی عێراق.

٧- بزوتنەوەی سۆسیالیستی عەرەبی.

٨- بێلایەنە دیموکراتخوازەکان.

پێش دامەزراندنی ئەم بەرەیە، زۆر لایەن هەوڵیان دەدا، (جوقد) بەرەیەکی

گشتگیر بێت و هەموو لایەنەکان بگرێتەخۆ، بەتایبەتیش حزبی شیوعی عێراق هەوڵی دەدا رۆڵی ئیجابی بگێڕێ و، لایەنەکان رازی بکات کە (پارتی دیموکراتی کوردستان)یش، بێتە ناو ئەم بەرەیەوە. هەرچەندە، (پارتی) زۆری پێخۆش بوو، (بەڵام یەکێتی رازی نەدەبوو)[١٨٨].

نوێنەری حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان، د. مەحمود عوسمان بوو. ئەو بەنوێنەرایەتی حزب، ئیمزای لەسەر دامەزراندنی بەرەکە کردبوو... ناوبراوماڵی لەدیمەشق بوو، لەژێر فشاری وڵاتی خانەخوێ و یەکێتی و حزبی بەعس (سەرکردایەتی هەرێمی عێراق)، بێ پرس و راکردن و گەڕانەوە بۆ رای سەرکردایەتی حزب لە (شاخ)، بەتایبەتیش (رەسوڵ مامەند)، چووبووە ناو بەرەکەوە. رەسوڵ مامەند، سەرەڕای ناکۆکی لەمێژینەی لەگەڵ یەکێتی، ماڵ و خانەوادەکەی لە (ورمێ)، لەئێران دەژیان، زێتر لەژێر کاریگەری ئێران و (پارتی دیموکراتی کوردستان)دا، بوو. لەمێژیش نەبوو، لەیەکێتی دەرچووبوو، چەند شەڕێکی چەکداریش، لەنێوانیاندا قەوما بوو... وێڕای ئەمانەش، مەکتەبی سیاسی حزب گلەیی لە د. مەحمود هەبوو، گوایا بێ گەڕانەوە بۆ رای گشتی سەرکردایەتی ئیمزای لەسەر بەرەکە کردووە. هەر چوار رۆژ دوای راگەیاندنی (جوقد)، مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالست لە ١٦/١١/١٩٨٠، نامەیەك بۆ حزبی شیوعی دەنووسێ و، بێ ئاگایی خۆیان لەدروستبوونی ئەم بەرەیە رادەگەیەنن. لەنامەکەیاندا هاتبوو: (ئێمە هیچ مەعلوماتێکمان نییە لەبارەی جەبهەوە و لەهیچ شوێنێکەوە ئاگادار نەکراوین و مەوزوعەکەمان لا روون نییە، بۆیە چاوەڕوان ئەکەین تەفاسیلمان پێ بگات لەم بارەیەوە... خۆتان ئەزانن یەکێتی لەگەڵ ئێمە چەندە گیروگرفت و مەشاکیلی هەیە و ئەوان لەو ماوەی رابردوودا دەیان کاری ناڕەوا و تاوانیان دژی هەڤاڵانی ئێمە کردووە کەلەئەنجامی ئەوە حەوت هەڤاڵی قارەمانمان شەهید کراوە بەدەستی چەکدارەکانی ئەوان و زیاتر لە ٣٥ پارچە چەکی هەمەچەشنەیان بەتاڵان بردووە.. ئێمە ئامادە نینە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی دابنیشین... ئەوان شەڕمان پێدەفرۆشن، پێنج پیاو کوژ لایان هەیە، دەبێ بیدەن بەئێمە، ئەوکات گفتوگۆیان لەگەڵ دا دەکەین. دەنا هەوڵ دەدەین بەشەڕ تۆڵەی خۆمانیان لێ

بکەینەوە...)[١٨٩].

دەبێ ئەوەش بزانین، پێش ئەو نامەیەی سۆسیالیست بۆ حزبی شیوعی، شیوعی داوای لەیەکێتی و سۆسیالیست کردبوو، کەهەرچی زووە ئەوان (حزبی شیوعی و لایەنە کوردییەکان)، پێکەوە دابنیشن و کێشەکانیان چارەسەر بکەن، تاوەکو پێکەوە هانی جەماوەر بدەن و دژی رژێم رابپەڕن، ئەوانیش چالاکی کەمەرشکێن لەدوژمن بدەن. بەڵام هەر زوو مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەنامەیەکی کورتدا، وەڵامی حزبی شیوعی دەدەنەوە و دەنووسن: (حەز ناکەین ئێستاکە بانگەواز لەگەڵ حسك بڵاوبکەینەوە)[١٩٠].

حزبی سۆسیالیست هەر لەسەرەتاوە، زۆر بەساردییەوە، پێشوازی لەم بەرەیە کرد، چونکە لەسەر گۆڕەپانی خەباتی چەکداری کۆمەڵێك گیروگرفتی لەگەڵ یەکێتیدا هەبوو، کارکردن لەگەڵ یەکێتی لەبەرەیەکدا بەئاسانی پێی ئیستیعاب نەدەکرا، چونکە لە (١٩٧٦- نەورۆزی ١٩٧٩)، ئەزموونێکی زۆر تاڵیان لەگەڵ یەکێتی دا، هەبوو... بۆیە لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق کەوتنەخۆ بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێکی تر و دروستکردنی بەرەیەکی تر لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەوەبوو لەرۆژی ١٩٨٠/١١/٢٨، لەراژان، (بەرەی نیشتمانی دیموکراتی- جود)یان، راگەیاند، کەدواتر، (پارتی سۆسیالیستی کورد- پاسۆك)یش، چوونە پاڵیانەوە. لەپاش دروستبوونی (جود)، لەنێوان د. مەحمود و رەسوڵ مامەند، وردە وردە، ناکۆکییەکان وەدەرکەوتن.

## ٨- بەرەی جـود

بەرەی نیشتمانی دیموکراتی- جود، لەراژان راگەیاندرا و رەسوڵ مامەند و تاهیری عەلی والی، بەنوێنەرایەتی حزبی سۆسیالست، ئیمزایان لەسەر کرد. پارتی دیموکراتی کوردستان، دەیویست لەبەرەی بەرفراوانی عێراقی (جوقد)، بەشداریان پێ بکرێت، بەڵام یەکێتی رازی نەدەبوو پارتی بێتە ناو ئەم بەرەیەوە. چەند مەرجێکی پێش وەختی خستبووە بەردەم پارتی، نموونەی: (راگرتنی شەڕ لەرۆژهەڵاتی کوردستان و گواستنەوەی ناوەندی خەباتی چەکداریان بۆ دەڤەری بادینان)... پارتیش نەدەچووە ژێر باری جێ بەجێ

کردنی ئەم مەرجانەوە... لەکاتی راگەیاندنی بەرەی (جود)دا، مەسعود بارزانی بەراشکاوی دەڵێت: (وام دێتە بەرچاو کەبۆ رازی کردنی ئێمەیە دەنا بۆچی لەبەرەی نیشتمانی نەتەوایەتی دیموکراتی عێراقی- جوقد، کەچەند رۆژ پێش ئیمرۆکە لەدیمەشق مۆرکرا، دوور بخرێینەوە)(١٩١).

هەرچۆنێك بێت، بەرەی (جود) دامەزرا و بووە دووەمین (بەرە)ی سەر گۆڕەپانی خەباتی سیاسی و چەکداری لەعێراقدا. لەیەکەمین بەیاننامەیاندا، ئەوەیان راگەیاندبوو کەئامادەن لەگەڵ هەموو حزب و لایەنە عێراقییەکان لەپێناو روخاندنی رژێمی عێراق، خەبات بکەن. (حزبی شیوعی)یش لەبەشداربوونی لەدوو بەرە (جوقد) و (جود)دا، پێیوابوو: دەتوانێت هەوڵی زیاتر بدات بۆ لەیەکتر نزیك کردنەوەی لایەنە کوردییەکان، بەتایبەتیش (یەکێتی و پارتی). لەدواجاردا، ئەویش بالانسەکەی پێڕانەگیرا و کەوتە بەرەی (جود)ەوە.

دوای راگەیاندنی (جود)، (مام جەلال زۆر سەغڵەت دەبێ و هەڕەشەی زۆر لەشیوعی دەکات، داواش دەکات ئەندامێتی شیوعی و حسیك لەجوقد بوەستێنێ)(١٩٢). نەك هەر یەکێتی، (بەڵکو حزبی بەعس- هەرێمی عێراق-یش، دژایەتی بەرەی جودیان دەکرد)(١٩٣).

دوای ئەوەی کەیەکێتی و لایەنە عێراقییەکانی ناو (جوقد)، فشاری زۆر بۆ سەرکردایەتی حزبی شیوعی دێنن و رازی نابن بەرەیەکی تر لەسەر گۆڕەپانی عێراقیدا هەبێت. لەبەر کاریگەری ئەم فشارە، بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێك، عەزیز محەمەد (سکرتێری ئەوکاتی حزبی شیوعی عێراق)، دەڵێت: (دوای دامەزراندنی بەرەی جود، بەیانێکمان دەرکرد بەحەل کردنی جود بەو مەرجەی پارتی لەبەرەی جوقدا بەشدار بکرێت، پارتی رازی بوو، بەڵام جوقد ئامادە نەبوون ئەمە قبوڵ بکەن)(١٩٤).

بەبوونی حزبی سۆسیالیست لەدوو بەرەی جیاوازدا، وردە وردە ناکۆکی زێتر کەوتە نێوان ریزەکانی سۆسیالیست، بەتایبەتیش ناو سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و خودی رەسوڵ مامەند و د. مەحمود. ئەمەی دواییان، زێتر لەسوریا دەژیا، ناوە ناوە دەهاتەوە شاخ و زوو دەڕۆیشتەوە دەرەوە. کەلەساڵی ١٩٨١

گەڕایەوە شاخ، ناوبراو زۆر لەوە ناڕازی بوو کەسۆسیالیست چۆتە ناو بەرەی (جـود)، ئەمـەش زێـتر بـەهۆی فـشاری یـەکێتی و خـودی مـام جـەلال و بەعسییەکانەوە بوو لەسەری. (حزبی شیوعی)ش نێوانی لەگەڵ رەسوڵ مامەند خۆشتر بوو نەك دکتۆر مەحمود. ئەوان دەیانگوت: (د. مەحمود راستڕەوە و هەق نییە لەگەڵ ئێوە بێت)(١٩٥).

دوا بەدوای راگەیاندنی ئـەم دوو بەرەیـە، لـەجیاتی ئـەوەی باسـکی خـەبات لـەدژی رژێـم تونـد و تـۆڵتر بکرێـت و ناکۆکییـەکانی پەلـەکانی سـەر گۆڕەپـانی خـەبات چارەسـەر بکرێـت، وردە وردە درز و ناکۆکییـەکان گـەورەتر بـوون. لـەناکۆکی و شـەڕە بـەیان دەرکردنـەوە، بـۆ شـەڕی چـەکداری دژ بەیـەك، گواسـترایەوە... لەمەشـدا، گـەورەترین زیـانی مـاددی و گیـانی بـەر جەسـتەی هەردوو حزبی هاوپەیمان، (شیوعی و سۆسیالیست) کەوت. ئەوان: زەرەرمەندی سەرەتا و کۆتایی بوون.

## ٩- لەهێرشی راگەیاندنەوە بۆ شەڕی خوێناوی

لەگەڵ یەکەم شەوی جیابوونـەوەدا، ئیـستگەی (دەنگـی یـەکێتی نیـشتمانی کوردستان)، هێرشێکی چڕی راگەیانـدنی بـۆ سـەر (بزوتنـەوە و گروپەکـەی د. مەحمود)، دەست پێکرد. رۆژانە، لەوتاری ئیستگەکەیاندا، دەیان تۆمەتیان بـۆ هەڵدەبەستن و بەپیاوی رژێمـی عێراقیـان، نـاوزەد دەکـردن. یـەکێتی، ئەوکاتـە سەرەڕای بوونی رادیۆ، چـەند بڵاوکراوەیـەکی مانگانـە و وەرزیـی هـەبوو. جگـە لەمەش، (لەچـاو ئـەوکات)، راگەیانـدنێکی باشـیان هـەبوو. بۆیـە لـەرێگای ئـەم مینبەرانـە و بـەردەوامیان بەسیاسـەتی دژایـەتی کـردن و ناوزڕانـدن، دەدا... بزوتنەوە، ئەوکات، خاوەنی هیچ لەمانە (بڵاوکـراوە، وەرزنامـە، رادیـۆ) نـەبوو، جگە لەدەرکردن و بڵاوکردنەوەی بەیاننامـەی یـەك دوو لاپـەڕەیی بـەلاوە، هـیچ شـتێکی تریـان شـك نـەدەبرد. گـەر ئـەوانیش لـەرووی راگەیاندنـەوە دەسـت رۆیشتوو بوونایە، دڵنیـام وەڵامـی خۆیـان دەبـوو... لـەم سـەروبەندەدا، حزبـی شیوعی عێراق، هاتبوونـە شـاخ، پەیوەنـدیان لەگـەڵ هـەردوو لایـەنی دژ بەیـەك خـۆش بـوو، بەتایبـەتیش لەگـەڵ یـەکێتی. بـۆ راگرتنـی هێرشـی راگەیانـدن

لەسەریان، رەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود عوسمان، نامەیەك بۆ حزبی شیوعی دەنووسن، لە ١٩٧٩/٤/٣٠دا، دەگاتە دەستی فاتح رەسوڵ و لێپرسراوەکانی تری حزبی شیوعی. لەنامەکەیاندا هاتبوو، داوایان کردبوو، حزبی شیوعی بەرۆڵی خۆی هەڵسێت و نێوەندگیری بکات، داوا لەیەکێتی بکات هێرشی راگەیاندنی ئێستگەکەیان بۆ سەریان رابگرن... برادەرانی حزبی شیوعی، هەوڵی خۆیان دەدەن، بۆ ئەم مەبەستە، سەردانی مام جەلال دەکەن. مام جەلال پێیان دەڵێت: ئێمە تاك لایەنە هێرشمان نەکردووە، ئەوانیش تەخسیر بەئێمە ناکەن... لەم کاتەدا، رۆژنامەیەکی ئێرانیان پێ نیشان دەدات کەلەتاران دەرچوو بوو. لەوێدا،حاجی حاجی برایمی بزوتنەوە و قادر جەباری لێپرسراو لەکۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی، هێرشێکی توندیان کردبووە سەر یەکێتی و خودی مام جەلال(١٩٦).

ورده ورده بارگرژییەکان تەشەنەیان کرد، لەمینبەری رادیۆ و بڵاوکراوەکاندا تێپەڕی و گەیشتە نێو ریزی رێکخستنی ناو شارەکان و هێزی پێشمەرگە و لایەنگیر و هەوادارانی هەردوولا. لەرۆژی ١٩٧٩/٥/٣دا، هەشتا پێشمەرگەی بزوتنەوە بەسەرکردایەتی سەید کاکە، دەچنە گوندی بێدەڵان و پێشمەرگەکانی یەکێتی، لەوێ دەردەکەن و دەست بەسەر خاڵی گومرگدا دەگرن. بەیەکێتییەکان دەڵێن: لەمە بەدوا، ئەم خاڵەی گومرگ، لەدەستی ئێمەدا دەبێت و ئێمە باجەکەی وەردەگرین... بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و یەکلاکردنەوەی کێشەکان، حزبی شیوعی دەکەوێتە نێوانیان. لە ١٩٧٩/٥/٥دا، بەنێوەندگیری حزبی شیوعی، یەکێتی، (دکتۆر کەمال خۆشناو و سالار عەزیز) و بزوتنەوە، لەسەر ئەم خاڵانەدا، رێك دەکەون:

- پارە و پوولی گومرگی گوندی بێدەڵان، بۆ برادەرانی گۆڕەشێر- بزوتنەوە-، بێت.
- هێرشی راگەیاندن، بۆ سەر یەکتر رابگرن.
- ئەو پارە و چەکەی لەدەرەوە بۆ یەکێتی دێت، پشکی بزوتنەوەشی تێدایە. دەبێت یەکێتی، پشکی بزوتنەوە و لیژنەی تەحزیری، لێ بدات(١٩٧).

رێککەوتنەکە مۆر دەکەن، بەڵام ناچێتە بواری جێ بەجێکردنەوە. بۆ لێپێچینەوەی هۆکاری جێ بەجێ نەکردنی، لەلایەن یەکێتیەوە، رۆژی

١٩٧٩/٦/١٠، رەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود و کۆمەڵێك پێشمەرگە، سەردانی بارەگای حزبی شیوعی دەکەن و دەیانەوێت بزانن، بۆ یەکێتی پابەند نەبووە بەرێککەوتنەکە و، بەردەوامە لەسەر هێرشی راگەیاندن، بۆ سەریان[١٩٨].

دوای مۆرکردنی ئەم رێککەوتننامەیە، هیچ لایەنێکیان پێیەوە پابەند نەبوون. هەر لایەنەو لایەنی بەرامبەری بەوە تۆمەتبار دەکرد کەهۆکارە بۆ جێ بەجێ نەکردنی بەندەکانی رێککەوتننامەکە. موخابەراتی عێراقیش لەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و زەمینەسازکردنی شەڕی ناوخۆ، رۆڵی خۆی دەگێڕێت... هەردوو لایەن، لەبچووکترین بیانوو بۆ یەکتر دەگەڕان. هەوڵ دەدەن، پێشمەرگەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن. (شەفیق زاهیر کۆیی)، فەرماندەی یەکێك لەمەفرەزەکانی بزوتنەوە، بەهاندان و بەڵێنی (عەلی حەوێز)، لەناو بزوتنەوەوە، دەگەڕێتەوە ناو یەکێتی. شەفیق زاهیر، ناسراو بە (شەفە)، بەجەولە دەچێتە خوارەوە. لە ١٩٧٩/٧/٥دا، لەگوندی (شوشکە)ی بناری چیای کۆسرەت، لەگەڵ (شێرکۆ شێخ عەلی)، فەرماندەی بزوتنەوە، رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە و دەکەونە شەڕەوە... لەئەنجامدا: سێ پێشمەرگەی بزوتنەوە شەهید دەبن، کەیەکێکیان (سەلام)ی برای شێرکۆ بوو[١٩٩]. شاخەوان عەباس، ئەوکاتە کادیری کۆمەڵە و فەرماندەی پێشمەرگەکانی یەکێتی بووە، لەبارەی ئەم رووداوەوە نووسیویەتی: (ئەمجارەشیان، لەراستیدا شەفیق بەرزاییەکانی شووشکەی لەشێرکۆ گرتبوو... ئەمە سەرکەوتنێکی مەعنەوی بوو بۆ ینك و هێزەکەی شەفیق زاهیر، بۆیە بەردەوام بوو لەجەولە کردن بەم ناوەدا تا رۆژی ١٩٧٩/٨/١١، هێزەکەی شەفیق لەدەشتایی قوڕەبەرازە تووشی هێزێکی زۆری رژێم دەبن لەجاش و سەرباز و کۆپتەر، لەئەنجامدا شەفیق زاهیر و هەژدە پێشمەرگە شەهید دەبن)[٢٠٠]. سەرەڕای بەردەوامی هێرشی راگەیاندن، لەماوەی سێ مانگ و نیودا، ئەم شەڕە خوێناوییە لەنێوان ئەم دوو هێزەدا، رویدا، کەلەشەڕەکەدا، بەدانپیانانی خودی فەرماندەکانی یەکێتی، ئەوان بەرپرسی یەکەمی هەڵگیرساندنی شەڕەکان، بووینە... ئەم شەڕە، بووە دەستپێك بۆ بەردەوام بوون لەسەر شەڕی تر. ئەم دوو لایەنە، ناوە ناوەش رێککەوتننامە و ئاگربەستیان رادەگەیاند، بەڵام کاتی دەبوون و، دووبارە سەریان هەڵدەدایەوە.

## ١٠- پەیوەندیکردنی محەمەدی حاجی مەحمود به (سۆسیالیست)ەوە

محەمەدی حاجی مەحمود، ناسراو بە (کاکە حەمە)، یەکێك بووە لەپێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان، بەدرێژایی ماوەی پێشمەرگایەتی، چەندین پلە و لێپرسراویەتی دیار و گرنگی لەئەستۆدا بووە. ئەو، سەرەتا لەنێو ریزەکانی یەکێتی بوو. سەرەتا لەگەڵ کۆمەڵە هاوسۆز بووە، بەڵام لەلایەن لێپرسراوە باڵاکانی کۆمەڵە، نموونەی مەلا بەختیار و نەوشیروان مستەفاوە، بەربەرەکانی زۆری کراوە. بەرەنجامی ئەم رکابەری و فشار هێنانە، وای لەکاکە حەمە کردووە کەزێتر بکەوێتە خانەی هێڵی گشتی و نزیك لەمام جەلال. سەرکردایەتی چەندین شەڕ و داستانی کەم وێنەی کردووە، بەتایبەتیش لەناوچەکانی شارەزوور و سلێمانی. دەربارەی ئەم فشارە زۆرەی سەری و رکابەرێتی کردنی، ناوبراو دەنووسێت: (لەرۆژی ١٩٧٨/٤/١٥، من و مامۆستا تالیب رۆستەم لەسەر هەڵسوکەوتی نابەجێی هەندێك لەمەسئولەکانی کۆمەڵە ئیستیقالەمان دا. وازمان لەکۆمەڵە هێنا)[٢٠١]. ئەم ئیستیقالە کردنەی لێ قبوڵ نەکرا و لەریزەکانی یەکێتیدا مایەوە. لەبەر ئەوەی خەڵکی ناوچەکە و کەسایەتیەکی دیار و چالاك بوو، زۆر نەچۆتە ژێر باری دیسپلینی حزبایەتی و هەولی داوە کەسایەتی و بیروباوەڕ و بۆچوونی خۆی بچەسپێنێت و خاوەن هەڵوێستی خۆی بێت. هێشتا هەر لەناو یەکێتیدا بووە و لەسەر هێڵی گشتی حسێب کراوە، ئەوکات، کێشەی پۆستی فەرماندەی هەرێمی (١)ی سلێمانی هێشتا یەکلا نەببۆوە کەکێ بکرێتە فەرماندەی... لەسەر ئەم پۆستە، سێ کەس لەململانێدا بووینە (محەمەدی حاجی مەحمود، شەوکەتی حاجی مشیر، رەئوفی خەلیفە سەعید)... کادیر و سەرکردەی دیاری کۆمەڵە، پشکۆ نەجمەدین، دەنووسێت: (هەرێمی یەك، یەکێك لەهەرێمە بەهێزەکانی یەکێتی و پانتایی ململانێی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە، کۆمەڵە و لێپرسراوەکانی دەرەوەی کۆمەڵە بوو.. جیابوونەوەی بزوتنەوە، دوای ئەوەی کەشەوکەتی حاجی مشیر لای ئەوان گیرسایەوە... کادیرانی کۆمەڵە، لەنێوان شەوکەت و حەمەدا،

هەمیشە لایەنگیری حەمە بوون و ئەمیان پێ شایستە و شیاوتر بوو... حەمەی حاجی مەحمود لەدیدی کادیرانی کۆمەڵەوە، کادیرێکی عەسکەری چالاك و بەتوانا بوو، کەسێکی نەرم و لەسەرخۆ کەمامەڵە و هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا هاسان و بێگرفتتر بوو... دیسانیش کەسایەتیەکی عەشایەر و دەرکەوتووی ناوچەکە بوو)[٢٠٢]. هەروەها جگە لەمەش، خۆی خاوەن هەڵوێست و بڕیاری خۆی بووە و (هەڵگری خەونێکی گەورە بوو)ە[٢٠٣].

ململانێکان بەردەوام بووینە و گەیشتونەتە ئاگادار کردنەوە و هەڕەشە لەیەکتر کردن، بەتایبەتیش لەلایەن چەند لێپرسراوێکی باڵا دەستی کۆمەڵە. یەکێتی، ناوبراوی بەوە تاوانبار دەکرد کەکەسێکی عەشایەر و تاکڕەوە و گوێ بەبڕیارەکانی سەرکردایەتی نادات، خۆی هەموو شتێکە. بۆیە لەرۆژی ١٩٨٠/٩/٢٩، لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەن و فەرماندی کەرتەکانی سڕ (تەجمید)، دەکەن. جارێکی تر، لەرۆژی ١٩٨٠/١٠/١٤دا، لەگفتوگۆیەکی توند و پڕ لەهەڵچووندا، هەر لەسەر مەسەلەی ئیلتیزامات، ناوبراو و نەوشیروان مستەفا لەیەکتری توڕە دەبن. لە ١٩٨٠/١١/٦دا، کەناوبراو دەچێتە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی، عەلی حەوێز و سەید مەجید ئاگاداری دەکەنەوە کەنەچێتە ئەو کۆبوونەوەیە، چونکە ئەوان پێیانوابووە ترسناکە، دووریش نییە بیکوژن. بەڵام ئەو گوێ بەلێپرسینەوە و هەڕەشەکان نادات و دەچێتە کۆبوونەوەکە و بێ منەتانە ئامادەی لێپرسینەوە دەبێت. لەم کۆبوونەوەیەدا نەوشیروان مستەفا، کەسی یەکەمی کۆمەڵە و کەسی دووەمی باڵا دەست و دەست ڕۆیشتووی یەکێتی، ڕووبەڕوو بەناوبراو دەڵێت: تۆ چیت دەوێ و چی دەکەیت؟ ئێمە دەمانەوێت هەموو مەسئولیاتێك لەتۆ وەربگرینەوە و خەڵکی بزانێ کەیەکێتی لەتۆ باڵا دەسترە... هەر لەم سەرو بەندەدا، مەلا بەختیار نامەیەك بۆ ناوبراو دەنووسێت و ئاگاداری دەکاتەوە و پێی دەڵێت: کێ دەڵێت بەناوی یەکێتییەوە قسە بکەیت، بۆت نییە، دەبێت لەم سێ خاڵە کامیان هەڵدەبژێریت، خۆت مخەوەلیت:

١- تەسلیم بوون بەئێمە واتا یەکێتی.

٢- تەسلیم بوونەوە بەعێراق.

٣- تەسلیم بوون بەئێران.. نابێت چیتر لەکوردستاندا بیت[٢٠٤].

لە ١٩٨٠/١١/٦دا، هەر دوازدە فەرماندەی کەرتەکان و خودی محەمەدی حاجی مەحمودی فەرماندەی هەرێمی (١)، سڕ دەکرێن. لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەی یەکێتی، ناوبراو کاردانەوەی دەبێت و لەرۆژی ١٩٨٠/١٢/١١دا، واز لەپۆستی فەرماندەی هەرێم دێنێ و مۆری فەرماندەیی، تەسلیم بەمەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری، دەکاتەوە.

(حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)یش، لەم بینە و بەردە و ململانێیەدا، ئاگادار دەبن، حەز دەکەن ناوبراو، پەیوەندی بەریزەکانی ئەوانەوە بکات، چونکە بەهاتنی ناوبراو، پێگەی ئەوان (سۆسیالیست)، لەناوچەی شارەزوور و دەوروبەری سلێمانی، بەهێز دەبێت. ماوەیەك پێش توند بوونی ئەم ململانێیەی کاکە حەمە و یەکێتی، رۆژی ١٩٨٠/٩/٧، رەسوڵ مامەند و دوو ئەندامی سەرکردایەتی حسیك لە (زەڵێ)، لەگەڵ سکرتێری هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی کۆدەبنەوە و بەدڵخۆشیەوە، باسی کێشەکانی نێوان محەمەدی حاجی مەحمود و یەکێتیان کردبوو[٢٠٥].

بەهۆی فشاری زۆرەوە، محەمەدی حاجی مەحمود، چیتر ناتوانێت دان بەخۆیدا بگرێت. بۆیە لەرۆژی ١٩٨٠/١٢/٧دا، بەخۆی، وەك فەرماندەی هەرێمی یەکی یەکێتی و پێنج فەرماندەی کەرت و، دە فەرماندەی مەفرەزە و زیاتر لەسەد (١٠٠)، پێشمەرگە، بەئارەزووی خۆیان بڕیار دەدەن لەریزەکانی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، درێژە بەخەبات کردن بدەن و پەیوەندیان پێوە دەکەن[٢٠٦].

حزبی سۆسیالیست لەنامەیەکدا، داوا لەحزبی شیوعی دەکەن کەیەکێتی ئاگادار بکەنەوە لەوەی کەلەسەر مەسەلەی پەیوەندی کردنی ناوبراوەوە کێشەیان بۆ دروست نەکەن و، ئەم پەیوەندی کردنە، وەك هەڵوێستی ئازاد و سەربەخۆ حسێب بکەن، چونکە پێش ئەم پەیوەندی کردنە، شەوکەتی حاجی مشیر و فەقێ بایز و چەتۆ، ریزەکانی (سۆسیالیست)یان جێهێشتووە و چوونەتە ناو یەکێتییەوە و چەکیشیان بردووە. لەگەڵ ئەوەی کەهەندێکیان لەژێر چاودێری و لێپرسینەوەشدا بوونە لای حسیك[٢٠٧].

بەم هەڵوێست وەرگرتنەی محەمەدی حاجی مەحمود، یەکێتی زۆر دەشڵەژێ و، هەولێ تۆڵە کردنەوە دەدات. چونکە بەهۆی وازهێنانی ناوبراو، پێگەی یەکێتی، بەتایبەتی لەناوچەی شارەزوور، زۆر بێ هێز دەبێت... بۆیە لەرۆژی ١٩٨٠/١٢/١٤دا، رادیۆی یەکێتی، بەیانێکی دوور و درێژ لەسەر هەرێمی یەك و لێپرسراوەکان و خودی محەمەدی حاجی مەحمود دەردەکات و، چەندین ناو و ناتۆرەی بۆ دادەتاشێت و دەڵێت: ئەوانە، لەسەر دزی و جەردەیی دەرکراون، کەس هاوکاریان نەکات و بیانگرن و تەسلیممان بکەنەوە[٢٠٨]. کەچی هەر چەند رۆژێك پێش دەرکردنی ئەم بەیانە، محەمەدی حاجی مەحمود لەدیدی یەکێتیەوە، کەسایەتیەکی دیاری ناوچەکە و پێشمەرگەیەکی ئازا و پاڵەوانی ناوچەکە بووە. لەئەنجامی ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕی نێوان حزب و هێزەکانی کوردستان، زەمینەی ئەوە رەخسا بوو کەهەر هێز و کەسایەتیەك بەئاسانی بتوانێت لەم هێز و حزب، بۆ ئەم هێز و حزبێکی تر باز بدات و سەنگەر بگوازێتەوە... هەر لایەنێکیش کەکەسێکی لێ جیا دەبۆوە ریسوای دەکرد و ناو و ناتۆرەی بۆ هەڵدەبەستی. ئەو لایەنەش کەئەو کەسە پەنای بۆ دەبرد، بەپێچەوانەوە و دەیکرد بەپاڵەوان و بەشان و باڵی هەڵدەگوت[٢٠٩].

لەمە بەدواوە، محەمەدی حاجی مەحمود (کاکە حەمە)، بووە سۆسیالیست و کەسایەتیەکی بەهێز و خاوەن پێگە لەناوچەکە و، توانی پێگەی حسیك لەناوچەی شارەزوور و سلێمانی، بەهێز بکات.

## ١١- کۆنگرەی یەکەمی حزب

هەر لەسەرەتای ساڵی (١٩٨١)دا، حزب بڕیاریدا کەیەکەم کۆنگرەی خۆی ببەستێت. بۆ ئەم مەبەستە دەستی بەئامادەکاری کرد. کۆمەڵێك لیژنەی بۆ سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەچوونی کۆنگرە، پێکهێنا. بەپێی بڕیاری ژمارە (٥)ی لیژنەی ئامادەکردنی کۆنگرە، دەرچوو لە ١٩٨١/٣/١٦، کەئاڕاستەی هەموو هەرێم و لق و ناوچەکانی کردبوو، ئەم کەسانە مافی ئەوەیان هەبوو کەبەشداری کۆنگرە بکەن:

١- هەر (٥٠) پەنجا پێشمەرگەیەك، دەتوانن نوێنەرێك بۆ کۆنگرە هەڵبژێرن

ئەگەر لەهەر شوێنێکیش زیاتر لە (٢٥) پێشمەرگە هەبوو، ئەوا نوێنەرێکیان لەکۆنگرە دەبێت.

٢– هەموو فەرماندەی هەرێمەکان، بێ هەڵبژاردن، راستەوخۆ ئەندامی کۆنگرەن.

٣– هەموو ئەندام لق و ناوچەکان[٢١٠].

(یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، ئەوەی دەزانی کەحزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان (حسیك)، خەریکی بەستنی کۆنگرەن، نێوانی (رەسوڵ مامەند و د. مەحمود عوسمان)یش، خۆش نییە و سەرەنجام، کۆنگرە، حزب بەرەو دوو ئاقاری جیاواز و لێکترازان دەبات. د. مەحمود و گروپەکەی، بەپێچەوانەی (بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان)، کاتێك کەلەیەکێتی دەرچوون، هیچ گرفتێکیان لەگەڵ یەکێتی و خودی مام جەلال، نەبوو. بەپێی زۆربەی گێڕانەوە و شایەدحاڵە زیندووەکان، هەرچەندە بزوتنەوە نەیدەویست لەناو (یەکێتی)دا، بمێنێتەوە، بەڵام دکتۆر مەحمود، هێندەی تر هانی دەدات کەلەناو یەکێتی دەرچن. پاش دەرچوون، بەماوەیەکی کەم، دکتۆر مەحمود دووبارە کەوتەوە ژێر کاریگەری یەکێتی و خودی (مام جەلال)ەوە.

ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان: ناوبراو خۆی و خانەوادەکەی لەسوریا دەژیان لەژێر هەژموون و فشاری سوریا و حزبی بەعسی (هەرێمی عێراق)دا بوو. دووەم: (مام جەلال)یش، بەهەمان شێوە لەوێ بوو. لەگەڵ حزبی بەعسی و گروپە بەرهەڵستکارە عێراقییەکانی سەر بەسوریا، دۆست و تەبا بوون. ئەوکاتەش، زێتر لەیەکێتی نزیك بۆوە، کەئیمزای لەسەر دامەزراندنی (بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی دیموکراتی– جوقد)، لەدیمەشق کرد. لەکاتی بەستنی کۆنگرەی حسیك، یەکێتی ئەم راستیانەی دەزانی، بۆیە کەوتەخۆ، تاوەکو بەهەر شێوەیەك بێت تۆڵەی خۆی لەبزوتنەوە بکاتەوە و درزێك بخاتە کۆنگرە و (د. مەحمود و جەماعەتەکەی)، لەسۆسیالیست جیا بکاتەوە و، لەدواجاردا: وەك حزبێکی سەربەخۆ، لەگەڵ یەکێتی دا، تێکەڵ ببنەوە. بۆ ئەم مەبەستە یەکێتی بەتەمای ئەوە بوو کە د. مەحمود لەشەش (٦)ی گوڵانی ١٩٨١، واتە: (١٩٨١/٤/٢٦)، کۆنگرەیەك ببەستێت، بڕی (٣٠٠) سێ سەد هەزار تمەنیشیان

بەقـەرز بـەناوبراو دابـوو، تـاوەکو بتوانێـت سـەرکەوتوانە کـاری کۆنگرەکـە و خواستی یەکێتی، رایی بکات... هەروەها، هەوڵی دەدا کەسەرچاوەی هاوکاری (حسیك) و رەسـوڵ مامەنـد، لـەئێران، وشـك بکـات. بـەم شـێوەیەش، (بـەرەی نیـشتمانی دیمـوکراتی– جـود)، هەڵبوەشـێتەوە و پـارتی بەتـەنیا بمێنێتـەوە. ئەگەر لەم کۆنگرە پێشنیارکراوەدا، د. مەحمود سەربکەوتایە، بڕیار بوو بەناوی حزبەوە، بچێتە ناو یەکێتییەوە[٢١١]. پیلانە نەخشە بۆ داڕێژراوەکە، جـێ بـەجێ نەکرا.

دوای تـەواوبوونی ئامادەکارییـەکان و ئامـادەبوونی ئەنـدامان، بەبەشـداری (١١٥) ئەنـدام، لـەرۆژی ١٩٨١/٥/١٢، لەگونـدی (دۆڵـەتوو)، لـەناو باخـچە و دارستانەکەی ناو گوند، لەسەر زەوی، کۆنگرە دەستی بەکارەکانی کرد.

دروشمەکانی کۆنگرە بریتی بوون لە:

– دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان.

– تێدەکۆشـین لـەپێناو دامەزرانـدنی بەرەیـەکی نیـشتمانی بـەرفراوان، بـۆ روخانـدنی رژێمـی فاشـی بەغـدا و هێنانـە سـەر کـاری حکومـەتێکی نیـشتمانی دیموکراتی بنکە فراوان.

– دژی ئیمپریـالیزمی جیهـانی بەسـەرکردایەتی ئەمـەریکا و زایـۆنیزم و کۆنەپەرستانی ناوچەکە، دەجەنگین.

محەمـەدی حـاجی مـەحمود، بـەهێزێکی زۆرەوە، هێنـدە نـەبوو پەیوەنـدی بەریزەکانی حزب کردبوو. (عادل موراد)یش، هەرچەندە یـەکێك بـوو لـەم چـوار پێـنج کەسـەی کـە (یـەکێتی)یـان دامەزرانـدبوو، بـەڵام بـەهۆی ململانـێ و نەگونجانـەوە، هـاتبووە نـاو سۆسیالیـست. عـادل مـوراد، بـەو سـیفەتەی کەلەسەردەمی پێش تواندنەوەی شۆڕشی ئەیلول (سەرۆکی یـەکێتی قوتابیـانی کوردستان) بوو، کەسایەتییەکی ناسراو بـوو، یـەکێکیش بـوو لەدامەزرێنـەرانی یەکێتی، رێزێکـی زۆری لێ گـیرا. لەبەرئـەوەی کەسـەر بـەهیچ بـاڵێکیش نـەبوو، ئەرکی سەرۆکی لیژنەی ئامادەکردن و سەرپەرشتیکردنی کۆنگرەی پێ سپێردرا بوو. جگە لەئەندامانی حزب لە (نوێنەرانی رێکخستنەکانی ناوشار و هەنـدەران، کۆنە ئەندام سـەرکردایەتیەکان)، چـەند کەسـێکیش بـەناوی حەلقـەی سـەقافی

(بازنەی رۆشنبیری)[٢١٢]، کەپێشتر سەر بەقیادەی موەقەتــە بــوون، لــە (ســامی عەبدولڕەحمان) تۆرا بوون، لەگەڵ هەریەك لەعەزیز ئاکرەیی، وەزیری راکردووی عێـراق و، (عەبـدولخالق رەشـید زەنگەنـە)ی کـادیری دەسـت لەکارکێـشاوەی پێشکەوتوی حزبی شیوعی و هیوا بەهجەت، ناسراو بە (مام وریا)، کەلەئەڵمانیا گەڕابۆوە، بەشداری کۆنگرەکە بـوون. سـەرەتا، رەسـوڵ مامەنـد، کۆنگرەکـەی کردەوە. بـەخێرهاتنی میوانـەکانی کـرد، راپـۆرتی سیاسـی حزبـی خوێنـدەوە. هـەروەها هۆکـاری فرێـدانی وشـەی (دیمـوکراتی)، رونکـردەوە و گـوتی: بۆیـە (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردسـتان)مـان کـردە (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی کوردسـتان)، چـونکە حزبـە سۆسـیال دیموکراتـەکانی رۆژئـاوا لەخولگەی ئیمپریالیزمی جیهانی و سەرمایەداریدا دەخولێنەوە و لادەر و گومان لێکراون، پێویست بوو خۆمان لەم رێبازە بێزراوە دوور بخەینـەوە. گـرنگترین و بەرچـاوترین گرفتـەکانی کـۆنگرە، بـوونی دوو بـاڵ (دوو جەمـسەری)، بـوو. جەمسەر، یان ئاڕاسـتەی یەکـەم: رەسـوڵ مامەنـد رێبەرایـەتی دەکـرد و (قـادر عەزیز و مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا و شێرکۆ شێخ عەلی و مامۆستا ئـەمین قـادر و گروپی بازنـەی رۆشـنبیری) و بەشـێکی هـەرە زۆری کـادیرانی پلـە دووی حـزب پـشتگیرییان دەکـرد و بیوونــە زۆرینــە. ئاڕاسـتەی دووەم: دکتـۆر مـەحمود عوسمان رێبەرایەتی دەکرد و هەریەك لە (حاجی حاجی برایم و محەمەد وەتمان و موحـسین بـایز و عوسمـانی قـادر منـەوەر و مـلازم فوئـاد عومـەر چـەلەبی) و هەنـدێك لەفەرمانـدە عەسـکەرییەکان، پـشتگیرییان لێـدەکرد. هـەردوو گـروپ، خۆیان ئامادە کردبوو کەلەکۆنگرەدا، کێشەکانیان یـەکلایی بکەنـەوە. (تـاهیری عەلی والی و مەلا ناسیح و قـادر شـۆڕ)یش، لەگـەڵ هـیچ ئاڕاسـتەیەکدا نـەبوون، سیاسەتێکی نەرم و میانڕەویانەیان، پیادە دەکرد.

گروپی یەکەم: پێی لەسەر ئـەوە دادەگـرت کـەدەبێت ئایـدۆلۆژی داهـاتووی حـزب، ئایـدۆلۆژی (سۆسیالیـستی زانـستی) بێـت. هـەروەها، زێـتر لایـەنگیری بـەرەی (جـود) و پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بـوون و (حزبـی شـیوعی عێـراق)یـان، بەدۆسـتێکی سـتراتیژی حـزب دەزانـی. لەبـەرەی (جوقـد)، رازی نەبوون. بیانویـان ئـەوە بـوو کـەحزبی سۆسیالیـستی یـەکگرتووی کوردسـتان،

هێزێکی چالاکی گۆڕەپانی عەسکەری و سیاسییە، کەچی لەناو بەرەی (جوقد)، ڕۆڵێکی وایان پێنەدراوە کەشایانی خەبات و قەبارە و قوربانیەکانی بێت. لەجیاتی ئەوە، حزب و گروپی وا بەرز کراونەتەوە کەهیچ ڕەنگ و سەنگێکیان لەسەر گۆڕەپانەکە نییە و بریتین لەچەند کەسێك، کەچی ڕۆڵی دیار و سەرکردایەتیان پێدراوە. جگە لەمەش، لەسیاسەت و ئیمزا کردنەکەی د. مەحمود، زۆر ناڕازی و بەگلەیی بوون.

گروپی دووەم: پێیان وابوو قۆناغی خەبات، قۆناغی خەباتی ڕزگاری نیشتیمانیە، پێویستە حزب تەنها خۆی لەناو یەك ئایدۆلۆژیای دیاریکراو، گۆشەگیر نەکات. سوود لەهەموو چەمکەکانی (کوردایەتی و سۆسیال دیموکرات و دیموکراتی)، وەربگیرێت و قورسایی خۆی بخاتە سەر خەباتی نیشتمانی و کوردایەتییەوە. هەروەها لایەنگیرییان لەبەرەی (جوقد) و سیاسەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەکرد. لەدووەم ڕۆژی کۆنگرەدا، لەمیانەی گفتوگۆکردن لەسەر کاری لیژنەکان، ناکۆکی و ململانێکان بەئاشکرا دیار بوون و هەموو کەسێك هەستی پێدەکرد. (قادر جەباری و شێروان شێروەندی)یش لەنێوان هەردوو ئاڕاستەکە، سیاسەتیان دەکرد. هەرچی عەزیز ئاکرەیی، تازە هاتووش بوو، دەیگوت: خۆزگە سێ ساڵ زووتر لەیەکێتی دەرچووبان. بەناڕاستەوخۆ، پارسەنگی هێز بوو بۆ ئاڕاستەی ڕەسوڵ مامەند. هەروەك لەدووەم ڕۆژی کۆنگرەدا هەستی پێدەکرا کەلایەنگیری ئاڕاستەی یەکەم زۆرینەن و، هەر ڕای ئەوان سەردەکەوێت. بەزۆرینەی دەنگ، ئایدۆلۆژی حزب بووە (سۆسیالیستی زانستی). هەروەها ناوی حزب، لە (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان– حسیك)، بووە (حزبی سۆسیالیستی کوردستان– حسك).

لەسێیەم ڕۆژی کۆنگرەدا، دەرگای خۆ پاڵاوتن بۆ بوون بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، کرایەوە. هەر زوو، د. مەحمود گوتی: (من خۆم هەڵنابژێرم) لەدوای ئەو، (حاجی حاجی برایم)یش، خۆی هەڵنەبژارد. زۆر تکایان لێکردن کەپەشیمان ببنەوە، بەڵام ئەوان لەسەر ڕاکەیان سوور بوون و پەشیمان نەبوونەوە. د. مەحمود، دەیزانی کەش و هەوای کۆنگرە لەبەرژەوەندی ئەودا یەکلایی نابێتەوە، بۆیە خۆی نەپاڵاوت. بەقسەی (قادر عەزیز)ی لایەنگیری

ئاڕاستەی یەکەم (د. مەحمود بۆیە خۆی هەڵنەبژارد، چونکە دەیزانی دەرناچێت، لەنێو هەموو ئەندامانی کۆنگرەدا تەنها چواردە کەس لەگەڵ ئەودا بوون)[٢١٣]. پێمانوایە ئەم بۆچوونە بەم شێوەیە، زۆر لەڕاستییەوە، دوورە، چونکە پاش تەواوبوونی کۆنگرە، خەڵکێکی زۆر، لەسەرووی چواردە کەسەوە بەگەڵ رەوتەکەی دکتۆر کەوتن و ئەندامی کۆنگرەش بوون. ئەگەر ئەوانە، دەنگیان بەدکتۆر مەحمود نەدەدا، ئەدی پاشان بۆ لەگەڵ ئەو رۆیشتن؟! بەپێچەوانەی رایەکەی قادر عەزیز، د. مەحمود دەڵێت: (لەکۆنگرەدا، ئەوەی چەکدار و پێشمەرگە بوو، هەموو لایەنی ئێمەیان دەگرت)[٢١٤].

**پاش تەواو بوونی پرۆسەی دەنگدان، ئەم پاڵێوراوانە، بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دەرچوون:**

١- عادل موراد ٩٨ دەنگ.
٢- رەسوڵ مامەند ٩١ دەنگ.
٣- تاهیری عەلی والی ٨٩ دەنگ.
٤- ئەحمەد فەقێ رەش ٨٦ دەنگ.
٥- قادر عەزیز ٨٣ دەنگ.
٦- سەید کاکە ٧٩ دەنگ.
٧- خاڵە حاجی ٧٨ دەنگ.
٨- مەلا ناسیح ٧٦ دەنگ.
٩- عەزیز ئاکرەیی ٧٥ دەنگ.
١٠- قادر جەباری ٧٥ دەنگ.
١١- شێرکۆ شێخ عەلی ٧٠ دەنگ.
١٢- محەمەد فاتح (مامۆستا عومەر) ٧٠ دەنگ.
١٣- شێروان شێروەندی ٦٩ دەنگ.
١٤- ئەمین قادر ٦٥ دەنگ.
١٥- قادر شۆڕش ٦٤ دەنگ.
١٦- سەعد عەبدوڵڵا ٦٤ دەنگ.
١٧- عەبدولخالق زەنگەنە ٥١ دەنگ[٢١٥].

**ئـەم پالێوراوانـەش، بەئەنـدامی یـەدەگ (ئیحتیـات)ی کۆمیتـەی ناوەنـدی هەڵبژێردران:**

١- محەمەدی حاجی مەحمود ٧١ دەنگ[٢١٦].

٢- د. هوشیار کۆیی ٥٦ دەنگ.

٣- حوسێن فەیلی (ئەبو عەلی) ٥٥ دەنگ.

٤- عەدنان رەشاد موفتی ٥٢ دەنگ.

٥- ماۆستا شەریف مەولود ؟ دەنگ.

٦- هیوا بەهجەت (مام وریا) ٣٦ دەنگ[٢١٧].

هـەروەها بەشـێوەیەکی نهێنـی، (سـاڵح یوسـفی)، بەسـکرتێری حـزب و، مامۆسـتا (شـێخ محەمـەد شـاکەلی)، ناسـراو بـە (خەلـەف)، کەلێپرسـراوی رێکخستنە نهێنیەکانی ناوەوە بوو، بەئەندامی کۆمیتەی ناوەنـدی هەڵبـژێردران، دوای ئەمە، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوە و لەنێو خۆیاندا هەریەك لە (رەسوڵ مامەند، ملازم تاهیری عەلی والی، قـادر عـەزیز، عـەزیز ئـاکرەیی)یـان، بەئەنـدامی مەکتبـەی سیاسـی، هەڵبـژارد. دوای ئەمـە، بروسـکەی پـشتگیری و سوپاسـنامەی بەشـداربووانی کـۆنگرەی حـزب، ئاڕاسـتەی هەریـەك لـە (ئیمـام خومـەینی- رێبـەری شۆڕشـی ئیـسلامی ئـێران، سـەرهەنگ معەمـەر قـەزافی- رابەری شۆڕشی فاتح و سەرۆکی لیبیا، کۆمیتـەی ناوەنـدی حزبـی کۆمۆنیـستی یەکێتی سۆڤیەت، حـافز ئەسـەد- سـەرۆك کۆمـاری سـوریا، حـزب و رێکخـراوە پێشکەوتنخوازەکانی فەلەستین، حزبی شیوعی یەمەن، حزبی شـیوعی لوبنـان، بەرەی (جوقد)، بەرەی (جود)،...تاد)، کرا.

**کۆنگرە لە ١٩٨١/٥/١٥دا، تەواو بوو. هەر لەوێدا بەرپرسی لقەکانیش، بەم شێوەیە دیاری کران:**

١- قادر شۆڕش- بەرپرسی لقی هەولێر.

٢- شێرکۆ شێخ عەلی- بەرپرسی لقی سلێمانی.

٣- محەمەد فاتح- بەرپرسی لقی کەرکوك.

٤- مامۆستا ئەمین قادر- بەرپرسی لقی بادینان.

دوای شەهید بوونی سالّح یوسفی لە ١٩٨١/٦/٢٥ لەبەغدا، محەمەدی حاجی مەحمود بەبڕیارێکی کۆمیتەی ناوەندی لەتەموزی ١٩٨١، لەئەندامی (یەدەگ)ەوە کرایە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. هەروەها لەکۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندیدا، رەسولّ مامەند بەسکرتێری حزب هەڵبژێردرا. کە (شێرکۆ شێخ عەلی)ش، لەشەڕێکی ناوخۆ لەگەڵ یەکێتیدا لە ١٩٨١/٨/٢٣دا، شەهید کرا، محەمەدی حاجی مەحمود بووە بەرپرسی لقی سلێمانی.

لەدوای کۆنگرە، دکتۆر مەحمود، هەرچەندە بەرواڵەت خۆی بەزویر و ناڕازی نیشان نەدەدا، بەڵام لەژێرەوە قسەی لەگەڵ (یەکێتی) کردبوو، کەئەو وەك: (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، دەمێنێتەوە و دان بەم کۆنگرەیەدا نانێت. رادیۆی (یەکێتی)ش بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەیەکێتی شەڕی (حسك)، جەماعەتی رەسولّ مامەند دەکات و شەڕی د. مەحمود و حزبەکەی (حسیك)، ناکات[٢١٨]. د. مەحمود، هێندە لەشاخ نەمایەوە و گەڕایەوە سوریا. لایەنگرانیشی، کەنزیکەی (٢٠٠) دوو سەد کەسێك دەبوون لەفەرماندەی عەسکەری و سیاسی، حزبیان جێهێشت و بارەگای خۆیان بۆ گوندی (شێنێ و بێدەلان)، گواستەوە. گرنگترین کەسە ناسراوەکانیان، ئەمانە بوون:

١- **محەمەد وەتمان:** فەرماندەی هەرێم لەگەڵ نزیکەی حەفتا (٧٠) پێشمەرگە.

٢- **عەبدولڕەحمان سیوەسی:** بەرپرسی هێز، سی (٣٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو.

٣- **فەقێ رەسولّ:** فەرماندەی کەرت، بیست (٢٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو.

٤- **حاجی ئەحمەد:** فەرماندەی مەفرەزە، هەشت (٨) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو.

٥- **موختار:** فەرماندەی کەرت، سی (٣٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو.

٦- **مام پیرۆت:** فەرماندەی مەفرەزە. هەروەها ئەم سەرکردە و کادیر و فەرماندانەش لەگەڵ ئەوان رۆیشتن: (حاجی حاجی برایم، ملازم فوئاد عومەر چەلەبی، مامۆستا عەزیز، عەبدوڵڵای مام عەلی، رەحمان حاجی رەحمان، ئازادی حەمە گەمحان، شێخ محەمەد سەرگەڵویی، محەمەد ئێنەیی، سەید

ڕەحمان، سەرباز کۆیی، موحسین بایز، عوسمانی قادر منەوەر، شێخ مەنسوری حەفید). هەروەها هەندێکی تری وەك عەبدوڵڵا سور و مام ئاراس، ئەوەندە سارد ببوونەوە، کەهەر بەناو لەگەڵ حزبدا، مابوونەوە[٢١٩]. د. مەحمود، پاش شەش مانگ، لەسوریاوە رایگەیاند: (من دژی حزب نابم و ناشمەوێت کێشە دروست بێت و حزب لاواز بێت... من هەر ئەندامی حزبم، بەڵام لەقیادە نیم و لەدەرەوەش ئیش و کاری حزب دەکەم... پاش ئەم راگەیاندنەی، جەماعەتەکەی نائومێد بوون، زۆربەیان پێیان خۆش بوو بگەڕێنەوە ناو حزب، جگە لەمحەمەد وەتمان، سەرباز کۆیی، ئازادی حەمە گەمحان، شێخ محەمەد سەرگەڵویی، شێخ مەنسوری حەفید، کەچوونەوە ناو یەکێتی، ئەوانی تر گەڕانەوە ناو حزب)[٢٢٠].

هەر لەم بارەیەوە، خودی د. مەحمود دەڵێت: (ئەوەبوو کۆمەڵە پێشمەرگەیەك بۆ ماوەیێ جیابوونەوە و چوونە بێدەلان. هەر بەناوی حسیك قسەیان دەکرد و خۆیان بەجەماعەتی من دەزانی، کەمن لەسوریا بووم. دوای شەش مانگ، ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە. هەندێك هاتنەوە ناو حزب و هەندێکی تریش چوونەوە ناو یەکێتی)[٢٢١].

(عەزیز ئاکرەیی)یش، پاش ئەوەی کەبووە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، نارازی بوو، وەزعەکەی بەدڵ نەبوو. چووە راژان و لای پارتی مایەوە و بەیەکجاری (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)ی بەجێهێشت. (محەمەد فاتح- مامۆستا عومەر)یش تەسلیمی حکومەت بۆوە. بۆیە، مامۆستا شەریف مەولود، لەئەندامی (یەدەگ)ەوە بووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. هەروەها (حاجی حاجی برایم)یش هەر چەندە لەکۆنگرە خۆی هەڵنەبژاردبوو، بەڵام بەبڕیارێکی مەکتەبی سیاسی هێنایانە کۆمیتەی ناوەندی.

بەپێی قسەی شایەدحاڵەکان، گرنگترین گرفت و ئالۆزییەکانی ناو کۆنگرە، بریتی بوون لەساغکردنەوەی ناسنامەی حزب... بەڵێن عەبدوڵڵا، ئەوکات کادیرێکی چالاك و پێشکەوتووی حزب بوو، هەروەها لایەنگیری چەسپاندنی ئایدۆلۆژی (سۆسیالیستی زانستی) بوو، ئەو پێی وابووە (کێشەکانی کۆنگرە لەسەر ئەمانە بوون: سۆسیالیست و سۆسیالیستی زانستی، حزبی سۆسیالیست

ناسـنامەکەی چـییە و چـی بێـت، نەتـەوەیی، لیـبرال، دیمـوکرات، دیمـوکراتی شۆرشگێڕ، مارکسی...)[٢٢٢]. دەربارەی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی کۆنگرەش، هەرچـەندە بـەلای (سۆسیالیـستی زانـستی) خوازەکانـەوە، سـەرکەوتوو بـووە، بەڵام لەراستیدا کێشەکانی ناو حزبی قوڵتر کردەوە. بەرای د. مەحمود (کۆنگرە تـا رادەیـەك خـراپ نـەبوو، بـەڵام زۆر سـەرکەوتووش نـەبوو)[٢٢٣]. هـەروەها موحسین عوسمـان، کـادیری پێـشکەوتووی ئـەوکاتی حـزب، دەڵێـت: (دەتـوانم بڵێم: ئەم کۆنگرەیە، کۆنگرەی یەکەم، کۆنگرەی لـەناوبردنی حـزب بـوو. لـەناو کـۆنگرەدا دوو بـاڵی زەق دەکەوتنــە بەرچـاو، باڵێـك بەسەرپـەرشـتی رەسـوڵ مامەند، باڵەکـەی تـر بەسەرپـەرشـتی دکتـۆر مـەحمود. دەتـوانم بڵـێم کێـشەکە ململانێی نێوان کاك رەسوڵ و کاك دکتۆر بوو، دیارە دەستی لایەنـەکانی تـریش لەناو کۆنگرەدا هەبوو)[٢٢٤].

## ١- بەدیل گرتنی نەوشێروان مستەفا

گرژی و ئاڵۆزی و مۆڕە لەیەکتر کردن، هەر لەسەرەتای دەرچوونی بزوتنەوە لەیەکێتی، هەستی پێدەکرا. دواتر، رووبەڕووبوونەوەی خوێناویشی لێکەوتەوە. ئەم بارە لەنێوان دەمێک شەڕ و، دەمێک ئاشتی و شەڕ راگرتن، مایەوە. بەپەیوەندی کردنی هەرێمی (١)، بەفەرماندەیی محەمەدی حاجی مەحمود بەسۆسیالیستەوە، کەنفوزێکی زۆری لەناوچەکەدا هەبوو، هەروەها خودی خۆیشی پێشمەرگە و فەرماندەیەکی قاڵبووی خەبات و مەفرەزە سەرەتاییەکان بوو، بۆ یەکێتی، بەئاسانی ئیستیعاب نەدەکرا... لەوەشیان، ئەگەر لەچوارچێوەی ئەم سەردەم و خەباتی چەکداریدا، حسێبی بۆ بکەین، یەکێتی لەسەر هەق بوو کەپێی قبوڵ نەدەکرا، چونکە هێزی یەکێتی لەم ناوچە بەرفراوانە تەواو نابووت ببوو، بەپەیوەندی کردنی ناوبراو بە حسیك، دەبوا یەکێتی تەسلیم بەئەمری واقیع بێت و (حسیك)ی هاوپەیمانی دوێنێ و نەیاری ئەمڕۆ، وەك هێزێکی کاریگەری سەر گۆڕەپانی خەبات لەناوچەکە بناسێ و، دان بەبوونیدا بنێت... سەرەتای پەیوەندی کردنەکە، یەکێتی داوای لە (حسیك) دەکرد ئەو هەرێمە (هەرێمی یەك)، لەریزەکانی وەرنەگرێت ئەگەر هەر وەریشیان دەگرێت، ئەوا دەبێت تەواوی ئەو چەکانەی کەلای پێشمەرگە و فەرماندەی هەرێمەکە هەیە، بۆ یەکێتی بیانگەڕێنێتەوە... لەوەڵامی داواکەی یەکێتیدا، حسیك بۆیان دەنووسێت: (بەنیسبەت هەرێمی یەکی محەمەدی حاجی مەحمود، هەق نییە ئەوەندە موسر بن لەسەر ئەوە ئیلحاح بکەن، ئەو برادەرانە خۆیان قراریان داوە بێنە ناو حسیك. کاتی خۆی شەوکەتی حاجی مشیر و سلێمانی بیرێژی بەهەرێمەوە ئیلتیحاقیان بەبەڕێزتان کرد، قسەمان نەکرد)[٢٢٥].

پاش هێنان و بردن، یەکێتی هێزێکی زۆر کۆدەکاتەوە و لەناوەڕاستی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠دا، بەئاڕاستەی هەرێمی یەکی پەیوەندی کرد و بەحسیك، دەیانجوڵێنێ. لەم کاتەشدا، هێزێکی سۆسیالیست بەفەرماندەیی مەلازم تاهیری عەلی والی و قادر جەباری و شێروان شێروەندی و (١٧٠)

پێشمەرگە، دێنــە هــەمان ناوچــە و[٢٢٦] لەگــەڵ هێزەکــەی محەمــەدی حــاجی مەحمود یەکدەگرنەوە[٢٢٧]. ئەم دوو هێزە، چەند جارێك تووشـی یـەکتر دەبـن. لـەرۆژانی ٢٢-١٩٨٠/١٢/٢٣ و ٢-١٩٨١/١/٣، یـەکێتی کـەمین بـۆ هێزەکـانی حسیك دادەنێتەوە، لەئەنجامـدا، چـەندین پێـشمەرگەی سۆسیالیـستیان بـەدیل گـرت و چـەك کـرد[٢٢٨]. شـەوی پـێش گیرانـی نەوشـێروان، هێزەکـانی یـەکێتی، مەفرەزەیەکی سۆسیالیستیان لەگوندی بیوەك چەك کردبوو[٢٢٩]. یـەکێتی پێـی لەسەر ئەوە دادەگرت کە (کاك نەوشێروان بەنهێنی و بێ ئاگاداری ئێمـە هاتۆتـە خوارێ، لەگەڵ یەك پێشمەرگە گەیشتۆتە دۆڵی گەلاڵ. ئەو بۆ کاروباری تایبەتی خۆی هاتووە و کەسی ئاگادار نەکردووە)[٢٣٠].

بەقسەی یـەکێتی بێـت، نەوشـێروان تـەنها یـەك پێـشمەرگەی لەگـەڵ بـووە، کەچی هەر خودی هەمان بۆچوون، لەهـەمان سەرچـاوەدا، ئـەم بۆچـوونە رەت دەکاتــەوە کــەدەڵێت: (ئیــدی نەوشــێروان و حەمــەی حــاجی ســابیر و دوو پێـشمەرگە دابڕابـوون و چـووبوونە گونـدی قەویلـە و مـاڵی (حـاجی عـەلی)یـان کردبووە پەناگەی خۆیان)[٢٣١]. جارێ کەدەگوترێت (دابڕابـوون)، واتـە: ئەوانـە لەگـەڵ هێزێـك بووینـە، پـاش پـشێوی و رووبەڕووبوونـەوە، دابـڕاون. لەلایـەکی تریـشەوە، کەداشـبڕاون، یـەك پێـشمەرگەی لەگەڵـدا نـەبووە، بـەڵکو سـێ پێـشمەرگەی لەگەڵـدا بـووە. هـیچ مـەنتیقیش نییـە، لـەم کاتـە نـاخۆش و پـڕ لەئاڵۆزییەوە، کەچەندین جـار هـەردوو لایـەنی دژ بەیـەك لەناوچـەکەدا بەیەکدا پژاون، سەرکردەیەکی دیـار و پلـە یـەکی یـەکێتی وەك نەوشـێروان، بەتایبـەتی لـەغیابی (مـام جـەلال)دا، بەتـەنیا، یـان بەهاوڕێیـەتی یـەك دوو پێـشمەرگە، سـەردانی ناوچـەکە بکـات. ئەمـەیان، رێـی تێناچـێت. هەرچـەندە خـودی نەوشـێروان، لـەکاتی دەسـتگیرکردنی، گوتوویـەتی: (مـن بـۆ شـەڕ نـەهاتووم، بەناخێری گیانم بۆ لای دایکم هاتووم و ژن بهێنم. ئێستە ئێوە بەرم بدەن وەعد بێت لەکوردستان دانەنیشم و دەچمە دەرەوە)[٢٣٢].

نەوشێروان، پێش دەستگیر کردنـی، نامەیـەکی هەڕەشـە ئـامێز، کەمێـژووی ١٩٨١/١/١ی لەسەر بووە، بۆ تاهیری عەلی والی ناردووە. حسیك هەستی کردووە کەنامەکە لە ١٩٨١/١/٣، واتە- ئەمڕۆ- نووسراوە و نـاوبراو بـۆ چەواشـەکردنی

هێزەکەی حسیك ئەم مێژووە- ١٩٨١/١/١-ی لەسەر نووسیوە. ئەوان هەست بەوە دەکەن، نەوشێروان خۆی لەم گوندەیە و سەرپەرشتی هێزەکەی یەکێتی دەکات[٢٣٣]. ئیدی لەرۆژی ١٩٨١/١/٤دا، هێزەکەی حسیك، چواردەوری گوندی (قەویلە) دەگرن، دەچنە ماڵی حاجی عەلی و تەواوی ماڵەکە دەپشکنن... سەرەنجام، نەوشێروان و محەمەدی حاجی سابیر و دوو پێشمەرگەکە بەدیل دەگرن. لەم کاتەدا مام ئاراس سەرپەرشتی ئەم مەفرەزەی کردووە کەچوونەتە ماڵی حاجی عەلی، دەڵێت: بۆ ئیحتیرامی کاك نەوشێروان، چەکی ناکەین لەبەرچاوی خەڵك... ناوبراویش- نەوشێروان- دەڵێت: تەسلیمی کاك تاهیری عەلی والیم بکەن[٢٣٤]. چونکە ئەو دەیزانی (شەهید تاهیری عەلی والی زۆر دژی شەڕی براکوژی بووە)[٢٣٥].

محەمەدی حاجی مەحمود و تاهیری عەلی والی و مام ئاراس، زۆر لەگەڵ نەوشێروان نەرم بووینە و رێزیان لێگرتووە. پێچەوانەی ئەوان، قادر جەباری زۆر لەگەڵی توند بووە. بەڵام بەداخەوە، دوای گیرانی نەوشێروان، مەفرەزەیەکی یەکێتی لەناو شاری سلێمانی بەئارپێچی لەماڵی باوکی تاهیری عەلی والی دەدەن[٢٣٦]. هەروەها بەدیل گرتنەکەی نەوشێروانیان خستبووە ئەستۆی مام ئاراس[٢٣٧]. تاکە داوای حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان لەیەکێتی، ئەوەبوو: کەئەو (١٠-١٢) چەکەیان بداتەوە کەلەپێشمەرگەکانی (حسیك)یان گرتبوو. جگە لەمەش، بەیانێك دەربکەن و ئیدانەی هێرشەکانیان بۆ سەر حسیك بکەن و بەرەسمیش حزبی ناوبراو لەشارەزوور بناسن. ئەوکاتە یەکێتی نەرم بووە، (لەبەر گیانی نەوشێروان پرکێشی و شەڕ و پەلاماریان نەدەکرد... سۆسیالیست، نەوشێروان لەگەڵ خۆیان دەبەنە شاخی سورێن)[٢٣٨].

لەبەر هەستیاری دۆخەکە و مەترسی تەشەنەکردنی شەڕ، حزبی شیوعی دێتە ناو ململانێکە و هەوڵی ناوبژیوانی کردن دەدات. سۆسیالیست رازی دەکەن کەبەبێ مەرج نەوشێروان ئازاد بکەن[٢٣٩]. سۆسیالیست لەمەرجەکانی خۆش دەبێت و بەدەنگ داواکەی حزبی شیوعییەوە دێت. حزبی شیوعی (قادر رەشید- ئەبو شوان)، رادەسپێرێت کەنەوشێروان لەسۆسیالیست وەربگرێت و

بیباته بارەگاکەی خۆیان. هەندێك سەرچاوە دەڵێن: (پاش ئەوەی حسیك بێ قەید و شەرت دەیەوێت نەوشیروان بەر بدات، پاسەوان و سانسۆی لەسەر سووك دەکەن، پێش ئەوەی برادەرانی حزبی شیوعی بچن و نەوشیروان وەربگرن، ئەو رادەکات)[٢٤٠]. نەوشیروان و یەکێتیش، رووداوەکە بەجۆرێکی تر دەگێڕنەوە کەگوایا (ناوبراو بەئازایەتی و لێهاتوویی خۆیی و یارمەتی کاوەی شێخ لەتیف حەفید دەتوانێت رابکات و خۆی دەرباز بکات)[٢٤١]. بەڵام ئەو گێڕانەوەی نەوشیروان، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ گێڕانەوەکانی تر، یەکناگرنەوە. (قادر رەشید)، کەچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بەئەو سپێردرابوو، سۆسیالیست نەوشیروان تەسلیم بەئەو و حزبی شیوعی دەکەن. بەهەڵاتنی نەوشیروان، حزبی شیوعی بەرامبەر بەسۆسیالیست، خۆیان بەکەمتەرخەم دەزانی. قادر رەشید، بەرپەرچی قسەکانی یەکێتی و نەوشیروان دەداتەوە و دەنووسێت: (ئەو سیناریۆیەی کەنەوشیروان لەکتێبەکەیدا نووسیویەتی و باسی یارمەتی کاوەی شێخ لەتیف ئەکات دوورە لەراستییەوە)[٢٤٢]. محەمەدی حاجی مەحمودیش دەڵێت: (نەوشیروان لە ١٩٨١/٢/٦، دەچێتە لای حزبی شیوعی لەئەشکەوتی هەزار ئەستوون، هەر ئەم شەوە شیوعی مەجالی دەدەن و نەوشیروان هەڵدێ)[٢٤٣].

ئەم رووداوە زۆری لەسەر نووسراوە و لەزۆربەی یاداشتەکاندا، باسکراوە. بۆ زیاتر شارەزابوون، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر یاداشتەکانی ئەحمەد بانیخێڵانی و هەرسێ بەرگەکەی فاتح رەسوڵ و محەمەدی حاجی مەحمود و سەید کاکە و قادر رەشید و نەوشیروان مستەفا و بەهادین نوری و...تاد.

هەرچەندە پێش ئەم رووداوە، شەڕی یەکێتی و سۆسیالیست هەر لەساڵی ١٩٧٩، کاتی جیابوونەوە، دەستی پێکردبوو، بەڵام دوای گیرانی نەوشیروان، رەهەندێکی تری وەرگرت و توندوتیژی و خوێن رشتنی زۆرتری لێکەوتەوە. لەهاوین و پایزی ساڵی ١٩٨١دا، تەواوی ناوچەکانی سلێمانی و دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی گرتەوە. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی قەندیل لەئابی ١٩٨٣دا، شەڕەکان بەرەو کەمبوونەوە، رۆیشتن.

## ٢- خوێن ڕژان لەنێو دەعوەت و دەعوەتکاریدا

جەمالی عەلی باپیر، ئەندامێکی دیاری کۆمەڵە و فەرماندەیەکی عەسکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، لەهەمان کاتدا، فەرماندەی هەرێمی چواری یەکێتی بوو. شێرکۆ شێخ عەلی، لەسەرەتاوە قیادە موەقەتە بووە، پاشان ریزەکانی ئەوانی جێهێشتووە و پەیوەندی بە (بزوتنەوە)وە کردووە. لەکۆنگرەی یەکەمی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرپرسی لقی سلێمانی. ناوبراو یەکێك بووە لەلایەنگرانی باڵی رەسوڵ مامەند، لەکۆنگرەدا، پێداگیری لەسەر چەسپاندنی ئایدۆلۆژی سۆسیالیستی زانستی کردووە. جگە لەوەش، فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی حسك بووە لەناوچەکانی سلێمانی.

دوای زێتر بوونی گرژی و ئاڵۆزییەکانی نێوان (حسك و ینك)، ئەو لەهەوڵی چارەسەرکردنیدا بووە. شێرکۆ، سەرەڕای جیاوازی بیروڕا و کارکردن لەدوو حزب و رێکخراوی جیادا، دۆستایەتیەکی پتەوی لەگەڵ جەمالی عەلی باپیر هەبووە... لەسایەی شێرکۆ و محەمەدی حاجی مەحمود، هێزی حسك لەناوچەکەدا گەشەی کردبوو. کێشەکانیش، ناوە ناوە سەریانهەڵدەدایەوە. لەپێناوی چارەسەرکردن و بنبڕکردنیان (ماوەیەك بوو نامە و نامەکاری لەنێوان شێرکۆ شێخ عەلی و جەمالی عەلی باپیر دەهات و دەچوو، خەریکی ئەوە بوون پەیوەندی دووقۆڵی نێوان پێشمەرگەکانی حسك و ینك لەناوچەی سورداش و شاربازێڕ پتەو بکەن، دۆستایەتی و سەر لەیەکتردانی گەرم و گوڕ لەنێوانیاندا هەبێت)[٢٤٤].

جەمالی عەلی باپیر، نامەیەك بۆ شێرکۆ دەنووسێت و دەڵێت: نیوەڕۆی ١٩٨١/٨/٢٣، بەچل پێشمەرگەوە میوانی تۆین... ئەویش وەڵامی دەداتەوە و بۆی دەنووسێت: بەخێر بێن، حەز دەکەن با سەد کەس بن... هەرێمەکەی جەمال بەردەوام پێشمەرگەی کەم بووە، بەڵام ناوبراو ١٢٠ کەس کۆدەکاتەوە و دەچێتە سەردانی شێرکۆ. (شێرکۆ)ش دوو حەیوانیان بۆ سەردەبڕێت... شێرزادی برای شێرکۆ، لەزۆری پێشمەرگە میوانەکان، دەکەوێتە گومانەوە و بەشێرکۆ دەڵێت: ئەوانە بەناوی میوانداریی‌یەوە هاتوون، دەمانکوژن[٢٤٥]. دوای بەخێرهێنان و رێزگرتن و نان خواردن، باسی کێشەکانی نێوانیان دەکەن.

جـەمال بەشـێرکۆ دەڵێـت: بـا پیاسـەیەك بکـەین. دەچـنە دەرەوە و بـەدەم پیاسـەکردنەوە دەکەونـە مناقەشـەوە. لـەپڕ لـەگفتوگۆی ئاسـاییەوە دەبێتـە تورەبـــوون و دەنـــگ هـــەڵبڕین... بـــەگوێرەی گێڕانـــەوەی پێـــشمەرگە دەربازبووەکانی سۆسیالیست و هەندێك لەکادیرانی بـەناوبانگی ئـەو سـەردەمی کۆمەڵە، گوایا (جـەمال بەشـێرکۆ دەڵێـت: دەمانـچەکەت دانـێ... پـاش هـێن و منهێن، جەمال جوێن دەدات و تەقە لەشێرکۆ دەکات و دەیکوژێت... شـێرزادی بـرای شـێرکۆش لـەدوورەوە تەقـە دەکـات و جـەمال دەکوژێـت)[٢٤٦]. دوو سەرچاوەی سەر بەحزبی شیوعیش کـەتا ئەوکاتـە، سـەرەڕای بـوونی کێـشەی بچووك پەیوەندی باشیان لەگـەڵ یـەکێتی هـەبووە، دەنووسـن: (جـەمال عـەلی باپیر بەنیاز و پیلانی کوشتن سەردانی شـێرکۆ دەکـات و ئـەو دەست پێـشخەر بووە لەم رووداوە)[٢٤٧] و (بەشێوەیەکی یـەکجار نـاڕەوا و نامرۆڤانـە دەکەوێتـە گیانی شێرکۆ و ئەیکوژێت. بەرێکەوت برایـەکی شـێرکۆ لـەدوورەوە چـاوی لـەم شـانۆگەرییە و کارەسـاتە دەبێـت، نایکـات بەنامـەردی و یەکـسەر جـەمال دەکوژێتەوە)[٢٤٨].

دوای ئـەم رووداوە و دەنگدانـەوەی لەناوچـەکە، (حـسك ئـەیانوت: جـەمال بەفیتی مەلا بەختیار بەناوی میوانیەوە چووە بـۆ سـەردانی شـێرکۆ بـۆ ئـەوەی لەپەنای دۆستایەتیدا بـەفێڵ بیکـوژێ... مـەلا بـەختیار ئەمـەی ئینکـار ئـەکرد، ئەیوت: جەمال چووە بۆ سـەردانی شـێرکۆ بـۆ ئـەوەی کێـشەی نێـوان حـسك و یەکێتی بەلادا بخەن و، لەوێ بووە بەشەڕیان و ئەو کارەساتە قەوماوە)[٢٤٩].

تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هەر لایەنە و لایەنی بەرامبەر بەخەتابار و دەست درێژکـەر دەزانێـت.. لـەم شـەڕ و کارەسـاتە پـڕ لەناسـۆرەدا، ٢٦ پێـشمەرگەی کوردستان بوونـە قوربـانی[٢٥٠]، کەحـەوت پێـشمەرگەی سۆسیالیـست و حـەوت پێشمەرگەی یەکێتی، گیانیان سپارد.

بۆچـوونەکەی کەسـایەتی دیـاری کۆمەڵـە، پـشکۆ نەجمـەدین، بـۆ راسـتی و دروستی و یەکلاکردنەوەی کێشەکە، دەبێتـە پارسـەنگێکی گـران، بـۆ دروسـتی بۆچـوونەکەی حـسك و شـیوعی. پـشکۆ دەنووسـێت: (... هێزەکـەی حـسك لەناوچەکە گەشـەی کردبـوو.. گرتنـی نەوشـێروان، هـەم بـۆ کۆمەڵـە و هـەم بـۆ

یـەکێتی و هـەمیش بـۆ خـودی نەوشـێروانیش سـووکایەتیەکی گـەورە بـوو... سـەرکردایەتی یـەکێتی هەمیـشە سـەرکۆنەی جـەمالیان دەکـرد کـە لـەئۆدەی شێرکۆ نایەت، ناتوانێ فشاری لەسەر دابنێت. هێزەکانی حسکی پێ لەمەنگەنـە نادرێت.. جەمال لەژێر تەرزەی گلەیی و گازاندە و رەخنەدا، بـەخۆدا هاتـەوە و تێگەیشت کەلەگۆمی خوێناوی سیاسەتی کوردیدا، ماسـی دۆسـتایەتی ناتوانـێ زۆر بـژی و ئـەوی ناشـێ و نایـەوێ بیکـات، دەبـێ بیکـات...)[٢٥١]. هـەروەها دەربارەی راستی قسە و بۆچوونەکانی حسك، ناوبراو دەنووسێت: (رووداوەکـە سەد ساڵ نییە رووی دابێت، هەتا تەفسیری جۆراوجۆر هـەڵبگرێت و بەشـدارانی شـەڕەکەش زۆریـان شـاهیدی زینـدوون و بۆچـوونەکەی حـسك دەسـەلمێنن و نووسەری پەنجەکانیش- مەبەست لەنەوشێروانە-، لەهـەموو کـەس دڵنیـاترە و ناشێ کەسێکی سەر راستی لەشەڕەکەدا بەشداربووی نزیك بـەخۆی، هەقیقـەتی مەسەلەکەی بۆ باس نەکردبێت)[٢٥٢].

دوای ئەم رووداوە، هێزێکی زۆری حسك لەدەشتی هەولێر و حەوزی رواندز و ناوچـەی خۆشـناوەتی و کۆیـە، بـۆ تۆڵەکردنـەوە، بـەرەو ناوچـەی رووداوەکـە کەوتنەڕێ.لـەم جەولـە و کێومـاڵ کردنـەدا، دەیـان رووداو و شـەڕ و کارەسـاتی خوێناوی تری لێکەوتەوە. ئیدی، (شەڕەکە زۆر فراوانتر بوو)[٢٥٤].

## ٣- شەهید کردنی مام ئاراس

یاسین کەریم، ناسراو بە (مام ئاراس)، خەڵکی گـەڕەکی (چـوارباخ)ی شـاری سـلێمانی بـوو.. ئـەو منـداڵ بـووە، بـاوکی کۆچـی دوایـی کـردووە. بەهـەتیوی، بێبەش لەسۆزی باوك گەورە بووە. چۆتە قوتابخانە، بەڵام نەیتوانیوە خوێنـدن تـەواو بکـات. لـەکۆتایی سـاڵی (١٩٧٩)دا، پەیوەنـدی بـەهێزەکانی پێـشمەرگە کردووە. بۆتە فەرماندەی کەرت، دواتر بۆتە جێگری فەرماندەی هـەرێمی سـێی حزبی سۆسیالیستی کوردستان. لەپاش کۆنگرە، یەکێك بووە لەلایەنگرانی باڵی دکتـۆر مـەحمود. زۆر خـۆی لەشـەڕی نـاوخۆ پاراسـتووە. بـاوەڕی نـەدەکرد کەرۆژێك لـەرۆژان لەشـەڕی نـاوخۆدا گیـان لەدەسـت بـدات. هەڵبەتـە، ئـازایی و دڵسۆزی و لێوەشاوەیی، ئەوی گەیاندبووە جێگری فەرماندەی هەرێم.

لەشـەڕی نـاوخۆ و لەلایـەن هێـزی دژبـەرەوە، ناوبراویـان بـەدیوێکی تـر، دەخوێندەوە. یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەرادیۆ و لەسـەر زاری لێپرسـراوە بـالاّ دەسـتەکانیانەوە، نموونـەی نەوشـێروان مـستەفا، هـەموو دەم، (مـام ئاراس)یان بەمرۆڤێکی فاشیل و هەتیوچە و سەرۆکی بانـدی چەقۆکێشەکانی سـلێمانی، لەقەڵـەم دەدا.. هەڵبـەت، ئـەم وەسـف کردنـە دوور لەراسـتی و ناشایستەیە، بۆ ئەوێ ڕۆژان، دیاردەیەکی ئاسایی و باو بـوو، چـونکە ئـەوکات: ئەم جۆرە ناو و نـاتۆرە خـستنە پـاڵ یەکترییـەوە، هـەموو ئاقـارێکی ئـەخلاقی بەزاند بوو.

مـام ئـاراس، ئـەو کاتـەی کەفەرمانـدەی کـەرت بـووە، بـەخۆیی و بیـست پێـشمەرگەوە کەیـەکێك لەپێـشمەرگەکانی نـاوی (ئاسـۆی قـومری) بـووە، لەناوچەکەدا سوڕاونەتەوە. ئاسۆ، لەلایـەن یەکێتییـەوە، بـەوە تاوانبـار کرابـوو کـەگوایا سـیخوڕ و بـەکرێگیراوی ڕژێمـە و بـەپیلان هـاتووە تـاوەکو دەسـت بوەشێنێت و بگەڕێتەوە ناو ڕژێم. مـام ئـاراس و مەفرەزەکـەی دەکەونـە داوی هێزەکانی یەکێتیەوە و چەك دەکرێن. پشکۆ نەجمەدین، کەخۆی شایەدحاڵێکی زینـدووی ئـەم ڕووداوە بـووە و وەك کـادیرێکی سیاسـی لەگـەڵ مەفرەزەکـەی یەکێتیدا بووە، ڕووداوەکە بەم شێوەیە دەگێڕێتـەوە: (ئێمـە لەگونـدی پـارەزان بـووین، هـەواڵی کـەرتێکی سۆسیالیـستمان وەرگـرت کەئاسـۆی قـومری یـان لەگەڵدایە و لەگوندێکی دەوروبەری چوارتان. من زۆربەی کات، لەگەڵ وەهـاب و کەرتەکەیـدا دەگـەڕام و هەڵـسوکەوتم دەکـرد. وەهـاب ئەگەرچـی بـەکادرێکی عەسکەری توند و بەزەبر ناوی ڕۆیشتبوو، دیسانیش پیاوێکی ئازا، بزێو، وریا و ڕەوشت بەرز بوو. وەهاب گوتی: دەڕۆیـن و چـەکیان دەکـەین، ئاسـۆی قـومری سەر بەموخابەراتە و بەپێی هەواڵی ڕێکخستنەکانی ناو شار، دەوڵەت بۆ دەست وەشـاندن و ئـاژاوەی نـاردووە... دۆڵ بـەدۆڵ و شـاخ بەشـاخ، وەڕێ کـەوتین و نیوەشەو گەیشتینە گوندی تایەن. لەنێو گونددا دابـەش بـووین، پـشوومان دا و شیومان خوارد، پێخەفمان هەڵگرت بـۆ مـاڵی خـودا. لـەو ڕۆژگارانـەدا، زۆربـەی کارەسـاتەکان لەمزگەوتـدا دەقـەومان. سۆسیالیـست پـێش ئێمـە لەمزگەوتـدا جێگایان گرتبوو. سڵاومان کـرد و پێمـان گـوتن: ئەمـشەو دەمانـەوێت پێکـەوە

بخەوین و هەندەك قسە و باسیش لەسەر چۆنیەتی رێکخستنی کاروبارەکانمان بکەین. ئێمە پلانی خۆمان دانابوو. ئەوان نزیکەی بیست چەکدار و ئێمەش بەژمارە هەر هێندە دەبووین. مام ئاراس و عەبدوڵڵا هەمزە لێپرسراویان بوون. وەهاب و من، مام ئاراسمان خستە نێوانی خۆمان و پێشمەرگەکانی دیکەش، هەر کەسەو کاری خۆی پێ سپێردرا بوو. پاش کەمێك گفتوگۆ و قسە و باس، ئیدی پەرلەی (یا ئەڵڵا)، بوویە دەستپێکی پەلامار و زۆرانبازی. ئەو پێشمەرگانەی پێش چەند چرکەیەك پێکەوە قسەیان دەکرد و بەیەکتر بینین گەشاو بوون، ژیانیان کەوتنە سەر پەلەپیتکەی چەکی یەکتر. کارەکە زۆری نەخایاند و تەقەی تێدا نەکرا و خوێنی تێدا نەرژا. هەموویانمان چەك کرد و دەستی ئاسۆمان لەپشتەوە شەتەك دا. لەجێدا جگە لەئاسۆی قومری و نوورە کووپە، ئەوانی دیکەمان ئازاد کردن. هەر ئەو شەوە بەرەو شارباژێڕ و پاشان (بلەکێ)ی ئەودیوی بناری سوورکێو، بەدیل و دەستکەوتەوە رۆیشتین. لەبلەکێ، پاش چەند رۆژێك، بەفەرمانی سەرکردایەتی یەکێتی، چەکەکان بۆ سۆسیالیست گەڕێندرانەوە. ئاسۆی قومری کەهیچ گومانێك لەوەدا نەبوو باوەڕپێکراوی موخابەراتە، ئەویش ئازاد کرا و لەگوڵ کالتری پێ نەگوترا!، یەکسەر گەڕایەوە شار و وەکو درندەترین فەرماندەی جاش، بوویە بکوژی دەیان پێشمەرگە و خەڵکی بێ گوناه. دەیانگوت: ئەو رۆژەی مام ئاراس و مەفرەزەکەی بێچەك دەگەڕێنەوە بارەگاکەیان لەبلەکێ، هەردوو رەحمەتی عوسمانی قادر منەوەر و مام هێرش- یەکەمیان لێپرسراوی سۆسیالیست و دووەمیان لێپرسراوی یەکێتی، ئیسماعیل-، سەرگەرمی گفتوگۆ و مشتومڕ دەبن و باس لەهۆکاری کێشە و گرفتەکانی نێوان یەکێتی و سۆسیالیست دەکەن. عوسمان دەڵێت: یەکێتی پاوانخواز و شەڕفرۆشە و هیچ گروپ و لایەنێکی پێ قەبووڵ ناکرێت و شەڕ لەگەڵ ئاسمانیشدا دەکات. مام هێرش دەبێژێت: وانییە و ئێوە خۆتان پۆخڵەواتن و هێزەکانتان پڕن لەکەسانی گومانلێکراو و راو و رووتکەر.. دەنگە دەنگی ئەمان تا دێت هەڵدەکشێت و لەپڕ مام ئاراس و کۆمەڵەکەی خۆیان بەژووردا دەکەن و... عوسمان دەڵێت: ئەوە چییە؟ ئەی چەکەکانتان کوان؟ ئاراس دەڵێت: وەهاب چەکی کردین! عوسمان

قوشقی دەبێت و دەڵێت: ئەمەش خەتای ئێمەیە هەی مام.....!)[٢٥٤].

دوای قـــەومانی ئـــەم رووداوە، دانوســـتاندن دەکەوێتـــە نێـــوان یـــەکێتی و سۆسیالیست و کێشەکە بەلادا دەخرێت، بـەڵام ئـەمجارەیان سۆسیالیـستەکان زێتر ئاگاداری خۆیان دەبن. بۆیە پاش ئەم رووداوە: زۆربەی فەرماندەی کـەرت و مەفرەزەکان، وایان پێ باش بووە بەمـەفرەزەی بـچووك بـچووکەوە نەگـەڕێن تاوەکو زیـانی گـەورەیان لەلایـەن یەکێتییـەوە بەرنەکـەوێت. بۆیـە فەرمانـدەی کەرت و مەفرەزەکانی سۆسیالیست (جەبار عەلی حەوێز، عوسمان قادر منەوەر، نەجمەین، مەحمود حەمە قادر، مام ئاراس، کەمال عـەلی حـەوێز)، نامەیـەك بـۆ محەمـەدی حـاجی مـەحمود دەنێـرن و پێشنیارەکەی خۆیانیـان دەخەنـەڕوو و داوای وەڵامی بەپەلەی لێدەکەن[٢٥٥].

لەخوێندنەوەی ئەم رووداوەدا، دەگەینە ئەم ئەنجامـە کـەهێزەکانی یـەکێتی بۆ جێ بەجێ کردنی ئـەم پیلانـەیان، بەنەخـشەی پـێش وەخـت، دۆڵ بـەدۆڵ و شاخ بەشاخ دەڕۆن... مام ئاراس و هێزەکەیشی بەدڵێکی سـافەوە، پێشوازیان لێدەکـەن. گـەر وانەبوایـە چـۆن رازی دەبـوو لـەنێوان دوو لێپرسـراوی یـەکێتی لەمزگەوتدا بخـەوێت؟! هـەروەها یـەکێتی وشـەی نهێنیـان هـەبووە بـۆ دەست کردن بەئەنجامدانی پیلانەکەیان، چونکە هەر کەوشـەی (یـا ئـەڵڵا)، دەبیـستن، پەلاماریان دەدەن..

دوای ئەم تێـك هەڵچوونە، سۆسیالیـستەکان، هەرچـەندە لەجەولـە کـردن و گەڕان و سوڕان لەناوچەکە، کەمێك بەحەزەرتر دەبن. جارێکی تر، مام ئاراس و هەڤاڵەکانی لەگوندی (سۆیلەمش)ی ناوچەی شـاربازێڕ، لـەرۆژی ١٩٨١/١٠/٧دا، جارێکی تر دەکەونە کەمینی یەکێتی، کەفەرماندەکەیان شەوکەتی حاجی مشیر بووە و هەموو مەفرەزەکەی مام ئاراس چەك دەکـەن. پـاش ترسـاندن و گوللـە تەقانـدن بەسـەریاندا، لەیەکـەم رۆژی جـەژنی قوربـان لـەرۆژی ١٩٨١/١٠/٨دا، بەبەرچاوی خەڵکەوە، هەموویان گوللەباران دەکەن کەبریتی بوون لە:

١- یاسین کەریم (مام ئاراس).

٢- محەمەد عەزیز ناسراو بە (هێمن).

٣- خالید حاجی کەریم بێکراس.

٤- لەتیف عومەر ساڵح.
٥- بارزان عوسمان- خەڵکی گوندی خرابە.
٦- وەستا عومەر.
٧- فارس.

خەڵکی ناوچەکە، تەرمی پێشمەرگەکان لەگوندی (حاصل)، دەنێژن[٢٥٦].

مام ئاراس، یەك هەفتە پێش شەهید بوونی، لەرۆژی ١٩٨١/١٠/١دا، نامەیەك بۆ ژنە پێشمەرگە (تامین خان)ی هاوسەری محەمەدی حاجی مەحمود دەنووسێت و لەسەر بەردەوام بوون لەخەباتکردن هانی دەدات و دەستخۆشیشی لێدەکات[٢٥٧].

ئەم رووداوە قێزەونە، دەنگدانەوەیەکی فراوانی لەناوچەکەدا هەبوو... برینەکانی قوڵتر و، کێرڤی شەڕی ناوخۆشی بەرزتر کرد. خەڵکی ناوچەکە و ئەندام و لایەنگر و هەوادارانی سۆسیالیست، چەندین منداڵیان بەناوی (ئاراس)ەوە ناودێر کرد.

## ٤- دەبوو عەولا سوور لەسەر چیای حەمرین شەهید بێت، نەك لەدۆڵە رەقە

بەپێی زۆربەی گێڕانەوەکان، بەدۆست و نەیارەوە، هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە: عەبدوڵلا سوور، یان (عەولا سۆر)، پێشمەرگە و فەرماندەیەکی ئازا و چاونەترس و دوژمن بەزێن بووە، دۆست و دوژمن، حسێبی وردی بۆ کردووە. خۆشەویستی جەماوەری ناوچەکە بووە. شێوەی شەهیدکردنەکەی هەڵەیەکی گەورە بووە، ئەم رووداوەی کەرویدا، نەدەبوو روویبدابوایە... نامانەوێت بیروبۆچوونی دۆست و کەسوکار و لایەنگر و ئەندامانی حزبەکەی ئەو، دەور بکەینەوە. تەنها بۆ مێژوو ئەم بۆچوونانە دەنووسین، کەچەند تێکۆشەرێکی سەردەمی رۆژە سەختەکان، کەلەقۆناغێکدا هاوخەباتی ناوبراو بووینە، دەریانبڕیوە. ئەو تێکۆشەرانە خاوەن رابردووی پاك و پڕ لەشانازین، نەك هەر بۆ خودی یەکێتی، بەڵکو بۆ تەواوی خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەکەمان.

دوو لەم تێکۆشەرانە، لەدنیای ئێمەدا نەماون، هەردووکیان، لەهەموو قۆناغەکاندا، دژی شەڕی خۆخۆری بووینە.

(ڕێبان)، چەندە دژی شەڕی براکوژی بوو، مخابن لەشەڕی براکوژیشدا، گیانی سپارد. شاخەوان عەباس، چەندە دژی توندوتیژی و شەڕی ناوخۆ بووو، بەدەستی تیرۆریستان گیانی سپارد. (پشکۆ نەجمەدین)یش تێکۆشەرێکی رۆژە سەختەکانە و بەنووسین و هەڵوێست و بۆچوونە پڕ لەجەسارەتەکانی، دنیایەك کەلەبەری تاریکی مێژووی رۆژە سەختەکانی بۆ نەتەوەکەی رۆشنکردۆتەوە.

لەبارەی عەولا سوور و چۆنیەتی ناسینی، شاخەوان عەباس دەنووسێت: (... رۆژی ۱۹۷۹/۳/۲۰، گەیشتینە پیرانەڕەش. پێش ئێمە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی لێبوو کەعەولا سوور فەرماندەیان بوو، تازە چالاکییەکیان لەسەر جادەی سەنگەسەر ئەنجامدابوو، دەستکەوتیشیان هەبوو، خۆمان بەیەکتر ناسان، زۆر دڵمان پێیان خۆش بوو، عەولا سوور بەپیاوێکی بەهیمەت و ئازا هاتە بەرچاوم)[۲٥٨].

دەربارەی گەیشتنی هەواڵی شەهید بوونی عەولا سوور و دڵگرانبوونیان، ڕێباز دەنووسێت: (شەو بوو، هەموومان لەگوندی گۆمەشین خەوتبووین، لەپڕ هەندێ قاچاخچی هاتن هەواڵی شەهید بوونی عەولا سووریان راگەیاند، زۆر خەفەتبار بووم، چونکە دەمزانی چەند ئەندامێکی بەکەڵك بوو بۆ میللەتەکەمان. دەمزانی شەهید بوونی عەولا سوور چەند بۆشایی لەدۆڵی ئاکۆیان دروست دەکات، دەمزانی جووتیارەکانی ئاکۆ و پشدەر چەند عەولا سووریان خۆشدەوێ، دەمزانی خەڵکی سماقوڵی چەند عەولا سوور بەقارەمان دەزانن... بەڵێ دەمزانی حکومەتی عێراق چەند رقی لەعەولا سوورە. شەڕی سماقوڵی ساڵی ۱۹۷۹ کەزیاتر لەحەفتا لاشەی قوات خاسە بەجێمابوو، زۆر هونەری ئەو پیاوە چاونەترسە بوو. دەشمزانی تازە عەولا سوور رۆیشت و ناگەڕێتەوە)[۲٥۹].

(پشکۆ نەجمەدین)یش، کەلەم کاتەدا کادیرێکی دیار و چالاکی کۆمەڵە بوو، لەگەڵ حزبەکەی عەولا سوور، دانویان پێکەوە نەکوڵاوە، دەنووسێت: (عەبدوڵلا سوور، جوتیارێکی ئازا و فەرماندەیەکی لێهاتووی حسك بوو. ئەو جگە لەوەی وەکو ئەندامی حزبەکەی نەیارێکی سەرسەختی یەکێتی بوو، دوژمنی ئەو

ئاغایانەی ناوچەکەش بوو کەچەکداری یەکێتی بوون و یەکێتی لەکێشەی نێوان جوتیار و ئاغاکاندا پشتی دەگرتن)[٢٦٠]. هەروەها پاش روودانی کارەساتەکەش، نەوشێروان مستەفا بۆ مێژوو دەنووسێت: (.... وەکو ئەیانوت: شاخەوانێکی زۆر وریا و، تفەنگچییەکی دەستڕاست و پێشمەرگەیەکی ئازا بوو... لەناخی دڵمەوە پێم ناخۆش بوو بکوژرێ... بێگومان عەولا سوور، وەکو هەموو شەهیدەکانی کەی شەڕی ناوخۆ، قوربانیەکی بێ گوناه بوو)[٢٦١].

عەبدوڵلا سوور، فەرماندەی هەرێمی چواردەی (ئاکۆ)ی حزبی سۆسیالیست بوو. خەڵکی ناوچەکە بوو، لەیەکەم کۆنگرەی (حسك)، لایەنگیری د. مەحمود بوو. کەدکتۆر و جەماعەتەکەی لەپاش کۆنگرە، ماوەیەك جیابوونەوە، (عەولا سوور)یش زۆر لەحزب سارد ببۆوە، وەك دەڵێن: هەر بەناو لەگەڵ حزب مابۆوە. زۆر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی حزب و سەرووی خۆی جێ بەجێ نەکردووە. ئەوکاتەی کەسۆسیالیست لەگەرمەی شەڕی ناوخۆدا بووە لەگەڵ یەکێتی، ئەو شەڕی یەکێتی نەکردووە. بەقسەی (موحسین باین)، کەئەوکاتە جێگر، یان یاریدەدەری ناوبراو بووە، نەوشێروان مستەفا لەرێکەوتی ١٥/٩/١٩٨١دا، کاغەزی بۆ عەبدوڵلا سوور نووسیوە و گوتوویەتی: ئێمە شەڕی حزبی سۆسیالیست ناکەین، شەڕی سەید کاکە دەکەین. ئەویش گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کەشەڕەکان خەتای سەید کاکەیە. لەبارەگای سەرکردایەتی حزب، رەسوڵ مامەند بەسەید کاکەی گوتووە: زانیاریمان بۆ هاتووە کەیەکێتی لەگەڵ سواراغا پێك هاتوون کەوا یەکێتی عەبدوڵلا سووری بۆ بکوژن، سواراغاش شەڕی هەموو لایەنەکانیان– جود– بۆ بکات... ئەوکاتە، سواراغا لەریزەکانی یەکێتیدا بوو، (هەمزاغا و ئاکۆ ئاغا)ش کەکەس و کاری نزیکی ناوبراو بوون، چەکداری رژێم بوون. لەبەرئەوەی عەبدوڵلا سوور گوێی بەبڕیارەکانی حزب نەدەدا، دەنگۆی ئەوە هەبووە کەلەلایەن یەکێتییەوە پارەشی وەرگرتووە، چونکە ئەو، لایەنگیری د. مەحمود بووە و دکتۆر مەحمودیش دەگەڕێتەوە لای مام جەلال. (پێویستە ئەوەش بوترێ پاش شکانی حزبی سۆسیالیست لەشەڕی هەورێ، شەهید عەولا سوور کەخۆی حەزی لەشەڕی براکوژی نەدەکرد، داوای لەکاك سەید کاکە کرد کەبگەڕێتەوە سەرکردایەتی، عەبدوڵلا سوور سەید کاکەی

بەسەلامەتی گەیاندەوە سەرکردایەتی)[٢٦٢]. ئەوکاتە، دەنگۆی ئەوە هەبووە کەسەید کاکە هۆکاری هەڵگیرساندنی شەڕەکانە و، لەگەڵ یەکێتیدا، توندوتیژە. ئەویش، بۆیە، ویستوویەتی سەید کاکە دووربخاتەوە، تاوەکو چیتر خوێنی کورد بەدەستی کورد نەڕژێت. گوایا یەکێتی لەناو هێز و لایەنگرانی خۆیان، وایان بڵاوکردۆتەوە کەدەبێت عەبدوڵڵا سوور بکوژین، ئەویش لەبەر دوو هۆکار: یەکەم: سەید کاکەی رزگار کردووە. دووەم: یەکێتی بەڵێنی بەسواراغا داوە کەناوبراوی بۆ لەناو ببەن، چونکە دوژمنێکی سەرسەختی ئاغاکانی ناوچەکە بووە. ئەوکاتە سواراغا بەهەموو هێز و توانایەوە شەڕی (جود)یان بۆ دەکات. کەعەولا سوور، سەید کاکە دەگەیەنێتە سەرکردایەتی حزب، رەسوڵ مامەند پێی دەڵێت: تکایە مەگەڕێوە دۆڵە رەقە، چونکە زانیاریمان هەیە، یەکێتی پلانی کوشتنی تۆیان دارشتووە... هەندێك لەو پێشمەرگانەی کەلەگەڵ ناوبراودا بوون، خزمی سواراغا بووینە و پەیوەندییان لەگەڵیدا هەبووە... ناوبراو، ئەوەندە لەسەرکردایەتی نامێنێتەوە و لەرۆژی ١٩٨١/١١/١٠دا، دەگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی. یەکێتی کەمینی بۆ دادەنێتەوە. پاش شەڕێکی خوێناوی، لەکەمینەکەدا دەربازی دەبێت و هەشت پێشمەرگەی یەکێتی بەدیل دەگرێت، پاشان بەچەکەوە بەرەڵلایان دەکات و پێیان دەڵێت: من شەڕی براکوژی ناکەم و لەگەڵ یەکێتی دۆستم... لەگەڵ مەفرەزەکەی دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی لەدۆڵە رەقە... سواراغا هەواڵ بۆ یەکێتی و خودی نەوشیروان دەنێرێت کەعەبدوڵلا سوور لەماڵی خۆیەتی. نەوشیروان کەسەرپەرشتی هێزەکەی کردووە، بەخۆیی و شەش سەد (٦٠٠) کەس کەجەماعەتی سواراغاشی لەگەڵدا بووە، رۆژی ١٩٨١/١١/١٧، چواردەوری ماڵی عەولا سوور دەگرن. پاش رووبەڕووبوونەوە و شەڕکردن، چوار پێشمەرگە لەمەفرەزەکەی عەبدوڵلا سوور شەهید دەبن... کەدەزانن دەرهەقی ئەم هێزە زۆرەی یەکێتی نایەن و فیشەکیشیان نەماوە، لەگەڵ یەکێتی دا دەکەونە وتووێژ... هێزەکە، بەڵێنی ئەوەی پێدەدەن کەئەگەر تەسلیمیان بێت، لەسەر شەرەفی مام جەلال نایکوژن. ناوبراو تەسلیم دەبێت، بەلام کۆمەڵێك لەنەیارەکانی لەگەڵ نەوشیروان دەبن و سەرکۆنەی دەکەن، کەبەهەر شێوەیەك بێت، دەبێت

عەبدوڵڵا سوور بکوژرێت. ئەویش دەچێتە ژێر باری داواکەیان و بەدیلی، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر گوللەباران دەکرێن. پاشان، ماڵەکەشی تاڵان دەکەن. ئەم پێشمەرگانەی کەلەگەڵ عەبدوڵڵا سوور گیانیان سپارد، بریتی بوون لە: (رەسوڵ کاکە ئەحمەد- خەڵکی گوندی ئێندزێ، مستەفا محەمەد- خەڵکی گوندی کەلێتە، سەید خدر، سەید عارف، خەڵکی رانیە. رەزا ئەحمەد- خەڵکی گوندی سۆفی برایمی ناوچەی مەنتکایەتی، سەید جەلال- خەڵکی دیبەگە)(٢٦٣).

لەم کاتەدا، لایەنەکانی جود خەریکی کۆبوونەوە و پلان دانان بووینە بۆ چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەی هێزە زۆرەکەی یەکێتی لەناوچەکەدا. ئەحمەد بانیخێڵانی، ئەندامی مەکتەب سیاسی حزبی شیوعی، دەنووسێت: (... ئێمە هێشتا لەکۆبوونەوەکەمان نەبووبووینەوە، بروسکەیەك گەیشت، کەلەناوچەی کۆمتان شەڕێك لەنێوان پێشمەرگەکانی یەکێتی و مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی سۆسیالیست بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵا سوور، روویداوە و یەك دوو پێشمەرگەیەکیش بریندار و شەهید بووینە. نەوشیروان بەهێزێکی گەورەوە چۆتە سەر مەفرەزەیەکی سۆسیالیست لەگوندی ماخۆبزنان، دوای شەڕێکی زۆر عەبدوڵڵا ناچار بووە خۆی تەسلیم بەنەوشێروان کردووە، بەڵام نەوشێروان بەدەستی خۆی عەبدوڵڵای کوشتووە)(٢٦٤).

نەوشێروان کەخودی خۆی بەشدار بووە لەشەڕەکە و سەرپەرشتی هێزەکەی یەکێتی کردووە، شاهیدحاڵێکی تری رووداوەکانە. ناوبراو، بەکورتی باسی رووداوەکەی کردووە. دڵگرانی و ناڕەحەت بوونی خۆیشی بەلەدەست چوونی عەبدوڵڵا سوور و قوربانیەکانی تر، دەربڕیوە. ناوبراو دەنووسێت:

- شەو گەیشتینە پڵێنگان. چووینە ماڵی مەلا عوسمان... هێشتا نەحەسابوینەوە هەواڵیان بۆ هێنام کەئەمرۆ عەبدوڵڵا سوور سەری سوار ئاغا و هەندێ لەفەرماندەی کەرتەکانی هەرێمەکەی دابوو، پێی وت بوون کە: (هێزێکی گەورەی جود لەو رۆژانەدا دێنە خوارێ بۆ دەرکردنی یەکێتی لەناوچەکە، ئەم، چونکە خۆی بەخزمیان ئەزانی لەپێشەوە هاتووە پێیان بڵێ... ترسی ئەوەم هەبوو پێش وەخت و پێش کۆبوونەوەی هێزەکانی یەکێتی، دەستکێشی هێزەکانی جود بکا بۆ ناوچەکە... هێزەکانم ناردە چوار دەوری.

– بەیانی رۆژی ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٨١ هەوالّم بۆ نارد کە: یان بێتەوە ریزی یەکێتی، یان بێلایەن لەماڵی خۆی دابنیشێ بەو مەرجەی هاوکاری جود نەکا... یان دەست بەجێ ناوچەکە چۆڵ بکا... بەهاتنی ئێمەی زانیبوو هەر شەوێ چووبووە شاخی بیرمکە لەپشتی دۆڵەرەقە، هێزەکانی خۆی بەچەند ریزی دامەزراندبوو.

– قادر خەبات دۆستی عەولاّ سوور بوو بەیانی زوو چوو قسەی لەگەڵ بکا. قسەکانی منی پێ بڵێ. تەقەیان لێکرد، گوللەیەك لەرانی دا و بریندار بوو... دوو لەخزمەکانی عەبدوللاّ سوور، کەفەرماندەی کەرت بوون لەهەرێمەکەی: حاجی ئاغا حامید و خالسی حەقی ئاغا، هاتنە ناو یەکێتیەوە. هەمان پەیامەکەی بەیانیم بەمانیشدا بۆ نارد. بەلاّم پێم وتن ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بڕ ئەکا کەلێمان نەکوژراوە، ئەگەر لێمان بکوژی لەکۆڵی نابینەوە.

– بەشوانێك من و سواراغا نامەیەکمان بۆ نووسی و بۆمان نارد. شوانەکە نامەکەی برد و رۆیشت، نازانم پێی گەیاند یان نە، زۆری نەخایاند لەبەردەمی دۆڵەرەقەدا بووە تەقە.

– لەگەڵ تەقەکان، دوو پێشمەرگەی یەکێتی کوژرا بوون.. سەرەنجام سێ پێشمەرگە کوژرا بوون. ئاگاداری هێزەکەم کرد، پەلاماری سەرچاوەی تەقەکان بدەن... زۆری نەخایاند کپیان کرد. هەندێکیان کوژران هەندێکیان بەدیل گیران. عەولاّ سوور لەگەڵ گیراوەکاندا بوو.

– کەس و کاری پێشمەرگە کوژراوەکەی یەکێتی لەژن و منداڵ و پێشمەرگەکانی لای ئێمە دەیانگوت هەر ئێستا عەولاّ سوور لەتۆڵەی پێشمەرگەکان دەکوژین.. هەتا جوێنیشیان بەنەوشێروانیش دابوو.. زۆربەی پێشمەرگەکانی هەردوو لایەنی شەڕکەر خزمی یەکتر بووینە... هەندەی نەمابوو ببێتە شەڕی خۆبەخۆ، لەم هەرایەدا عەولاّ سوور کوژرا و ئاژاوەکە کوژایەوە(٢٦٥)...

نەوشێروان و سەید کاکە لەگێڕانەوەکانیاندا، لەسەر ئەوە کۆکن کە عەولاّ سوور بەغەدر تیاچوو. ناوبراو نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ نەوشێروان هەبووە، تاوەکو شەڕەکە روونەدا. مادام عەولاّ سوور هاتووە ئاگاداری هێزەکەی یەکێتی

بكات، تاوەكو ئاگاداری خۆیان بن، چونکە هێزێکی زۆری جود بەڕێوەن بۆ دەرکردنیان، هیچ ڕێی تێناچێت دەستکێشی هێزەکانی جود بکات بۆ ناوچەکە. ئەم گومانەی نەوشیروان لەجێگای خۆیدا نەبووە. یەکێك ئەگەر مەبەستی خراپە بووبێت، ئاگاداری نەیارەکەی ناکات و کاتی هێرش کردنە سەریان، ئاشکرا ناکات، بەڵکو وەك نهێنییەك دەیپارێزێت، تاوەکو غافڵگیریان بکات. ئەم ئاگادارکردنەوەی عەولا سوور، پەرۆشی بووە بۆ یەکێتی و نەڕژانی خوێنی براکانی سەنگەرە جیاوازەکان.

پشکۆ نەجمەدین، وەڵامی بۆچوونەکانی نەوشیروان دەداتەوە و دەنووسێت: لەناو هێزە چەکدارەکاندا وا باو بووە کەنووسەری پەنجەکان– نەوشیروان–، بەدەستی خۆی یان بەفەرمانی خۆی، عەبدوڵلا سووری بەدیلی ئیعدام کردبێت... هەوڵی فەرهادی کێشاوە تا یەقینی ئەو تاوانە بکاتە گومان و گومانیش لەژێر مژی تۆڵەسەندنەوەی خێڵەکیدا ون بکات! نووسەر لەدوا دێرەکانی گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا دەکەوێتە غەفڵەتەوە و دەڵێ: (لەناخی دڵەوە پێم ناخۆش بوو بکوژرێ، بەلام چۆن بۆ ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤێ لەمردن جاری وا هەیە دکتۆر خۆشەویستترین ئەندامی لەشی نەخۆشەکە ئەبڕێ، نەخۆشەکەش خۆی بەناچاری ڕازی ئەبێ، یانی بۆ کوژاندنەوەی ئاژاوەی خوێناوی نێوان دوو بنەماڵە یەکێ ئەکرێ بەقوربانی، کوشتنی ئەویش ناچارییەکی لەو بابەتە بوو. ل٢٢٤). لەپاش ئەم دێرانەی نەوشیروان، پشکۆ لێی دەپرسێ:... دەڵێی ئاگام لەکوشتنەکەی نەبووە و دوور لەدەسەلات و ئیرادەی من کوژراوە، کەچی هەر خۆت دەڵێی: کوشتنی عەولا سوور زەرورەت بووە!! پشکۆ بەردەوام دەبێت و دەنووسێت: خوێنەر دەتوانێت لەم چەند دێرەی سەرەوەدا، دەریایەك حەقیقەت پەیدا بکات. ئەگەر کەسێکیش گومانی لەوە هەبێت، ئەوا دەتوانم بێژم کەنووسەر– نەوشیروان– بەدەمی خۆی، ئیعدام کردنی عەولا سووری وەکو هەڕەشە لەکەسانی دیکە بەکارهێناوە و ئەمەش چیرۆکەکە و لەشوێنی دیکەدا جێگای خۆی هەیە[٢٦٦].

بەهەر شێوەیەك بێت، هەردوو لایەنی شەڕکەر بۆ لەدەستدانی عەبدوڵلا سوور، زۆر خەفەتبار و دڵگران بوونە، بەخودی نەوشیروانیشەوە... ئەو

فەرماندە خاوەن ئـەزموون و چـالاكە، نـەدەبوو بەدەسـتی براكـان لەناوبـچێت، (نەدەبوایە لەدۆڵـە رەقـە شـەهید بكرێ، جێگـای شـەهید بـوونی عـەولا سـوور لەسەر ترۆپكی چیای حەمرین بوو)[٢٦٧].

## ٥- گیران و كوشتنی كاكەسوور قۆڕیتانی

چالاكییەكانی هـەرێمی پـازدە، زێـتر لەرۆژهـەلاتی كۆیـە بـوو، پـاش شـەهید بـوونی (عـەولا سـوور)ی فەرمانـدەیان، بـەرە بـەرە لـەكورتیان دەدا. لەسـاڵی (١٩٨٣) بەدواوەش، هێزەكانی یەكێتی تەنگیان پێ هەڵچنی بـوون. كاكەسـوور قۆڕیتانی، یەكێك بوو لەپێشمەرگەكانی ئەم هەرێمـە و، لێپرسـراو و فەرمانـدەی كەرت بوو.

یەكێك لەچالاكییەكانی ئەم كەرتەی كاكەسوور، گرتنی بەڕێوەبەری ناحیـەی چوارقوڕنە و سێ لەپاسەوانەكانی بوو، لەنزیك قەزای كۆیە. ناوبراو و هێزەكـەی كاتێـك كەلەئەنجامـدانی ئـەم چـالاكیەدا، دەگەڕانـەوە، لەسـنووری گونـدەكانی (بـانی نیـسكان) و (سـوێرە)ی دەشـتی كۆیـە، تووشـی هێزێكـی یـەكێتی، بەفەرماندەی (شێخ شەماڵ و سـەرباز) دەبـن. كاكەسـوور، لەبـەر ئـەوەی دژی شەڕی ناوخۆ بوو، متمانەی بـەخۆی هـەبوو، كـەهێزەكانی یـەكێتی كێـشەی بـۆ دروسـت ناكـەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا، پێـشمەرگەكانی مەفرەزەكـەی لەمەترسـی دروست بوونی كێشە، ئاگادار كردبۆوە، بەلام ئەوان، بەهەنـدیان هەڵنـەگرتبوو. كەهەردوو هێزەكە لەیەكتر نزیك دەبنەوە، پێشمەرگەكانی كاكەسوور دەڵێن: بـا بگەڕێینەوە، واپێدەچێت ئەو هێـزەی یـەكێتی نیازیـان خـراپ بێـت. كاكەسـوور وەلام و دڵنیاییان پێدەدات و دەڵێت: من، دوێنێ لەگەڵ سەرباز و شێخ شـەماڵ بوویمـە، هـیچ شـتێك لەنێوانمانـدا نییـە. بەمتمانـە بەخۆبوونـەوە، لێیـان نزیـك دەبێتەوە و سلاویان لێ دەكات. بـەلام كەچـەند هـەنگاوێك لەهێزەكـەی یـەكێتی دوور دەكەونـەوە، یەكێتیـەكان میلـی تفەنگـەكانیان رادەكێـشن و هەڕەشـەی كوشتنیان لێدەكەن.. پێشمەرگەكانی كەرتەكـەی كاكەسـوور، خۆیـان بـۆ شـەڕ ئامـادە دەكـەن، كەچـی كاكەسـوور فـەرمانیان پێـدەكات شـەڕ نەكـەن. بـەم شـێوەیە، هێزەكـەی یـەكێتی، بـەبێ تەقـەكردن و خـوێن رشـتن، كاكەسـوور و

دوازده پێشمەرگەکەی سۆسیالیست چەك دەکەن[٢٦٨]. دوای چەك کردنیان، یەکسەر کاکەسوور جیا دەکەنەوە و بەدیلی ڕەوانەی سەرکردایەتی دەکەن. دوای ئەم ڕووداوە، دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە کەمام جەلال و سەرکردایەتی یەکێتی داوایان لەکاکەسوور کردووە واز لەسۆسیالیست بهێنێت و پەیوەندی بەیەکێتییەوە بکات، بەڵام ناوبراو ڕەفزی کردۆتەوە. پاش هێنان و بردن و ناوبژی کردن، یەکێتی جگە لەکاکەسوور، هەموو پێشمەرگە چەك کراوەکانی تر، ئازاد دەکەن، بەمەرجێك هەر پێشمەرگەیەك کەفیلێکی هەبێت و بەڵێنی ئەوە بدات کەجارێکی تر نەگەڕێتەوە ناو هێزەکانی سۆسیالیست، ئازادیشن لەوەی کەخۆیان رادەستی رژێم بکەنەوە.

(ئیستگەی دەنگی شۆڕشی عێراق)ی یەکێتی، لەژێر پاڵەپەستۆ و فشارەوە، کاکەسووریان ناچار کردبوو کەبڵێت: (... من بوومەتە یەکێتی و چیتر پەیوەندیم بەسۆسیالیستەوە نەماوە).

ئەو پێشمەرگانەی کەلەگەڵ کاکەسوور بەدیل گیران و چەك كران، بریتی بوون لە: (ئیسماعیل رەقیب ناسراو بەدەروێش، جەعفەر غەفار قۆڕپیتانی، عومەر ئیبراهیم، نوری ئەسعەد قۆڕپیتانی، دەروێش خدرانی، ئەنوەر ئیبراهیم قۆڕپیتانی، بەکر عەبدوڵڵا ناسراو بە بەکرە شەل، ستار غەفار، سلێمان عارف باجەوانی، محەمەد ئەسعەد قۆڕپیتانی، کەیفی ئەبوبەکر، ئیسماعیل عومەر)[٢٦٩].

شایانی باسە، لەبەر خۆ دوورخستن لەشەڕی ناوخۆ، جگە لەم جارە، کاکەسوور، دوو جاری تریش لەلایەن یەکێتییەوە گیراوە و دواتر ئازاد کراوە[٢٧٠].

کاکەسوور، لەساڵی ١٩٥٠ لەگوندی (قۆڕپیتان)ی سەر بەدەشتی کۆیە، لەدایك بووە. دواجار لەرۆژی ١٩٨٣/١/٣١دا بەدیلی دەکەوێتە دەست یەکێتی. پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر، هەوڵەکان ئەنجامی نەبوو. دوای پێنج مانگ مانەوە لەزیندانەکانی یەکێتی، لەرۆژی ١٩٨٣/٦/٣١دا دەکوژرێت و بێ سەروشوێن دەکرێت[٢٧١].

کاکەسوور، لەم کاتەدا دەستگیرکراوە کەپەیمانی ئاشتی لەنێوان یەکێتی و سۆسیالیستەوە مۆرکرابوو. بەدەستی فەرماندەی مەفرەزەیەکی جاش کەتازە پەیوەندی بەیەکێتییەوە کردبوو، کوژرا... لەپاداشتی ئەوەدا، ئەو کۆنە جاشە و تازە یەکێتییە، دواتر کرا بەفەرماندەی کەرتێك لەتیپی ٢١ی کەرکوك[٢٧٢].

## ٦- شەڕی (ئاشقولکە و پشت ئاشان) لەبناری (قەندیل)دا

حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بارەگای سەرکردایەتی و مەکتەبی راگەیاندنی لەئاشقولکە و پشت ئاشان، بوو. دوای ئالۆزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان حزبی شیوعی و یەکێتی، رۆژی ١٩/١٠/١٩٨٢، بەبڕیارێکی بەپەلە، مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی، گشت بنکە و بارەگاکانی خۆی لە (نۆکان-زەڵێ)وە، بۆ پشت ئاشان، دەگوازێتەوە[٢٧٣]. مەکتەبی راگەیاندن و ئیستگەکەشیان لەوێ دادەمەزرێنن. کۆمەڵێك کادیری راگەیاندن، ژن و منداڵ، رێکخستنە هەڵاتووەکانی دەستی رژێم، ئەوانەی بەنیازی دەرچوون بوون بۆ دەرەوەی وڵات،... هەموو لەوێ کۆببوونەوە، خەڵکی شەڕکەر نەبوون.

دوای ئەوەی زنجیرەیەك شەڕ و رووداوی یەك لەدوای یەك لەنێوان هێزەکانی سۆسیالیست و شیوعی لەلایەك و یەکێتی لەلایەکی ترەوە، لەناوچەکانی خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر دەقەومێن و کۆمەڵێك پێشمەرگە لەهەموو لایەنە شەڕکەرەکان، گیان لەدەست دەدەن، کێرڤی شەڕەکان بەرزتر دەبنەوە و زەمینەیەکی لەبار بۆ شەڕی گەورەی قەندیل، دەڕەخسێنن. پێش هێرشی یەکێتی بۆ ئاشقولکە و پشت ئاشان، کۆمەڵێك گرژی و شەڕ و پێکدادان روویدا بوو، لەوانە:

- لەرۆژی ٢٤/٤/١٩٨٣دا، دوو کادیر و فەرماندەی دیاری یەکێتی بەناوەکانی (شێخ شەماڵ و سەرباز ئەحمەد)، لەگوندی (باداوان)ی دۆڵی خەلەکان، لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزێکی هاوبەشی سۆسیالیست و شیوعی، گیان لەدەست دەدەن. شەماڵ، فەرماندەی هێزی ٩٣ی کۆسرەت و (سەرباز)یش جێگری بوو.

- رۆژانی ٢٧،٢٨/٤/١٩٨٣، هێزەکانی جود کەزۆربەیان شیوعی و سۆسیالیست بوون، هێرشیان کردۆتە سەر مەڵبەندی چواری یەکێتی لەبالیسان و مەڵبەندەکەیان داگیر کردووە. لەوێ کۆمەڵێك بەڵگەنامە کەوتۆتە دەست هێزەکانی جود، لەوانە (نامەکەی نەوشیروان مستەفا) کەلەرۆژی ٢٢/٣/١٩٨٣دا، بۆ (سەید کەریم)ی فەرماندەی هێزەکانی یەکێتی، نووسیوە.

نامەکـە، بـەفراوانی بڵاوکرایـەوە. لەوێـدا، نەوشـێروان ئامۆژگـاری سـەید کـەریم دەکات و بۆی دەنووسێت کەهێزەکانیان رێك بخەنەوە و رووبـەڕووی هێزەکـانی جود، ببنەوە. گۆڕانکاری لەفەرماندەکانی پێشمەرگە بکەن. لەنامەکەدا هاتبوو:

– وابزانم رێباز کـوڕێکی چـاك و دڵسۆزە، بـەڵام لەپێـشمەرگایەتی شـەڕکەر نییە.

– بەراسـتی شـاخەوان کـوڕێکی زۆر دڵـسۆز و چـاك و خـۆگرە بـەڵام وەکـو بیستوومە حسك لێی ناترسێن و بەهیچی نازانن لەبەرئەوە ئەو ببەنـە مەڵبەنـد و بیکەنە مەسئولی مالی و عەبدوڵلا رەشید لەجێگای ئەو دابنێن.

– مەڵبەنـدەکان وەزعیـان باشــە تــەنها مەڵبەنــدی ســێ نــەبێ، نــرخ و قورسایەتیان لەناو پێشمەرگە نەماوە.

– دەســت لەتــەعریب کراوەکــان بوەشــێنن– مەبەســت لــەو عەرەبانەیــە کەبەنیازی تەعریب کردن، رژێـم هێنابووینـە ناوچـە کوردسـتانییەکان–، مـاڵ و خانووەکانیــان بــڕوخێنن، تراکتــۆر و دەڕاســە و ئۆتۆمبێــل و مەکینــەکانیان بسووتێنن، گەنم و جۆ و زراعـەتیان بـسووتێنن، مـەڕ و مـاڵات و گـا و گۆتاڵیـان تاڵان بکەن، بۆ ئەوەی ناچار بن بڕۆن، گوێ مەدەنە ئەوەی چمان پێ دەڵـێن و کێ ئەوە بەئینسانی دەزانێ یان بەنائینسانی[٢٧٤].

داگیرکردنی مەڵبەندی چوار، ئاڵۆزییەکانی فراوان و چـڕتر کـرد، رەهەنـدێکی ترسناکی بەشەڕەکە دا. هەزم کردنـی ئـەم واقیعـە، بـۆ یـەکێتی ئاسـان نـەبوو، بێـدەنگ بێـت و تۆڵـەی خـۆی نەکاتـەوە. بۆیـە بـەپلانێکی تۆکمـە و بـەهێزێکی زۆرەوە، کەراسـتەوخۆ لەلایـەن خـودی (نەوشـێروان مـستەفا)وە سەرپەرشـتی دەکرا، ئامادەکـاری بەپەلـەی بـۆ کـرا و لەلایـەن خـودی (مـام جـەلال)یشەوە، بەوتارێکی حەماس ئامێز بەرێکراو[٢٧٥] لەسەربازگەکانی رژێمەوەش، ناوە ناوە، تۆپ بارانی پشت ئاشان و دۆڵی ناو دەشت، دەکـرا. بـۆ نموونـە: لەبەرەبـەیانی رۆژی ١٨/٤/١٩٨٣دا، رژێم تۆپبارانێکی خەستی ئەم ناوچانەی کرد.

هێزە بەشداربووەکانی یەکێتی لەشەڕی ئاشقولکە و پشت ئاشان، بەگوێرەی ئەو گفتوگۆیەی کەئیستگەی (دەنگی شۆڕشی عێراق)، ئیستگەی یەکێتی، پاش تــەواو بــوونی شــەڕەکە لەگــەڵ (نەوشــێروان مــستەفا)ی کردبــوو و دواتــر وەك

بەڵگەنامەیەکیش بڵاوکرایەوە، هێزەکانی یەکێتی بریتی بوون لە: (تیپی ٢١ی کەرکوک، تیپی ٢٣ی سورداش، کەرتێکی تیپی ٤٧ و پیرەمەگرون، بەشێکی تیپی ٤٣ی ئاسۆس، کەرتەکانی ٦٨ی مامەندە، بەشێکی تیپی ٦١ی کۆڕش، تیپی شەهیدان و کەرتی قەندیل، بەشێکی تیپی ٥١ی گەرمیان، تیپی ٩٣ی کۆسرەت، تیپی ٩٩ی بیتوێن، تیپەکانی مەڵبەندی سێ، تیپی ٧٤ی باڵەك، تیپی ١٢ی سۆران، تیپی کارۆخ)[٢٧٦].

بەگوێرەی سەرچاوەکانی حزبی شیوعی، ئەو هێزەی یەکێتی، نزیکەی (١٧٠٠) کەس دەبوون و شارەزاییەکی باشیان لەشەڕکردن هەبووە و چەکی دوور مەودای وەك (بیکەیسی)شیان پێ بووە کەپێشتر حکومەت پێی دابوون[٢٧٧].

لەبەرامبەر ئەو هێزە راهێنراو و بەئەزموونەی یەکێتی، شیوعیەکانی پشت ئاشان، ژمارەیان سێ سەد کەس دەبوو کەزۆربەیان مەشقیان نەدیبوو، هەندێکیان خێزاندار بوون، یان کادیری راگەیاندن بوون[٢٧٨]. جگە لەو ژمارەیە، نزیکەی (١٧٠) پێشمەرگەی تریان لەدەوروبەری ئەو ناوچەیە بوو. وێڕای (١٥٠) پێشمەرگەی سۆسیالیست کەئەوانیش لەدەوروبەری شەڕەکە بوون. هێزەکانی جود، هەمووی بەسەریەکەوە، نزیکەی (٤٥٠–٥٠٠) کەس دەبوون[٢٧٩].

ئەو (١٥٠٠) پێشمەرگەیەی کەپارتی پەیمانی دابوو بینێرێت ئەوانیش نەگەیشتن[٢٨٠]. حزبی شیوعی لەم رووبەڕووبوونەوە و شەڕکردنەی لەگەڵ یەکێتیدا، تەواو خۆی یەکلا نەکردبۆوە، بۆچوونێکی یەکگرتوویان نەبوو. لەناوچەی سلێمانی، کەبەهادین نوری لێپرسراوی هێزەکانیان بوو، لەگەڵ مەلا بەختیار (یەکێتی)، رێککەوتنیان هەبوو کەشەڕ نەکەن. ئەمە لەکاتێکدا بوو، کەزۆر لەمێژ بوو، چەندین رووداوی خوێناوی لەنێوان هێزەکانی یەکێتی و شیوعی، لەناوچەکانی دەشتی هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی، قەوما بوو. بەهادین نوری ئەوەندە بێلایەن وەستابوو تا ئەو ئاستەی کەئیستگەی یەکێتی لەبەرنامەکانیاندا، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ناوبراو لەحزبی شیوعی جودا بۆتەوە[٢٨١]. هەروەها داوایان لەمەڵبەندی بادینان کردبوو، کەبەهانایانەوە بچن، بەڵام ئەوان بەبیانوی رێگا دووری، بەدەنگ داواکەیانەوە نەهاتبوون. شیوعی،

پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کەیەکێتی بەم شێوەیە هێرشیان بکاتە سەر. ئەوان، هەر خۆیان بەناوبژی کەر و ڕیش سپی دەزانی، بۆیە لە ١٩٨٣/٤/٣٠، ڕۆژێك پێش هێرشەکە، خۆیان بۆ سازکردنی ئاهەنگی یەکی ئایار، جەژنی کرێکارانی جیهان ئامادە کردبوو. جگە لەحزبی شیوعی، دەنگۆی ئەوەش هەبوو هێزەکانی لقی سلێمانی حزبی سۆسیالیستیش لەگەڵ یەکێتیدا شەڕ ناکەن و جۆرە ڕێککەوتنێکیان لەنێوانیاندا هەیە، ئەمەش بەزەقی لەکۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیست، دوای شکستی ئاشقولکە و پشت ئاشان، بەئاشکرا دیار بوو. سەرکردایەتی حزب، لقی سلێمانیان بەم شەڕ نەکردن و ڕێککەوتنە، تاوانبار دەکرد(٢٨٢)، کەدواتر بووە خاڵ و بیانوویەك بەدەست باڵی قادر عەزیز کەسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بەجورئەت نەبووینە لەسەر لێپێچینەوە کردن لەلقی سلێمانی.

هێزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)یش، ژمارەیەکی یەکجار کەمیان لەم شەڕگەیەدا هەبوو، ئەوانیش بەهانای هێزەکانی شیوعی و سۆسیالیستەوە نەهاتن. سەرچاوەکانی شیوعی و سۆسیالیست و پارتی (بەیاننامە و هەواڵەکان)ی ئەوکات و، ئەو یاداشت و بیرەوەرییانەی کەلەدوای ڕاپەڕینەوە، بڵاویانکردۆتەوە، یەکێتیان بەوە تاوانبار کردووە کەپەیوەندیان لەگەڵ ڕژێمدا هەبووە(٢٨٣) و یارمەتی و کۆمەکی شەڕیان لەڕژێم و جاشەکانەوە وەرگرتووە. بۆ نموونە: (ڕژێم ئاسانکاری بۆ ینك کردبوو کەهێزەکانیان بۆ پشت ئاشان بێنن... بەفڕۆکە روماڵی ناوچەکەی دەکرد و زانیاری بەیەکێتی دەدا، جاشەکانیش ناوچەکانیان بۆردومان دەکرد)(٢٨٤).

لەبەرامبەر ئەم دەنگۆیانە، یەکێتیش دەیگوت: (کەپێش ئەوەی هێزەکانیان بگەنە دەوروبەری شەڕگەکە، حکومەت لە ٤/٣٠، ڕۆژێك پێش هێرشەکە، بۆردومانی کردوون و تۆپ کەوتۆتە ناویان و چەند پێشمەرگەیەکیان لێ شەهید بووە، لەوانە: حەمە مەحمود، مام بێستوون، بەدرخان سابیر)(٢٨٥).

لەپاش نیوەڕۆی ١٩٨٣/٥/١، یەکێتی هێرش دەکات و بەماوەی یازدە سەعات، دەست بەسەر تەواوی بارەگاکانی شیوعی و سۆسیالیست دا دەگرێت. زیانی سەرەکی کەمەرشکێن بەر حزبی شیوعی دەکەوێت. سەرەڕای شەهید

کردنی (٦٥) پێشمەرگە و ئەندامیان، دەزگای راگەیاندن بەتەواوی کەل و پەل و بەڵگەنامەکان و چەکێکی زۆری جۆراوجۆری وەك کلاشینکۆف، دۆشکە، مەدفەع، تا دەگاتە ساروخی سام حەوت کەبۆ دژە فڕۆکە هێنابوویان و تاقیش نەکرابۆوە، خواردن و کەل و پەلی تایبەتی پێشمەرگەکان و پارەیەکی زۆر کەوتە دەست هێزەکانی یەکێتی[٢٨٦]. پێش ئەوەی یەکێتی دەست بەسەر بارەگاکەیان دابگرێت، هەر خۆیان، ئیستگەکەیان تەقاندەوە[٢٨٧]. جگە لەم زیانانە، بەپێی هەواڵەکانی ئیستگەی یەکێتی کەلەرۆژی ١٩٨٣/٥/٨دا، بڵاویانکردەوە، هەردوو ئەندامی سەرکردایەتی حزبی شیوعی (کەریم ئەحمەد، ئەحمەد بانیخێڵانی) و چل و هەشت کادیر و پێشمەرگەش، بەدیلی کەوتبوونە دەست یەکێتی[٢٨٨]. هەر لەم رۆژەدا، (١٩٨٣/٥/٨)، مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان (ینک)، یاداشتێکی دوور و درێژیان ئاراستەی حزبە شیوعیەکانی وڵاتانی عەرەبی و، لایەنەکانی بزوتنەوەی ئازادی بەخش کردووە. لەم یاداشتەدا، باسی رووداوەکانی پێش یەکی ئایاریان کردووە و، حزبی شیوعیان بەوە تاوانبار کردووە، کەوا ئەوان دەست پێشخەر بووینە و هاریکاری لایەنەکانی (جود)یان کردووە دژی یەکێتی و، چەندین پێشمەرگەیان لێ شەهید کردوون. هەر لەم یاداشتەیاندا، جەختیان لەسەر سەلامەتی هەردوو ئەندامی سەرکردایەتی حزبی شیوعی کردۆتەوە و، ئەوەشیان راگەیاندووە کەباری ناکۆکی و پەیوەندی نێوان هاوڕێیانمان و هاوڕێیانی شیوعی لەپارێزگای هەولێر، بەهیچ شێوەیەك کار ناکاتە سەر هاوڕێیانی شیوعی، لەسلێمانی و ناوچەکانی تر[٢٨٩].

زیانەکانی حزبی سۆسیالیست، بریتی بوون لەشەهید بوونی پێنج پێشمەرگە و پێنج پێشمەرگەی تریش، بەتێڕادیتنەوە خۆیان تەسلیمی هێزەکانی یەکێتی کردبوو. ئەوان باوەڕیان وابوو، ئازار نادرێن، چونکە خزم و کەسیان لەناو یەکێتیدا بوون، بەڵام پێشبینییەکانیان راست دەرنەچوون، هەر پێنجیان بەدیلی گوللەباران دەکرێن و دەکوژرێن[٢٩٠]. دوای تەواو بوونی شەڕەکە، هەردوو سەرکردەی دیل (کەریم ئەحمەد و ئەحمەد بانیخێڵانی)، لەگەڵ مام جەلال، لەرۆژی ١٩٨٣/٥/١٠، بانگەوازێکی هاوبەش بۆ هەموو چەکدارانی

هـەردوو لا بـڵاو دەكەنـەوە و داوایـان لێدەكـەن كەلـەمڕۆ بـەدواوە، لەتـەواوی میحوەرەكان شەڕ رابگرن[٢٩١]. بەیاننامەكە، هیچ سـەدایەكی نـەبوو، بەتایبـەتی لەلای حزبـی شـیوعیەوە، چـونكە پێیـان وابـوو، ئـەو دوو سـەركردەیان دیلـن و ئیرادەیان داگیر كراوە، هەرچی بڵێن و بڵاوی بكەنەوە، پێیانەوە پابەنـد نـابین. (حزبـی سۆسیالیـستی كوردسـتان)، گلـەیی لـەپارتی هـەبوو، كەبەهانایانـەوە نەچـوونە. هـەروەها دەیـانگوت: حزبـی شـیوعیش جیـدی نەبووینـە لەسـەر شەڕكردن لەگەڵ هێزەكانی یەكێتی، چونكە (زۆربەی هێزەكانی یەكێتی بـەنزیك بنكەكانی شیوعی تێپەڕ بووینە لەقەڵاتوكان، بەڵام لەبەر نەبوونی سیاسـەتێكی روون و ئاشكرا نەك هەر رێگایان پێ نەگرتوون، بگرە یارمەتیشیان دابوون و ئاو و نانیشیان بەهەندێ لەچەكدارەكانی یەكێتی دابوو)[٢٩٢]. نەوشێروانیش جـەخت لەسـەر ئـەم راسـتییە دەكاتـەوە، بـەڵام ئـەو بـەدیوێكی تـر و لەبەرژەوەنـدی هێزەكەی خۆی. ناوبراو دەڵێـت: (هێزەكـانی حـشع كـەم بووینـە و نـەیانوێراوە لەهێزەكانی یەكێتی بدەن)[٢٩٣].

ئەم شـەڕە، پارسـەنگی هێـزی لـەرووی عەسـكەرییەوە، بـەقازانجی یـەكێتی گـۆڕی و، هێزەكـانی بـەرەی جـود لەناوچـەكانی هـەولێر و خۆشـناوەتی، بێهێـز كـرد. ئەگـەر بهاتبوونایـەش، زۆر بـەنهێنی و بـەپارێزەوە، دەهاتنـە ناوچـەكە. هـەروەها ئـەم شكـستەی بـەرەی (جـود)، ناكۆكییـەكانی نێـوان ئەنـدامانی سـەركردایەتی حزبـەكانی قـوڵتر كـردەوە، كەلـەدواجاردا، بەشـێكی زۆر لەهێزەكانی سۆسیالیست لەئابی ١٩٨٤ تەسلیم بەیەكێتی بوون. دوای ئەمەش، قادر عەزیز جیابۆوە. لەحزبی شیوعیش، بەهائەدین نوری وازی لەحزب هێنـا... جگە لەم زیانانـەش، خـەڵكێكی زۆر لەپێـشمەرگە و ئەنـدامان، نائومێـد بـوون و وازیان لەپێشمەرگایەتی هێنـا و بـەرەو ئـەوروپا رۆیـشتن، یـان تەسـلیم بـەرژێم بوونـەوە. هێزەكـانی جـود، لـەمانگی ئـابی ١٩٨٣دا، خۆیـان رێـك خـستەوە، بەهێزێكی زۆرەوە ویستیان پارسەنگی هێز بەقازانجی خۆیـان راسـت بكەنـەوە، بـەڵام ئـەمجارەش، دوای شـەهید بـوونی (١٥) پێـشمەرگە لەشـیوعی و، (٦٥) لەپارتی و، (٥) لەسۆسیالیست و، (٢٢) لەیـەكێتی، جـارێكی تـریش شكستیان خـوارد. ئـەم خولـەی شـەڕ، كەبەگـەڕی دووەمـی شـەڕی قەنـدیل بەناوبانگـە،

هێزەکـانی عێـراق و ئێـران، بەشـداریان تێـدا کـرد، لـەپێناو یەکلاکردنـەوەی شەڕەکە بەقازانجی هاوپەیمانەکانیان[٢٩٤]. هەروەها بووە خاڵێکی یەکلاکـەرەوە و لەمە بەدواوە شەڕی گـەورە و فراوانـی تـر نەقـەوما. حزبـەکان لـەوە نائومێـد بوون کەبەهێز ناتوانن کێشەکانیان یەکلا بکەنەوە، بۆیە وردە وردە لەشەڕکردن سارد بوونەوە، بەتایبەتیش دوای شکستی مفاوەزاتەکـەی حکومـەت و یـەکێتی و، زەمینەسازی بۆ دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی)، کرا.

## ٧- شەڕی ناوخۆ و دەرهاویشتەکانی

دوای گـەرمبوونی شـەڕی نـاوخۆ و فراوانبـوونی بازنـەکانی، هـەر لایـەنێك هەوڵیدەدا بەهێنانـەوەی کۆمـەڵێك بیـانوو و تۆمـەت، لایـەنی بەرامبـەر تاوانبـار بکات. بەئامانجی خۆشـبرین کـردن و ئیقنـاع کردنـی کۆمـەڵانی خـەڵك، بـەوەی کەئەو لەسەر هەقە و لایەنی بەرامبەر ناهەقی دەکات و، شەڕ و کێشەی لابـەلا، دروست دەکات. ئەگەر بەدوای بیانوو و تۆمەت و قسەی ناشیرین و بوختان دانە پاڵ یەکترییەوە، بگەڕێین، ئەوا زۆر بەئاسانی لەبەیاننامـە و ئـەدەبیاتی هـەموو لایەنە شەڕکەرەکان، دەیاندۆزینەوە. ئەو تۆمەت و بیانوانە، لەکاتی هەڵچوون و کاردانەوەکاندا، دروست کراون و بڵاوکراونەتەوە. ئەگەر بەشێکی هەرە کەمیان، راسـتی تێـدا بووبێـت، ئـەوا بەدڵنیاییـەوە، بەشـی هـەرە زۆریـان داتاشـراو و هەڵبەستراو بوون. جگە لەرق و قینی پەنگ خواردووی زۆر بەرامبەر بەیـەکتری، هیچ شتێکی تری نەگەیاندووە.. هەوڵ دەدەین، بەشێك لـەو بیـانوو و تۆمەتانـە بهێنینـەوە کەلـەو سـەردەمانەدا، هۆکارێـك بووینـە بـۆ چەواشـەکردنی خـەڵك و درێژەدان بەشەڕی ناڕەوا، بەرامبەر بەیەکتری.

**١- هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ رژێم و جاش و نۆکەران:** مام جەلال لەرۆژی ١٩٧٩/١١/٤دا، پاش مفاوەزاتەکەی حزبی سۆسیالیستی کوردستان و حکومەتی بەغدا، کورتە نامەیەك بۆ حزبی شیوعی دەنووسێت و هاوپێچ لەگـەڵ نامەکـەدا، نامەیـەکی (ئەحمـەد فـەقێ بێـورەیی)یـشی نـاردووە. ئەحمـەد بێـورەیی، لەنامەکەیدا، هـەواڵی ئـەوەی بـۆ مـام جـەلال نـاردووە کەخەبـەری موئەکـەدی

(موئەکەد ! !) هەیە کەرژێم لەرێگای بۆمبی تەوقیت یان لغوم دەیەوێت مام جەلال لەناو ببات. جێ بەجێکردنی ئەم پیلانەشی بەجەماعەتی دکتۆر مەحمود و رەسولْ مامەند، سپاردووە[٢٩٥]. ئەمە یەکێك بووە لەو هەولْ و پروپاگەندانەی کەرژێم دەیکرد، بۆ زیاتر خۆشکردنی شەڕ و دوژمنایەتی خستنە ناو ریزەکانی پێشمەرگە و حزب و رێکخراوەکانی سەر گۆڕەپانی خەبات. لەبەرامبەر ئەوەشدا، (کەریم ئەحمەد)ی کۆنە سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان، لەدیمانەیەکیدا، ئەوە دەخاتەڕوو کەلەرووداوەکەی (پشت ئاشان) لەبەهاری ١٩٨٣دا، رژێم رۆڵی هەبووە لەم روداوەدا، ئەویش بەهاندان و ئاڕاستەکردنی ئەو لێپرسراوانەی کەلەناو یەکێتیدا بووینە و بۆ حکومەت کاریان کردووە. لەم بارەیەوە، ناوبراو دەڵێت: (... لەبەستی شەرغەوە هەتا دەگاتە رۆژی هێرشەکە هەموو حکومەت رێکی خستبوو. جاسووسی حکومەت، نوێنەری حکومەت لەناو یەکێتی رێکی خستبوو، لەو بارەیەوە بەڵگەشمان هەیە، کەلەپاش راپەڕین ئەو بەڵگەنامانەمان لەبینایەکی موخابەرات چنگ کەوت، دەڵێ: ئێمە ئەو شتانەمان رێك خست)[٢٩٦]. هەندێك لەم تۆمەت و قسانە راستیشیان تێدا بوو، چونکە دوای راپەڕین و روخانی سەدام، زۆر بەڵگە دەست کەوتن کەراستی ئەم قسانەیان دەسەلماند. پەیوەندی کردنی کەسایەتی و لێپرسراوی لایەنەکان، بەپیاوانی رژێم و دروست کردنی (خەت مائیل) لەنێویاندا، لەپێناوی سوود وەرگرتن لەدەنگ و باس و پیلانەکانی رژێم، کارێکی کردەیی بووە. چۆن شۆڕش، بۆ بەرژەوەندی خۆی، ویستوویەتی ئەم هێڵە دروست بکات، رژێمیش بەهەمان شێوە. هەندێك لەو پەیوەندییانە حاشا هەڵنەگرن، چونکە لەسەر زاری لێپرسراوە بەئاگا و بالا دەستەکانی حزبەکان، دانیان پیانراوە و بلاوکراونەتەوە. بۆ نموونە:

– لەدوای تێکچوونی مفاوەزاتی نێوان یەکێتی و حکومەت لەساڵی (١٩٨٣–١٩٨٥)دا. یەکێتی پەیوەندی لەگەڵ زۆر لەسەرۆك جاش و مەفرەزە خاسەکان، هەبووە. بۆیە پاش مفاوەزات، مەفرەزەی پێشمەرگە بەتەك رەبایەی جاشەکاندا رۆیشتوون، بێ ئەوەی تەقەیان لێ بکرێت، یارمەتی دەربازبوونیان دراوە، چونکە لەنێوانیاندا، پەیوەندی هەبووە[٢٩٧]. تۆفیق رەحیم کۆنە

پێشمەرگەی یەکێتی بووە، پاشان تەسلیم بۆتەوە و بۆتە لێپرسراوی مەفرەزە خاسەی ئیستخبارات لەسلێمانی. ناوبراو، دریغی نەکردووە لەدژایەتیکردنی پێشمەرگە، بەڵام جارێکی تر دێتەوە شاخ و دەچێتە ئێران، ئەمجارەیان دەبێتە پێشمەرگەی پارتی. پشکۆ نەجمەدین، دەنووسێت: (من نامەیەکم بەناوی حەمە ئاواتەوە، بۆ تۆفیق رەحیم فەرماندەی مەفرەزەی تایبەتی جاشان و هاورێی خۆمان نووسی!)[٢٩٨].

– حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی (سەر بەرژێم)، لەرۆژی ١٩٨٣/٨/٥دا، خەڵك و هەوادارانی خۆی راسپاردبوو کەدەنگ بەپاڵێوراو (محیەدین حەمە حەسەن) بدەن، چونکە بەدۆستی خۆیانیان زانیوە و لەدوارۆژدا سوودی لێدەبینن[٢٩٩].

– عەبدوڵڵا ماولیانی لێپرسراوێکی جاش بووە، دێتە دەرەوە و پەیوەندی بەحزبی شیوعی دەکات و لەلای ئەوان بۆتە پێشمەرگە. یەکێتی و سۆسیالیست و پارتی، هەر سێ لایەن داوایان لەسەری هەبووە، گوایا دەستی هەبووە لەکوشتنی پێشمەرگە و ئەندامانی ئەوان. شیوعیش بەرگری لەناوبراو دەکرد. رۆژی ١٩٨١/٩/٥، مەفرەزەیەکی یەکێتی، لەگوندی دەرگەڵە، ناوبراو دەکوژن. بەم شێوەیە، یەکەمین شەڕ لەنێوان شیوعی و یەکێتیدا، هەڵدەگیرسێ[٣٠٠]. یوسف حەنا یوسف (ئەبو حیکمەت)، ئەوکات لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێری حزبی شیوعی بوو، ناوبراو دەنووسێت: عەبدوڵڵا ماویلی فەرماندەی مەفرەزە خاسە بوو، لەناوچەی رەواندز. ژمارەی ئەو چەکدارە جاشانەی کەلەگەڵیدا بوون، (٣٠) کەس بوون. زۆربەیان کۆنە شیوعی، یان پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ حزبی شیوعیدا، هەبووە، بەخودی (عەبدوڵڵا)شەوە. ناوبراو دێتە دەرەوە، پەیوەندی بەهێزی شیوعیەکانەوە کردووە. مام جەلال، نامەیەکی بۆ عەبدوڵڵا نووسیوە ئەبو حیکمەت دەڵێت: (من خۆم نامەکەی مام جەلالم خوێندەوە کەبۆ ماویلی ناردبوو). لەنامەکەدا، بەخێرهاتنی کردبوو، بەئازایەتی و هەڵوێستەکانی ماویلی هەڵدابوو. داوای لێکردبوو پەیوەندی بەریزەکانی یەکێتییەوە بکات، بەڵام ناوبراو ئەو داوایەی رەت کردۆتەوە. رۆژێك لەگوندی دەرگەڵە، مەفرەزەیەکی یەکێتی، چواردەوری ناوبراو دەگرن و داوای لێدەکەن

چەك دابنێت و تەسلیمیان بێت. ئەو، ناچێتە ژێر ئەم بارەوە. شەڕ روودەدات، ماویلی دەكوژرێت. لەتۆڵەی ئەوە، حزبی شیوعی لەگوندی (ئاكۆیان)، چواردەوری (وەسمان بەگ)ی لێپرسراوی یەكێتی دەگرن و دەبێتە شەڕ. لەئەنجامدا، وەسمان بەگ و سێ پێشمەرگەی تری یەكێتی، دەكوژرێن[٣٠١].

٢- مفاوەزات كردن لەگەڵ رژێم: لەهەموو قەیران و كێشە و گرفتەكاندا، مفاوەزات باشترین چارەسەر بووە بۆ لابەلا كردنی كێشەكان، وەلێ: حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق، تەنها لەكاتی بێهێزیدا، پەنایان بۆ ئەم رێگایە بردووە و تا سەر دڵسۆز نەبووینە بۆ جێبەجێكردنی بەڵێنەكانیان. ئەوەی كردوویەتیان، تەنها بۆ خۆ بەهێزكردن و كات كوشتن بووە. لەشۆڕشی ئەیلولدا، زۆر جاران پەنا بۆ ئەم رێگایە براوە، بەڵام هیچ ئەنجامێكی لێ بەدی نەهاتووە. لەشۆڕشی نوێشدا، هەر لەسەرەتای هەڵگیرساندنەوە، حكومەت ئەم رێگایەی چەندین جار و بەچەندین شێوە، تاقیكردۆتەوە. ئەمجارەیان، نەك بەیەكجار لەگەڵ هەموو حزبەكان، بەڵكو هەوڵیداوە هەر جارێك دەرگا بەرووی لایەنێكدا بكاتەوە و داوای دانووستاندنی لێ بكات. رژێم، لەم كارەیدا، تەنها مەبەستی ئەوە بووە كەدوویەرەكی و درز بخاتە رِیزی حزبەكان و پەرتەوازەیان بكات، تاوەكو بەئاسانی بتوانێت بەسەریاندا زاڵ بێت. گرنگترین ئەو داواكاری و مفاوەزاتانەی حكومەت و لایەنە كوردییەكان- تەنها ئەوانەی ئاشكرا بووینە و بڵاوكراونەتەوە- لەنێوان (١٩٧٧-١٩٩١)دا، ئەمانە بوون:

- ساڵی ١٩٧٧، پارتی لەرێگای (عزەت بەگی دەرگەڵەیی) و، (یەكێتی)ش لەرێگای (حاجی محەمەد شێخ رەشیدی لۆلان)، مفاوەزاتیان لەگەڵ حكومەت كردووە[٣٠٢].

- حزبی سۆسیالیستی یەكگرتووی كوردستان، لەتشرینی یەكەمی ١٩٧٩دا، چوونەتە بەغدا و لەگەڵ نوێنەرانی حكومەت دانیشتوون. د. مەحمود عوسمان، سەرۆكی شاندەكە بووە.

- كەسەدام حوسێن لەساڵی ١٩٧٩دا بۆتە سەرۆك كۆمار، هەوڵیداوە مفاوەزات لەگەڵ لایەنە كوردییەكان بكات. بۆ ئەم مەبەستە، لەسەرەتای ساڵی

١٩٨٠، پەیامێك بۆ یەكێتی دەنێرێت و داوای دەست پێكردنی مفاوەزاتیان لێدەكات[٣٠٣].

– پێش هەڵگیرساندنی شەڕی عێراق– ئێران لە ١٩٨٠/٩/٢٢دا، سەدام حوسێن (بارزان تكریتی– سەرۆكی مخابەراتی عێراق)، كەبرای خۆیەتی، رادەسپێرێت كەنامەیەك بۆ سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان (مەسعود بارزانی) بنێرێت و داوای گفتوگۆی لێ بكات، بەڵام بەهۆی بێ متمانەیی بەحكومەت و سەدام حوسێن، هەوڵەكە سەری نەگرتبوو[٣٠٤].

– حكومەت لەساڵی ١٩٨٢دا، شاندێكی سەر بەمخابەراتی عێراقی ناردۆتە لای پارتی و لەناوچەی برادۆست، لەگوندی (بێركمێ)، كەبارەگای مەسعود بارزانی لێبووە، چاویان بەناوبراو كەوتووە. (عیزەت سلێمان بەگی دەرگەڵەیی)، یاوەری شاندەكەی حكومەتی كردووە. شاندەكە، نامەیەكی (بارزان تكریتی)یان گەیاندۆتە دەستی سەرۆكی پارتی و وایان پیشان داوە كەگوایا لەسەر داوای سەرۆكی پارتیدا هاتوون، بەڵام بارزانی، پێیانی گوتبوو: من هیچ نامەیەكم بۆ حكومەت نەنووسیوە، بەڵام ئامادەم بۆ بەرژەوەندی گەلی كورد گفتوگۆ بكەم[٣٠٥].

– رۆژی ١٩٨٢/١٠/١٣، مام جەلال لەگوندی گۆڕەشێر، چاوی بەدكتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ، كەوتبوو. سێ نوێنەری حكومەتی عێراق لەگەڵ د. قاسملۆ، ئامادەی ئەم یەكتر بینینە بووینە. یەكێك لەم سێ كەسە، برای (سەعدون شاكر)ی بەڕێوەبەری موخابەراتی عێراق بووە. مام جەلال لەم دانیشتنەدا، پرسیاری لەنوێنەرانی حكومەتی عێراق كردبوو، ئایا بەغدا بەچ شێوەیەك ئامادەیە لەگەڵ كورد رێك بكەوێت؟ هەروەها گوتبووی: ینك بەتەنها ئامادە نییە لەگەڵ بەغدا، گفتوگۆ بكات[٣٠٦].

– مام جەلال رۆژی ١٩٨٣/٢/١٤، نامەیەك بۆ (كەریم ئەحمەد)ی ئەندامی مەكتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراق دەنووسێت. لەنامەكەدا هاتبوو: چەند رۆژێك لەمەوبەر ئاگادار كراین كەمیری راسپاردەی گرنگ و بەپەلەی بۆمان هەیە... رۆژی ١٩٨٣/٢/١٣– واتە: رۆژێك پێش نووسینی نامەكە، ئیسماعیل– سێ كەسیان هاتن كەبریتی بوون لە: محەمەد شاكر (برای سەعدون شاكر)،

(عەقیــد ئیحــسان) لێپرســـراوی مخابـــەراتی شـــیمالی و یـــەکێکی دی کەنەمدەناسی[٣٠٧]. ئەم یەکتر بینینە، ڕێگا خۆشکەر و زەمینەسازیکردن بووە بۆ مفاوەزاتەکەی یەکێتی و حکومەت لەکۆتایی ١٩٨٣ تاوەکو ١٩٨٥/١/١٥، کەساڵێك و چل و دوو ڕۆژی خایاند. لەبارەی ئەم مفاوەزاتەوە، ڕێباز دەنووسێت: (... مفاوەزات بەنهێنی کاری بۆ کراوە، بۆیە دەتوانم بڵێم سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٨٣- سێ مانگ پێش ڕووداوەکەی پشت ئاشان-، زانیم مفاوەزات هەیە، لەنامەیەکی کاك نەوشێروان کەبۆ سەید کەریم نووسرابوو ئەو مەسەلەی بەراشکاوی تێدا بەدی دەکرا. کاك فەرەیدون بەنهێنی چووە بەغدا)[٣٠٨].

- هەر ئەو کاتەی کەیەکێتی و پارتی، لەشەڕێکی توندوتیژدا بوون، حکومەت بۆ پەرتەوازەکردنیان، بەنهێنی مفاوەزاتی لەگەڵ هەردوو لایان هەبوو، لەسەرەتای شوباتی ١٩٨٣ لەگەڵ یەکێتی و لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ پارتی. بەڵام ئەوەی پارتی، دوای ئەوەی کەلەگەڵ سوپای ئێران بەشداری هێرش بۆ سەر حاجی ئۆمەران (گرد مەندیل) لەرۆژی ١٩٨٣/٧/٣١ دەکەن، مفاوەزاتەکەیان نامێنێ[٣٠٩].

- مفاوەزاتی حکومەت و یەکێتی، لەکۆتایی ١٩٨٣ تاوەکو ١٩٨٥/١/١٥.

- سەدام لەرێگای (د. موکەرەم تاڵەبانی)[٣١٠]، کۆنە وەزیری حزبی شیوعی عێراق لەکابینەی حکومەتی عێراق، لەناوەڕاستی حەفتاکانەوە، داوا لەهەموو حزبەکان (ینك، پدك، حسك، حشع) دەکات، جارێکی تر دانوستاندن دەست پێبکەن... دوای ئەوەی سەدام، موکەڕەم رادەسپێرێ، ناوبراویش لەکۆتایی شوباتی ١٩٨٨دا، نامەیەك بۆ سۆسیالیست دەنووسێ و لە ١٩٨٨/٣/٥دا، دەگاتە دەستی (شێخ محەمەد شاکەلی)، ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیست، ئەویش بۆ سکرتێری حزب (رەسوڵ مامەند)ی دەنێرێ. موکەڕەم، بەهەمان شێوە، نامە بۆ هەرسێ لایەنەکەی تریش دەنووسێت، بەڵام هەر چەند مانگێك دوای ناردنی ئەم نامەیە، رژێم دەستی بەجێبەجێکردنی پرۆسەی ئەنفال دژی گەلی کورد، کرد[٣١١].

- مەحمودی حاجی حەمەڕەش، هەڤاڵ و کادیرێکی دێرینی رێکخستنەکانی

سۆسیالیست بووه. رژێم لەرۆژی ٢٣/٨/١٩٩٠- سێ هەفتە دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە-، ناوبراو بۆ مەسەلەی مفاوەزات دەنێرێتە تۆکان، بۆ لای حسك، ئەوکات لەبارەگای سەرکردایەتی، تەنها محەمەد شاکەلی و محەمەدی حاجی مەحمود و مامۆستا سەعد عەبدوڵلا و سەید کاکە، لەوێ دەبن. لەرۆژی ٢٦/٨/١٩٩٠، بەئامادەبوونی هەر چواریان قسە لەگەڵ مەحمودی حاجی حەمەڕەش، دەکەن... بەڵام وا دیار بوو، رژێم هیچ بەڵێنێکی پێدا نەناردبوو، تەنها داوای ئەوەی کردبوو تەسلیم ببنەوە و حکومەت رێزتان دەگرێت... حزبی سۆسیالیست، داواکەیان رەت کردبۆوە... بەڵام ناوبراو گوتبووی: (حکومەت، بەزۆر، جارێکی تریش دەمنێرێتەوە لاتان)(٣١٢).

- دوا مفاوەزات، ئەوەی ئاشکرا ئەنجامدرا، مفاوەزاتەکەی دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی عێراق بوو.

لەهەموو ئەو پەیوەندی و نامە ناردن و مفاوەزاتانەدا، چونکە تاك لایەنانە بووینە، ئەگەر لایەنێك مفاوەزاتی کردبێت، ئەوا لایەنەکانی تر زۆر بێ رەحمانە، هێرشی راگەیاندنیان کردۆتە سەری و بە (جاش و خۆفرۆش و گەڕانەوە بۆ باوەشی رژێم و شۆڕشی چەواشە...) و دەیان ناو و ناتۆرەی تر، تاوانباری کردوون.. لایەنی مفاوەزات کاریش بەو موبەریراتانەی کەموفاوەزاتەکەی لەپێناودا کردووە، وەڵامی داونەتەوە. ئەو هێرشانە، بارگرژییەکانی زیاتر کردووە و شەڕی ناوخۆشی گەرمتر کردووە، کەئەمەش تاکە ئامانجی بەغدا بووە لەو مفاوەزاتانەدا.

٣- بەرزکردنەوەی دروشمی (روخاندنی رژێم): کاتێك کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەبەرەی (جوقد)دا بوو، لەژێر پاڵەپەستۆی سوریا و حزبە عەرەبییەکانی وەك: (حزبی بەعس- سەرکردایەتی هەرێمی عێراق)، دروشمی روخاندنی رژێمیان بەرز کردبۆوە. لەم کاتەدا، حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەرێگای گفتوگۆکردن لەگەڵ بەغدا، هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دەدا و بڕوای بەروخاندنی رژێم نەبوو. ئەم کاتە: یەکێتی، سۆسیالیستی بەوە تاوانبار دەکرد و دەیگوت: ئەو تاقمە- مەبەست لەسۆسیالیست بوو-،

دروستکراوی رژێمن و کرێگرتەن، هاکا گەڕانەوە باوەشی حکومەت، بۆیە باوەڕیان بەروخاندنی رژێم نییە. کەچی دوای مفاوەزاتەکەی (٨٣-٨٥)ی یەکێتی و حکومەت، ئەمجارەیان بارەکە پێچەوانە بۆوە. بەرەی جود، بەسۆسیالیستیشەوە، داوای روخاندنی رژێمیان دەکرد، کەچی یەکێتی لەگفتوگۆکردندا بوو لەگەڵ ئەو رژێمەی کەچەند مانگێك پێشتر بەنیازی روخاندنی بوو. یەکێتی وازی لەدروشمەکەی هێنابوو. بۆیە (بەگاڵتەپێکردنەوە لەزنجیرە وتارێکی رادیۆکەیاندا بەتەنزەوە دەیانگوت: عێراق بەئێمە ناڕوخێت و ئیشی ئێمە نییە مەگەر لەشکرەکەی حسك و پاسۆك لەخاڵص و حەمرینەوە هێرش بکات و حکومەتی عێراق بڕوخێنێ... یەکێتی، بۆ پشتگیریکردن لەهەڵوێستەکەی خۆیان ئەو نامانەیان بڵاوکردەوە کەسالح یوسفی لەپێش کۆنگرە بۆ سۆسیالیستی ناردبوو، لەوێ داوای مفاوەزات و ئاشتی دەکات، داوا دەکات ئەو دروشمە هەڵنەگرن، چونکە ئەوە ئیشی کورد نییە... نامەکان لەسەرکردایەتی سۆسیالیست لەناو جانتاکەی کاك رەسوڵ- لەپشت ئاشان-، گیرابوون... پاشان، ینك چاپ و بڵاوی کردەوە)[٣١٣].

٤- نوێنەری عەشایەر و کوڕە کوێخا: کەبزوتنەوە لەنیمچە بەرەی (یەکێتی)، دەرچوون، کادیر و بەرپرسە باڵاکانی کۆمەڵە کەبوونە هێزی یەکەمی ناو یەکێتی، هەمیشە رەخنەیان لەبزوتنەوە دەگرت و دەیانگوت: چەندین کوڕە ئاغا و دەرەبەگ و خەڵکی (سۆشیال عەشایەر) هەیە، هەموویان لەگەڵ بزوتنەوەن. ئەوان هەرچەندە خۆیان بەسۆسیالیست لەقەڵەم دەدەن، بەڵام بەپێچەوانەوە نوێنەرایەتی چینی عەشایەر و دەرەبەگ و کوڕە کوێخا و ئاغا دەکەن... دەیانگوت: خودی سکرتێری حزب (رەسوڵ مامەند)، کوڕە کوێخا و دەرەبەگە. لەبەرامبەر ئەم دەنگۆیانە، (سۆسیالیست)یش تەواو بەپێچەوانەوە دەیانگوت: کەزۆربەی هەرە زۆری سەرکردە باڵاکانی کۆمەڵە کوڕە ئاغا و شێخ و دەرەبەگن...

لەراستیدا، لەناو (بزوتنەوەی سۆسیالیست)، لەگەڵ ئەوەی کەخەڵکێکی باشی خوێندەوار لە (مامۆستا و دەرچووی کۆلیژ و ئەفسەر و...)یان لەگەڵدا

بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، ریزەکانی بێ بەری نەبوو لەکوڕە دەرەبەگ و خەڵکی نەخوێندەوار و عەشایەر. خودی (رەسوڵ مامەند) ئەوە نەبوو کەکۆمەڵە دەیانگوت ئەوەش نەبوو کەسۆسیالیست وەسفیان دەکرد. لەراستیدا، رەسوڵ مامەند، هەرچەندە کوڕە کوێخا بووە بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێت کەمرۆڤێکی سیاسی و خەباتگێڕ بووە، چ لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول، چ لەسەردەمی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێدا. لەهەردوو قۆناغەکەشدا، پەڵەیەکی ناشیرین، ئاوێنەی ژیانی تەڵخ نەکردووە. یەکێتیەکان، (بەکۆمەڵە و خەتی گشتی و خودی مام جەلالیشەوە)، دانیان بەوەدا ناوە کەلەناو ریزەکانیاندا خەڵکی باڵا دەست هەن و کوڕە ئاغا و دەرەبەگ و شێخ و کوێخان. یەکێتی هەمیشە رەخنەی لەحسك دەگرت کەئاغا و دەرەبەگ و عەشیرەتگەر و نەخوێندەوارن، (کەچی زۆر لەبەرپرسەکانی کۆمەڵە و پێشمەرگەکان کوڕە ئاغا و کوڕە دەوڵەمەند و کوڕە شێخ بوون)[٣١٤]. بۆ مەسەلەی رادەی تێگەیشتن و خوێندەواریشیان، (دەتوانم بڵێم لەسەدا حەفتای ئەندامانی کۆمەڵە کتێبێکیان نەخوێندبۆوە لەسەر بیری چەپ)[٣١٥]. بۆ هەبوونی خەڵك و باندی چەتە و رێگر لەناو هێزی پێشمەرگە و شۆڕشدا، کەس ناتوانێت نکوڵی لەبوونی ئەم جۆرە خەڵکە لەناو هەموو لایەنەکاندا بکات. بۆ پشت راستکردنەوەی ئەم بۆچوونە، کەسی یەکەمی ناو یەکێتی کەخودی (مام جەلال)ە، پاش ئەوەی لەسنوری مەڵبەندی یەك کێشە و ململانێ لەنێوان محەمەدی حاجی مەحمود و هەندێك لەسەرکردەکانی کۆمەڵە دروست دەبێت، کۆمەڵە لەلای مام جەلال شکایەت لەناوبراو دەکەن، بەڵام مام جەلال رەدیان دەداتەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە (من شۆڕش دەکەم، شۆڕش تەنیا بەئێوەی خوێندەوار بەئاکام ناگات، من پێویستم بەهێز و لەشکر هەیە، جوتیاران و عەشیرەتەکانیش، هێزی بنچینەی شۆڕشن... ئەم پۆخڵەوات و کەموکوڕییانەی ئێوە لەسەر هێزی پێشمەرگە بەگشتی و کاکە حەمە و پێشمەرگەکانی بەتایبەت باسی دەکەن و پێتان قبوڵ ناکرێن، لەنێو هێزەکانی کۆمەڵەدا و لای لێپرسراوەکانی کۆمەڵەش هەن)[٣١٦].

(حاجی مەمۆ)ش کەکەسایەتیەکی دیاری کۆمەڵە و دواتر (ئاڵای شۆڕش) بووە، لەو مونتەلەقەی (مام جەلال)ەوە، روو لەکەسی یەکەمی کۆمەڵە دەکات و دەڵێت: (... دڵنیام نەوشیروان لەهەمووان چاکتر بەوە ئاشنا بووە کەلەناو

قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی پێشمەرگەی خودی خۆیدا، چەندان ئاغا و باندی غەدر و چەتەیی هەبوون، کەهەموو چالاکی و کرداری پێشمەرگانەیان تەنیا ئازاردان و زوڵم لێکردن بووە بەسەر سەروەرییەکانی مرۆڤ و ئازاردانی جوتیارە زەحمەتکێشەکان، کەکەم و زۆر باسیان ناکات و ناویان ناهێنێ...)[٣١٧].

بەکورتی: هەموو لایەنەکان، ئەو تۆمەتانەی دەیاندایە پاڵ یەکتر و ناوی یەکتریان پێدەزڕاند، هیچ لایەنێکیان بێبەری نەبوون لەم جۆرە خەڵکانە و، پەرێزی هیچ لایەنێکیان پاکژ نەبووە، ئەمەش بەقسەی ئێمە نا، بەڵکو بەقسە و دانپیانانی سەرکردە باڵاکانی خۆیان.

**٥- ئۆتۆمبێل بردنی فەرمانگە حکومییەکان:** لەسەرەتای ساڵی (١٩٨١)ەوە، پێشمەرگەکانی سۆسیالیست، بۆ درێغی کردن، بەدەیان ئۆتۆمبێلی فەرمانگە حکومییەکانیان دەبرد و شۆفێرەکانیشیان ئازاد دەکردن... لەناوچە ئازادکراوەکان دا، بنمیچی ئۆتۆمبێلەکانیان دەبڕییەوە بۆ ئەوەی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەناکاو و بەسەر بۆسە و کەمین داکەوتن، زوو خۆیان دەرباز بکەن. لەم کاتەدا، سۆسیالیست لەدەشتی هەولێر، ریکۆردی شکاندبوو، (تەواوی هێزەکانی حسك لەدەو بەستی شەرغە بەو سەیارانە، بەئاشکرا و ئازادانە کار و چالاکییەکانیان ئەنجام دەدا)[٣١٨].

یەکێتی نیشتمانی کوردستان، زۆر جاران لەئیستگەکەیانەوە، گلەییان لەسۆسیالیست دەکرد و، ئەم کارەیان بەناڕەوا دەزانی، بەبیانووی ئەوەی ئەم ئۆتۆمبێلانە موڵکی حکومەت نین و موڵکی گشتین... بەم کردەوەیە، زیان بەخەڵك و هاوڵاتیان و بەرژەوەندی گشتی دەکەوێت، نەك حکومەت. لەم کاتەی ئەوان ئەم رەخنەیان دەگرت، پێشمەرگە و لێپرسراوەکانی خۆیان، لەم کارە نەدەپرینگانەوە. لەسەرەتای شەڕی عێراق و ئێران، هێزەکانی یەکێتیش چەندین شۆفەڵ و تەنکەری گاز و لاندکرۆزەری حکومەتیان بردبوو[٣١٩].

**٦- رفاندن و دەستگیرکردنی پسپۆڕ و خەڵکی بیانی:** بەسەدان پسپۆڕ و ئەندازیار و کارمەندی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان، لەدام و دەزگا و پڕۆژەی ئابوری و سەربازییەکانی حکومەت کاریان دەکرد و لەژێر چاودێری پۆلیس و سوپاوە،

دەسوڕانەوە. لەگەڵ ئەم پارێزبەندییەش، هێزەکانی سۆسیالیست چەندین جار، ئـەم جـۆرە خەڵکـەیان رفانـدووە، تاکـە مەبەستیـشیان، بـۆ پڕوپاگەنـدە و بڵاوکردنەوەیان لەراگەیاندنە جیهانییەکان بووە. بەم کارەیـان، ئـەو پەیامـەیان بەو دەوڵەتانە دەگەیاند، کە:

– لەدەڤـەرەکانی کوردسـتاندا، شۆڕشـێکی چـەکداری هەیـە و پێـچەوانەی پڕوپاگەندەکانی رژێم، ئەم ناوچەیە ئارام نییە.

– شۆڕشـی کـورد، شۆڕشـێکی رەوایـە، لـەپێناو هێنانـەدی ئامانجـەکانی نەتەوەی کورد، خەڵك بەو شاخانەوە کەوتوون. دەنـا ئـەوان ئەوەنـدە عەشـقی توندوتیژی و چەك و خوێن رشتن نین.

– پێویستە ئـەو پـسپۆڕ و کارمەندانـە ئـەم راسـتییە بـزانن و بـەرای گشتی وڵاتـەکانیان بگەیـەنن کـە پێـشمەرگە بانـد و گروپـی تیرۆریـستی نـین، ئـەوە حکومەتی عێراقە دان بەبوونی مافـەکانیان نانێـت. بۆیـە هەرچـی زووە دەبێـت ئەم حکومەتانە پەیوەندییە ئابووری و سەربازییەکانیان لەگەڵ عێراق بپچڕێنن و لەدامەزرانـدنی پـرۆژەی ئـابوری و سـەربازی، هاریکـاری حکومـەتی عێـراق، نەکەن.

**هێزەکانی حزبی سۆسیالیست، چەندین چالاکی لەم بابەتەیان ئەنجامداوە، بۆ نموونە:**

– لەرێکەوتی ١٩٨٢/١/١١، لەبناری قەرەچوغ، هێزێکی هاوبـەش لەهـەرێمی یـازدەی بـاواجی بەفەرمانـدەیی بـەکر حەمـە (مـەلا بـەکر) و هـەرێمی هەشـتی دەشتی هـەولێر بەفەرمانـدەی قـادر مـستەفا و هاریکـاری مـام غـەفور و سـەید عەبدوڵڵا کەردزی، لەنزیك گوێڕ، دوو خەبیری فەرەنسی و نائیب زابتێك و چـەند سەربازێك دەستگیر دەکەن. لەپێناو ئازادکردنیان، هێزێکی زۆری رژێـم لەسـوپا و جاش، بەپاڵپـشتی دوازدە کۆپتـەر، دەکەونـە کێومـاڵکردنی بەسـتی شـرغە و دەشتی کۆیە، (گونـدی نێـرەگێن، بانـەمورد، سـێکانیان، قەشـقە، بەردەسـپی، بناری باواجی). لەئەنجامـدا رووبـەڕووی هێزەکـانی (سۆسیالیـست و شـیوعی و یەکێتی)، دەبنەوە و زیـانێکی زۆریـان بەردەکـەوێت و نـاتوانن بەئامانجەکـەیان

(ئازادکردنی خەبیرەکان)، بگەن. بەدەست بەتاڵی و شکست خواردووییەوە، دەگەڕێنەوە. ئەم چالاکییە، دەنگدانەوەیەکی فراوانی لەراگەیاندنەکانی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان، دایەوە. بەتایبەتی لەئیستگەکانی: (لەندەن، مۆنتیکارلۆ). سەرەنجام بەنێوەندگیری د. عەبدولڕەحمان قاسملۆ، خەبیرەکان ئازاد کران و گەڕانەوە فەڕەنسا[٣٢٠].

لەبەرامبەر ئەم کارانەدا، یەکێتی دەیگوت: (ئەمە دژی بێگانەیە و کورد بەتیرۆریست دەناسرێن، لەسەر گرتنی مهەندیسە فەڕەنسی و بەریتانییەکان بەیانێکی دوور و درێژ و زەرەرەکانی بۆ کورد، هەمووی لەسەر سۆسیالیست بڵاو کرایەوە... کەچی دواتر یەکێتی بەخۆی مهەندیس و خەبیری دەگرت و بەپارە تەسلیم بەوڵاتەکانیانی دەکردنەوە... بۆ سەیارە بردنی حکومەتیش بەهەمان شێوە)[٣٢١]. نەك هەر دوای ئەم چالاکییەی سۆسیالیست یەکێتی خۆی دەستی بەئەنجامدانی ئەم جۆرە چالاکیانە کرد، بەڵکو زۆر پێشتر[٣٢٢]، کاری لەم شێوەیەی ئەنجامداوە، بەڵام بۆ بیانوو گرتن، ئەم رەخنانەیان لەسۆسیالیست گرتووە.

٧- کۆکردنەوەی باج و سەرانە سەندن لەگوندنیشن و دەوڵەمەندەکان: دوای ساڵی (١٩٧٦)، حکومەت دەستی کرد بەراگواستنی گوندە سنورییەکانی (عێراق- ئێران)، (عێراق- تورکیا). ئەو گوندنشینانەی لەدەوروبەری شارەکان، لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی خۆی، لەئۆردوگا زۆرەملێکان، کەخۆی ناوی نابوو (گوندی هاوچەرخ)، نیشتەجێ کردبوون. گوندنشینەکان، رەز و باخ و کێڵگە و پڕۆژەی جۆربەجۆریان هەبوو. حکومەت هەمووی خاپور کردن. کانیاو و سەرچاوە ئاوییەکانیشی چیمەنتۆڕێژ کرد. لەبری ئەوە، بڕە پارەیەکی وەك قەرەبوو، بەگوندنشینەکان دەدا. لەم کاتەدا، هێزەکانی پێشمەرگە، ئەو خەڵکانەیان ناچار دەکرد کە (بەخۆشی بێت یان بەزۆرداری)، بڕێك لەو پارەیەی کەوەریانگرتووە، بیدەنە شۆڕش و هێزی پێشمەرگە. ئەمە شتێکی نهێنی نەبوو، هەموو سەرکردە عەسکەری و سیاسییەکان دەیزانن. لەم سەروبەندەدا، بەرپرسەکانی کۆمەڵە، چونکە خۆشیان بەمحەمەدی حاجی مەحمود نەدەهات،

بەوەرگرتنی ئەم پارەیە، تاوانباریان دەکرد. سەرکردەیەکی عەسکەری کۆمەڵە، لەم بارەیەوە دەنووسێت: (دوای راگواستنی گوندەکان و قەرەبووکردنەوەیان لەلایەن رژێمەوە، یەکێتی بڕێك پارەی لەجوتیارەکان وەردەگرت بۆ شۆڕش. بەرپرسی ناوچە و رێکخستنەکانی پێشمەرگە کارەکانیان ئەنجامدەدا کەچی بۆ حەمەی حاجی مەحمود کرابوو بەعەیبە و رەخنە... سەرەڕای ئەمەش کەپارەکەش کۆدەکرایەوە، چەند بوو؟ چی لێدەکرا، چۆن سەرف دەکرا؟ ئەوە ئێمە نەماندەزانی)[٣٢٣]. رێژەی وەرگرتنی پارەکەش لای یەکێتی نیشتمانی کوردستان (٥٪) بوو[٣٢٤]. واتە گەر جوتیارێك (١٠) هەزار دیناری قەرەبوو وەربگرتایە، دەبوو (٥٠٠) دیناری بدابوایە یەکێتی. هەڵبەت حزبەکانی تریش، لەسنووری دەسەڵاتی خۆیان ئەم باج و سەرانەیان، لەخەڵك وەردەگرت. جگە لەمەش، (لەسەرەتای هەشتاکان، یەکێتی پسوولەی رەسمی کردووە و بۆ خەڵکە دەوڵەمەندەکانی ناردووە تاوەکو یارمەتی شۆڕش و یەکێتی بدەن. واتا، پارەیان لەدەوڵەمەندەکان دەستاند)[٣٢٥]. نەك هەر دەوڵەمەندەکان، بەڵکو یارمەتی و پارەیان لەو کارمەند و فەرمانبەرانەی دەوڵەت وەردەگرت کەلەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەکاندا بووینە. (لەناوچەی بازیان و قەرەداغ ئابۆنەیان بەزۆری لەو فەرمانبەرانە وەردەگرت کەفەرمانبەری حکومەت بووینە)[٣٢٦]. خەڵکێکی شرەخۆر، لەناو هێزی پێشمەرگە، سوودیان لەم بوارە وەرگرتبوو، زۆر جاران بەرێگای ساختە و تەزویرەوە، بێ ئاگاداری شۆڕش، پارە و سەرانەیان لەخەڵك وەردەگرت[٣٢٧].

ئەو یارمەتی و پیتاك کۆکردنەوەیە، سنووری ئاسایی خۆی بەزاندبوو، لەکاتی مفاوەزاتی یەکێتی و حکومەت لەکاتی گرتنی بێتواتە لەناوەڕاستی مانگی دەی ١٩٨٣، تەواو چووە خانەی تالان و دزی کردن. لەم بارەیەوە، رێباز دەنووسێت: (... راستە گوندەکان جاش بوون، بەڵام قەت نەدەبوو پێشمەرگە دەست بۆ تالان و برۆ، دەرگا لەرێسمە بردن ببات... ئەم گوندانە تا دوێنێ جێگای حەوانەوەی پێشمەرگە بوون... هەندێك لەوانە دۆست و ئەندامی ینك بوون... هەندێك لەپێشمەرگەکان هەڵسوکەوتی جاشانەیان دەکرد، زۆر بێ ئابڕوانە چاویان لەمافوور، مەڕ، بزن، مریشك، هێلکەی ئەو جوتیارانە بوو...

هەندێك لەپێشمەرگە و مەسئولەكان ئەو چەك و تەقەمەنیانەیان شاردەوە كەبەخوێنی چەندین پێشمەرگە دەست كەوتبوو... هەرچەندە سەركردایەتی شۆڕش ماوەیەك خۆی توڕە و توند كرد و وەعدی دا ئەو پاتەخۆر و بێ ئابڕوانە سزا بدات كەچی پاش ماوەیەك وەكو هەمیشە دیزە بەدەرخۆنە كرا)[٣٢٨]. ئەم كارانە نەك هەر یەكێتی دەیكرد و كردوویەتی، بەڵكو هێزەكانی تریش لەحزبەكانی ناو بەرەی جود[٣٢٩]، بەسۆسیالیستیشەوە لەم كارانەدا نەدەپرینگانەوە، پێشمەرگە و كادیر و فەرماندەكانی ئەوانیش دانیان بەمەدا ناوە و دەستیان تێدا هەبووە. گرفتەكە لێرەدایە یەكێتی ئەوكات هەر سۆسیالیست و هێزەكانی تری بە (باج كۆكەرەوە، دەواجینانە، راو و رووتكەر، دز و جەردە، پارە بەزۆر لەخەڵك سەندن...تاد) تاوانبار دەكرد و، لەراگەیاندنەكانیدا، لێی لەهەڵلا دەدان، وەك ئەوەی (بانێك و دوو هەوا) بێت.

٨- **ناو و ناتۆرە بۆ یەكتر داتاشین و یەكتر سووك كردن:** لەم رووەوە، هیچ لایەنێك رەحمی بەلایەنەكەی بەرامبەری نەكردووە، لەبەكارهێنانی وشەی ناشیرین و قێزەون، نەپرینگاونەتەوە. كەچی هەر ئەم هێزانە، دوای ئەوەی كەئاشتبوونەتەوە، هەر لەراگەیاندنەكانیانەوە، بەشان و باڵی یەكتریان هەڵداوە و بەیاننامە و جوێننامەكانی رابردوویان بیرچۆتەوە. هەندێك لەم نموونانە:

- یەكێتی حزبی شیوعی بەتەحریفی، راستڕەو، كلكی قیادە موەقەتە، پاشكۆی سۆڤیەت، لادەر لەرێبازی ماركسی، ناودەبرد. پارتی، بەجاشی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت و عەشایەر و بنەماڵە و پاسدار موەقەتە تاوانبار دەكرد.

سۆسیالیستی بەهێز و تاقمێكی دروستكراوی رژێم و گومانلێكراو لەقەڵەم دەدا و بەتاقمە سەرلێشێواوەكەی (رەسوڵ- جووجەڵە)، جاشی قیادە موەقەتە، ناوی دەبردن. سەری زمان و بنی زمانیان: (تاقمی شڕەخۆر و جووجەڵە رەسوڵیەكان)[٣٣٠]، بوو. بە (پاسۆك)یان دەگوت: شەلاتیەكانی سلێمانی، بكوژەكانی كونەماسی، جەماعەتی مەنجەڵێك دۆڵمە. هەروەها دەیانگوت: پاسۆك چەند كەسێكی چەقۆ وەشێن و ژمارەیان ئەوەندە كەمە، هەموویان كۆبكەنەوە بەیەك مەنجەڵە دۆڵمە تێر دەخۆن.

لەبەرامبەر ئەم ناو و ناتۆرە بەخشینەوە، هێزەکانی (جود)یش بە (یەکێتی)یان دەگوت: (جاش جەلالییەکان، جاشە عەقائیدییەکان، موخابەراتی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت، شەست و شەشەکان، پۆلپۆتەکان،...تاد).

ئەم تۆمەت و بیانوو دانەپاڵ یەکتری و جوێن بەخشینانەوە، لەپرۆسەی ئاشتی و پێکهاتنەوە و بەیەکەوە هەڵکردن، دوورتری دەخستنەوە و، کڵپە و بڵێسەی ئاگری شەڕی ناوخۆی توندوتیژ و گەشتر دەکرد، رق و قینی ئەندام و هەوادارانیان بەرامبەر بەیەکتری، زیاتر دەکرد. لەبەرامبەر ئەمەشدا: رژێم و نۆکەرەکانی، دڵخۆش و ئاسوودە و، خەڵکی رەش و رووت و نیشتیمانپەروەری کوردییان، هەناسە سارد و بێ هیواتر دەکرد.

## ٨- رۆڵی گوندنشینان لەشۆڕشی نوێدا

جوتیار و گوندنشینەکانی کوردستان، بەدرێژایی مێژوو و شۆڕش و سەرهەڵدان و راپەڕینەکانی گەلی کورد، هەمیشە کوانوو بووینە و رۆڵی بەرچاویان لەبەرەو پێش چوون و بەردەوامبوونیان، هەبووە... لەهەموو قۆناغەکانیشدا، ئەوان زەرەرمەندی پلە یەك بووینە. دێهاتەکانیان، سووتاو و وێرانکراون.ماڵیان بەتاڵان براوە. رەز و باخ و کێڵگە و تەبارەی گەنم و جۆیان، سووتێندراوە... کانیاو و سەرچاوە ئاوییەکانیان، تەقێندراونەتەوە. لەسەر حەواندنەوە و ناندان و میوانداریکردنی پێشمەرگە، تووشی دەیان کێشە و گرفت و گرتن و ئەشکەنجەدان، بووینەتەوە.

هەموو گوندەکان بەگشتی، بەتایبەتیش ئەوانەی کەوتبوونە ناوچە ئازادکراوەکان، باری قورسیان کەوتبووە سەر شان... ئەوان، (لەشۆڕشی نوێی گەلەکەمان و گەشەپێدان و حەوانەوە، نان پێدان، دەنگوباس گەیاندن، رێنمایی کردن، شاردنەوەی بریندار و کۆمەك گەیاندن، ئەوە هەموو جوتیارە سەربەرزەکانی ولاتەکەمان گرتبوویانە ئەستۆ... هەڵوێستی جوامێرانەیان هەبوو بەتایبەتی عەشیرەتەکانی مەنتك، مام سار، خەیلانی، شێخ مەموندی، هەرکی، لەناو ئەمانەدا مەنتکە مەڕدارەکان، زستانان لەکۆتانەکانی دەشتی هەولێر و ولاتی کۆیە و زنجیرە شاخی بناری باواجی... لەناو تاوڵ و

رەشماڵـەکانیان پێـشمەرگەکانیان دەخەوانـد. نەیاندەهێـشت پێـشمەرگەکان حەرەسیات بگرن، بەڵکو خۆیـان حەرەسـیاتیان لێدەگرتن و پێشمەرگەش زۆر لێیـان دڵنیـا بـوون کەبـەهیچ جۆرێـك جاسووسـیان بەسـەر پێـشمەرگەوە نەدەکرد)[٣٣١]. لەزۆر حاڵەتیشدا، لەکاتی هێرش و پەلاماری هێزەکانی رژێـم بـۆ سـەر ناوچـەکانیان، ئـەوان بەچـەك و تەقەمـەنی تایبـەتی خۆیـان، وەك هێـزی پـشتیوان، شـان بەشـانی پێـشمەرگەکان، دژی ئـەو هێزانـە دەجـەنگان و قوربانیشیان دەدا.

پێشمەرگەکان، کاتێـك کـەبۆ ئەنجامـدانی چـالاکییەك دەچـوون، زۆر جـاران ئۆتۆمبێـل و تراکتـۆری گوندنـشینەکانیان بـەکاردەهێنا، خاوەنەکانیـشیان، بەمەجبوری بەگەڵیان دەکەوتن و زۆر جارانیش بەسەر کەمین و هێزەکانی رژێـم لەجاش و سوپا دەکەوتن و، دەبوونە قوربانی... چونی ئـەوان، ئەگـەر هەنـدێك جاریش بەویستی خۆیان بووبێت، ئەوا بەشی زۆریـان لـەژێر گوشـار و هەڕەشـە رازی دەبـوون و دەبـردران. کەلەئەنجامـدانی چالاکییەکانیـشیان دەگەڕانـەوە، جـارێکی تـریش دەبوونـەوە میـوانی گوندنـشینەکان، (لەهـەر مـاڵێکیش نـانێ ئێوارەیان دەخوارد، داوای دوو ژەمـی بـەیانی و نیوەڕۆشیان دەکـرد... ئەگـەر ئەو کاتەی کەلەماڵەکاندا بڵاو دەبوونەوە، شـەوەکەی سـارد بووایـە، هەریەکـەو پێخەفێکیشی لەماڵەکە داوا دەکرد و بەرەو مزگەوتی دێیەکە دەچوون)[٣٣٢].

هـەموو گونـدەکان، بەرێـژەی جیاجیـا، ئـەم ئەرکـە ترسـناك و قورسـەیان کەوتبووە سەر شان. کەباسی گوندێك دەکەین و بەنموونە دەیهێنینەوە، مانـای ئەوە نییە دەڤەر و گوندەکانی تری کوردستانمان لـەیاد کردبێـت. کـەناوی هـەر گونـدێك دێـنین، ئـەوە گوزارشـتە لەبەشـی زۆری گونـدەکانی کوردسـتان. (نێـرەگێن)، گوندێکـە و سـەر بەناحیـەی (دێگەڵـە)ی نێـوان هـەولێر و شـاری (کۆیە)یە. کەوتۆتـە سـەر بەسـتی شـەرغە. ئـەم گونـدە لەسـەرەتای شۆڕشـی ئەیلولەوە تـا دەگاتـە شۆڕشـی نـوێ، چـەندین جـار سـووتاوە و وێرانکـراوە... (بەدرێژایی شۆڕشی نوێ، پێشمەرگە دەچوونە گوندەکانی قـەراج و کەنـدێناوە، لەگەڕانەوەیانـدا لـەم گونـدە پـشوویان دەدا و نانیـان دەخـوارد... کەلـەدۆڵی خۆشناوەتیش دەهاتن، لەم گوندە پشوویان دەدا و دەمانەوە)[٣٣٣].

سەرەڕای پێشکەشکردنی ئەم هەموو خزمەت و ئەرك كێشانە، ئینجا زۆر جاران، بەهۆی فكر و بیروڕای جیاوازەوە، لەلایەن پێشمەرگەكانیشەوە، ئازار و ئەشكەنجە دەدران، بەتایبەتیش لەسەردەمی شەڕی ناوخۆدا. هەموو گوندنشینەكان سەر بەیەك حزب نەبوون، هەیانبوو سەر بەحزب و رێكخراوێكی دیاریكراو بووە، هەشبووە هیچ وابەستەیەكی حزبی و رێكخراوەیی نەبووە، بەڵكو تەنها هەواداری ئەم لایەنە بووە، لەپای ئەوەوە لەلایەن پێشمەرگەكانی حزبی ركابەرەوە، تووشی ئەشكەنجە و ئازاردان بۆتەوە. بۆ نموونە: (حاجی سەعیدی گوندی نێرەگێن گوایا لایەنگیر و هەواداری یەكێتی بووە، پاش شەڕەكەی شەوی ١١-١٢/١/١٩٨٣، پێشمەرگەكانی حزبی سۆسیالیستی كوردستان دەیگرن و ئەشكەنجەی زۆری دەدەن، بەو بیانووەی كەناوبراو رێنوێنی بۆ هێزە هێرشبەرەكەی یەكێتی كردووە... شایانی باسە، ماڵەكەی ناوبراو، هەردەم پڕ بووە لەپێشمەرگەی هەموو لایەنەكان.. ئەو پیاوێكی بەتەمەن و ریش سپی بووە، جوتیارێكی هەژار و ماندوو بووە. بەرەنجی شان و ئارەقەی نێو چەوانی خۆی بژێوی ماڵ و منداڵەكانی پەیدا كردووە... پێشمەرگەكان، نانەكەشیان لێدەخوارد، ئەوجا ئازاریشیان دەدا...)(٣٣٤).

پشكۆ نەجمەدین، زۆر بەویژدانانە، باس لەژیان و ئەرك كێشانی گوندنشینانی كوردستان دەكات و بۆ مێژوو دەنووسێت: (چەند گوناه بوون، ئەو خێزانە جوتیارانەی نەیاندەتوانی ژەمێك بەتەنیا بۆ خۆیان پێكەوە نان بخۆن، پاش ماندوو بوونی رۆژانە، پێكەوە رابكشێن و وەنەوزێك بدەن. چ سەخت بوون ئەو زستانە شەوانەی لەدەرگای ماڵانمان دەدا و لەشیرینی خەودا، تازە زاوایەكمان لەئامێزی نۆبووك دەردەكێشا و بۆ تاقیكردنەوەی مەترسی رێگا، وەپێش خۆمان دەخست. من هەمیشە لەتوانا و حەوسەڵە و خۆڕاگری خەڵكی گوندەكانی كوردستان سەرسام بووم. ئەو خەڵكە چ وزە و توانایەكیان هەبوو!)(٣٣٥).

لەدرێژەی رۆژان و قۆناغەكانی شەڕی ناوخۆشدا، ئەو كاتەی كەبراكان، كەوتبوونە گیانی یەكتر و دوژمنی سەرسەختی خۆیان لەیاد كردبوو، لایەنی بەرامبەریان بەدوژمنی ژمارە یەكی خۆیان حسێب دەكرد، ئەو كاتانە،

جوتیارەکان، سەرەڕای خەم خواردن و ئازارکێشان، هەمیشە سەرکۆنەیان دەکردن و داوای تەبایی و یەك ریزییان لێدەکردن. پشکۆ دەنووسێت: (من لەماوەی دە ساڵی پێشمەرگایەتی خۆمدا، تەنیا یەك جوتیارم نەبینی بەلایەنگیرانی یەکێتیشەوە، کەلەدڵەوی شەڕی قیادە موەقەتە و پاشتریش لایەنەکانی دیکەی نێو بزوتنەوە چەکدارییەکەیان پێ خۆش بێت)[٣٣٦].

ئەگەر جارێکیش لێپرسراو یان فەرماندەیەکی پێشمەرگەش بەویژدانەوە باسی ئەم ماندووبوون و ئەرك کێشان و ئەشکەنجەدانی گوندنشینان لەلایەن پێشمەرگەوە کردبێت، ئەوا لەلایەن حزب و رێکخراوەکانیانەوە تووشی لێپرسینەوە و سزادان و دوورخستنەوە، بوونەتەوە[٣٣٧].

## أ- گۆڤار و رۆژنامە:

### ١- پێشمەرگە- دەنگی پێشمەرگە:

گۆڤاری هێزی پێشمەرگەی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق). لەژێر دروشمی: (کوردستان یان نەمان)دا، دەرچووە. چەند ژمارەیەکی سەرەتایی بەناوی (پێشمەرگە) دەرچووە. دواتر بۆتە (دەنگی پێشمەرگە). یەکەم ژمارەی لەمایسی ١٩٧٩دا، دەرچووە. ژمارە (٢)ی لەحوزەیرانی ١٩٧٩دا، دەرچووە. ژمارەکانی (١،٢)ی لەئەرشیفی (مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان لەبەرلین)، پارێزراون. ژمارە (٦)ی لەتەموزی ١٩٨٠دا، دەرچووە. ئەم ژمارەیە، لەدەزگای چاپ و راگەیاندنی حزبی شیوعی عێراق، بەرۆنیۆ چاپ و بڵاو کراوەتەوە[٣٣٨]. ژمارە (٢٨)ی ساڵی پێنجەم، قەبارە (١٧×٢١سم)، ٢٠ لاپەڕە، لەشوباتی ١٩٨٣دا، دەرچووە. ژمارە (٣١)ی دوا ژمارەیە و لەکانوونی یەکەمی ١٩٨٦دا، دەرچووە. قەبارەکەی (A5) بووە. گرنگی بەبڵاوکردنەوەی هەواڵ و چالاکیەکان و دەنگوباسی پێشمەرگە و بابەتی پەیوەندیدار بەکاروباری عەسکەری، داوە. بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی) دەرچووە.

ئەم دوو دروشمە لەسەر بەرگی ژمارە (٢٨)دا نووسراوە: یەکەم- (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان). دووەم- (خەبات دەکەین دژی ئیمپریالیزمی جیهانی وەلەسەرووی هەموویانەوە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا، زایۆنیزم و کۆنەپەرستی). لەسەر بەرگی ئەم ژمارەیەدا، (نرخی "١٠٠" فلسە) نووسراوە.

ئێندێکسی ژمارە (٢٨):

- سەروتار: دەبێ پلانی شەڕی ناوخۆ گۆڕ بکرێ، ل١.
- رۆڵی بەرگری میللی لەشۆڕشدا، رێبوار عەبدولڕەحمان، ل٣.
- لەرۆژژمێری پارتیزانێکدا، شێروان شێروەندی، ل٦.
- چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کادرێکی پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا،

پەیامنێری دەنگی پێشمەرگە، ل٧.

- زایۆنیزم ترسناکترین دوژمنی سەربەستی و سەربەخۆیی گەلانە، وەرگێڕانی: ئاسۆ، ل١١.
- نامەیەك بۆ ئافرەتە سۆسیالیستەکان، شەهید سۆران (عەبدوڵلا کوێستانی)، ل١٥.
- ئەدەب و شۆڕش: ئاوازێکی نیوەچڵ، پێشکەشە بەیادی سێ ساڵەی شەهیدبوونی سەید سەلیم، شیعر، زرار جۆلا، ل١٧.
- ئاگادارییەك دەربارەی بڵاوبوونەوەی چەند بەلاغێکی عەسکەری، ل١٨.
- پۆستەی (دەنگی پێشمەرگە)، ل١٩.
- کاروانی شەهیدان: شەهیدی نەمر خالید مستەفا سێکانیانی، لەبەرگی دواوە (دیوی ناوەوە)ی گۆڤارەکەدا، بڵاوبۆتەوە.
- بەیاننامەی لیژنەی بەرەی نیشتمانی دیموکراتی لەپارێزگای هەولێر، لەبەرگی دواوە (دیوی دەرەوە)ی گۆڤارەکەدا، بڵاوبۆتەوە.

دەنگی پێشمەرگە، لەحوزەیرانی ١٩٨٤ تاوەکو تەموزی ١٩٨٥، ماوەیەك دەوەستێت، لەشوێنی ئەو، گۆڤاری (پەیامی شۆڕشی کوردستانی عێراق) دەرچووە. پاش وەستانی (پەیام)، دەنگی پێشمەرگە، دووبارە دەرچۆتەوە.

## ٢- ڕێگای ئازادی:

ئۆرگانی ناوەندی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق). یەکەم ژمارەی بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (A4)، لە ١٩٨١/٥/٢٥دا، دەرچووە. ژمارە (١)ی لەدوو چاپی جیاوازدا لەیەك کاتدا، بەکوردی و عەرەبی، دەرچووە. بابەتەکانی ئەم ژمارەیە، زێتر تایبەت بوون بەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی یەکەم کۆنگرەی حزب لە (١٢-١٥/٥/١٩٨١).

ژمارە (٦٥)ی لەئاداری ١٩٩٠دا، دەرچووە. ژمارە (٦٨)، دوا ژمارە بووە کەلەشاخ دەرچووبێت. یەکەم ژمارەی دوای (ڕاپەڕین)ی، ژمارە (٦٩) بووە کەبە (٨) لاپەڕەی قەبارە گەورە (٣٣,٥×٤٦سم)، لەتەموزی ١٩٩١دا، دەرچووە. ژمارە (٦٩)ی لەهەولێر و بەئاشکرا، بەتیرازێکی زۆر، بەشێوەیەکی

هونەری ڕێك و پێك، لەچاپخانەی (ڕۆشنبیری سەر بەئەمینداریەتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی سەردەمی ڕژێم)، چاپ و بڵاوکراوەتەوە. ئەم ژمارەیە: بەیەکەم ڕۆژنامە: (لەرووی هونەری چاپ و تیراژ و قەبارە)وە، دوای ڕاپەڕین دەژمێردرێت. هەر ئەم ژمارەیە لەبەر خواستی زۆری خەڵك، جارێکی تر چاپ کراوەتەوە. ئەم ژمارەیە و چەند ژمارەیەکی دوای ڕاپەڕین، لەلایەن ڕۆژنامەنووس (شێرزاد شەریف شێخانی)یەوە سەرپەرشتی کراوە. ژمارە (٧٠)ی لەئەیلولی ١٩٩١دا دەرچووە. ژمارە (٧١)ی لەتشرینی یەکەمی ١٩٩١دا دەرچووە. ژمارە (٧٢)ی لەتشرینی دووەمی ١٩٩١دا، دەرچووە ژمارە (٧٣)ی لەکانوونی یەکەمی ١٩٩١دا، دەرچووە. ژمارە (٧٤)ی لەکانوونی دووەمی ١٩٩٢دا، دەرچووە. ژمارە (٧٥)ی لەئاداری ١٩٩٢دا دەرچووە. ژمارە (٧٦)ی لەنیسانی ١٩٩٢دا، دەرچووە. ژمارە (٧٧)ی لەتشرینی یەکەمی ١٩٩٢دا، دەرچووە. ژمارە (٧٨)ی دوا ژمارە بووە و لەتشرینی دووەمی ١٩٩٢دا، دەرچووە.

لەمە بەدواوە، ئەو باڵەی کەلەکۆنگرەی یەکگرتنی هەرسێ حزبەکە (سۆسیالیست، گەل، پاسۆك)، کەبەباڵی ڕەسوڵ مامەند، ناسراو بوون، دەرچوون و کۆنگرەی دووەمی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)یان، لەرانیە بەست، دواتر لەشوباتی ١٩٩٣دا، چوونەوە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان. (محەمەدی حاجی مەحمود)یش، دوای یەکگرتنی (حزبی یەکگرتنی کوردستان) لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، بەچەند هەفتەیەك دواتر، لەپارتی دەردەچێت و دووبارە (حزبی سۆسیالیستی کوردستان) ڕێك دەخاتەوە. لەژێر ناوی ئەم حزبە ڕێکخراوەوە، ڕێگای ئازادی ژمارەکانی (٧٩، ٨٠، ٨١، ٨٢، ٨٣، ٨٤، ٨٥، ٨٦)ی لێدەردەچێت. هەندێك لەم ژمارانە بەرەنگی ڕەش و سپی بەفۆتۆکۆپی، چاپ و بڵاوکراونەتەوە.

ژمارە (٨٦)ی دوا ژمارە بووە کەبەناوی (ڕێگای ئازادی)یەوە دەرچووبێت و لەحوزەیرانی ١٩٩٤دا، دەرچووە.

لەسەردەمی شاخ، مامۆستا (سەعد عەبدوڵڵا)، لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندنی حزب بووە. هەروەها ئەم کادیر و پێشمەرگانەی حزب، کاریان لە

(ڕێگای ئازادی)دا، کردووە:

- لە (١٩٨١- ئابی ١٩٨٥): ئاسۆ حەسەن، ڕێبوار عەبدولڕەحمان، مامۆستا دارا (محەمەد عومەر دۆڵەبەکرەیی)، شێرکۆ، عەبدوڵڵا قەرەداغی، عەبدوڵڵا ئیسماعیل (مامۆستا فەرەیدون).
- لەکۆتایی (١٩٨٥- ڕاپەڕین ١٩٩١): عەبدوڵڵا قەرەداغی، شێرکۆ، ئاری کاکەیی، مەریوان فەتحی (مامۆستا جەمال)، شێرزاد شێخانی.
- لەدوای ڕاپەڕینەوە، تا هەڵوەشاندنەوەی حزب، ئەم نووسەر و ڕۆژنامەنووسانە، وەك سەرپەرشتیار و دەستەی نووسەران، کاریان تێدا کردووە: (شێرزاد شێخانی، عەبدوڵڵا قەرەداغی، ئاسۆ حەسەن، ئیسماعیل تەنیا، برزۆ عەلی هەژار، مستەفا پەژار، عەباس عەبدوڵڵا یوسف).
- ڕێگای ئازادی، تا کۆتایی ساڵی سێیەمی، (١٩) ژمارەی لێدەرچووە. لەهەر ساڵێکی تازەی دەرچوونیدا، لەزنجیرەی ژمارە یەك (١)ەوە، دەستی بەدەرچوون کردووە. لەسەرەتای ساڵی چوارەمی دەرچوونیدا (کانوونی دووەمی ١٩٨٤)، زنجیرەی ژمارە (٢٠)ی وەرگرتووە. لەمە بەدواوە، پەیڕەوی ئەوە نەکراوە کەلەهەر ساڵێکی تازەی دەرچوونیدا زنجیرەی ژمارە (١)ی پێبدرێت.

ژمارەکانی شاخ، بەهەردوو ڕەنگی ڕەش و سوور دەرچووینە. تەنها مانشێتەکان بەڕەنگی سوور نووسراون، نرخی ژمارەکانی (١٠٠) فلس بووە.

- بۆ زانیاری زیاتر، ئەو ژمارانەی کەلەسەردەمی شاخ دەرچووینە و لەئەرشیفی بەندە (ئیسماعیل تەنیا)، پارێزراون، بۆ پاراستن و وون نەبوونیان، لێرەدا پۆلینیان دەکەم:
- ژمارە (٨)، ساڵی دووەم، حوزەیرانی ١٩٨٢، ٤ ل.
- ژمارە (٩)، ساڵی دووەم، ئابی ١٩٨٢، ٦ ل.
- ژمارە (١٠)، ساڵی دووەم، ئەیلولی ١٩٨٢، ٦ ل.
- ژمارە (١١)، ساڵی دووەم، تشرینی یەکەم و تشرینی دووەمی ١٩٨٢، ٦ ل.
- ژمارە (١٢)، ساڵی دووەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢، ٦ ل.
- ژمارە (١)، ساڵی سێیەم، کانوونی دووەمی ١٩٨٣، ٦ ل.

- ژماره (٢)، ساڵی سێیەم، شوباتی ١٩٨٣، ٦ ل.
- ژماره (٣)، ساڵی سێیەم، ئازاری ١٩٨٣، ٨ ل.
- ژماره (٥)، ساڵی سێیەم، ئابی ١٩٨٣، ١٠ ل.
- ژماره (٧)، ساڵی سێیەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٣، ٨ ل.
- ژماره (٢١)، ساڵی چوارەم، شوباتی ١٩٨٤، ١٠ ل.
- ژماره (٢٢)، ساڵی چوارەم، ئازاری ١٩٨٤، ٨ ل.
- ژماره (٢٣)، ساڵی چوارەم، نیسانی ١٩٨٤، ١٠ ل.
- ژماره (٢٤)، ساڵی چوارەم، ئایاری ١٩٨٤، ٨ ل.
- ژماره (٢٦)، ساڵی چوارەم، ئابی ١٩٨٤، ١٠ ل.
- ژماره (٢٧)، ساڵی چوارەم، تشرینی دووەمی ١٩٨٤، ٨ ل.

ئەو ژمارانەی کەپۆلینمان کردوون، هەموویان لەژێر دروشمی (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی راستەقینە بۆ کوردستان)دا، دەرچوون.

## ٣- سۆسیالیست

گۆڤارێکی تیۆریە، حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی)، دەریدەکات. یەکەم ژمارەی لەناوەڕاستی ١٩٨١دا، دەرچووە.

- ژماره (٣)ی ساڵی دووەم، (٤٠) لاپەڕەیە، قەبارە (١٧×٢١سم)، لەمانگی ئابی ١٩٨٢دا، دەرچووە. نرخی (٢٥٠) فلسە.
- ژماره (٤)، ساڵی دووەم، (٤٦) لاپەڕەیە، قەبارە (١٧×٢١سم)، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢.
- ژماره (٦)، ناوەڕاستی تشرینی دووەمی ١٩٨٣.
- ژماره (٧)، ساڵی چوارەم، (٥٢) لاپەڕە، قەبارە (١٧×٢١سم)، ئازاری ١٩٨٤.
- ژماره (٨)، ساڵی چوارەم، (٤٤) لاپەڕە، قەبارە (١٧×٢١سم)، کانوونی یەکەمی ١٩٨٤.
- ژماره (٩)، ساڵی ١٩٨٦.

- ژمارە (١١)، ساڵی شەشەم، حوزەیرانی ١٩٨٧.
- ژمارە (١٤)، ساڵی حەوتەم، قەبارە (١٧×٢١سم)، تشرینی دووەمی ١٩٨٨.
- ژمارە (١٦)، ساڵی نۆیەم، ئاداری ١٩٩٠.
- ژمارە (١٧)، دوا ژمارە بووە، لەتشرینی یەکەمی ١٩٩٠دا، دەرچووە. لەمە بەدواوە وەستاوە.
- (رەسوڵ مامەند، سەعد عەبدوڵڵا، عادل موراد، عەدنان موفتی، ئاسۆ حەسەن، رێبوار عەبدولڕەحمان، دارا، هەڵمەت، محەمەد شاکەلی، کامەران قادر شۆڕش، عەبدولرەزاق مەرزەنگ، ئیسماعیل تەنیا، عەباس عەبدوڵڵا یوسف، شێروان محەمەد،...تاد)، بەرهەمیان تێدا بڵاوکردۆتەوە.
- لەزۆربەی ژمارەکانیدا، یەك دوو لاپەڕەی کۆتایی، بابەتی بەزمانی عەرەبی، تێدا بڵاوکراوەتەوە.

* ئیندێکسی چەند ژمارەیەك:
* ژمارە (٣)، ساڵی دووەم، ئابی ١٩٨٢:

- کورتە باسێك دەربارەی تیئوری شۆڕشگێڕی، ب. گۆران (سەعد عەبدوڵڵا)، ل١.
- سەرمایەداری لەبەردەم هەژانی نوێ دا، هەڵمەت، ل١١.
- نووسراوێك بۆ شاعیری فەلەستینی (سمیع القاسم)، شێروان محەمەد، ل٢٥.
- عومان مەڵبەندی نۆکەرایەتی ئیمپریالیزمی جیهانی، سۆسیالیست تەرجەمەی کردووە، ل٢٦.
- کوبا دورگەی شۆڕش و ئازادی، سۆسیالیست تەرجەمەی کردووە، ل٣٢.
- چەوساندنەوە، سۆسیالیست، ل٣٤.
- راپەڕینی ئازادیخوازانەی ئافرەتانی جیهان، ل٣٥.

* ژمارە (٤)، ساڵی دووەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢:

- چەند سەرنجێك دەربارەی پێشڕەو، ب. گۆران (سەعد عەبدوڵڵا)، ل١.
- لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ وجودیەت، خلف (شێخ محەمەد شاکەلی)، ل١٢.
- شیلی رژێمی تیرۆر و داپڵۆسین، ل٢٠.
- چین، فەرهەنگ، ل٣٠.

- هێرشی رژێمی زایۆنی بۆ سەر لوبنان بەشێکە لەستراتیژی فراوانی ئەمەریکا لەناوچەکەدا، نووسینی: ن.ك، تەرجەمە: کامەران، ل٣١.
- دەوری لاوان لەشۆڕشی گەلەکەماندا، ئاسۆ (ئاسۆ حەسەن)، ل٤٠.
- کێشەی بێکاری لەجیهانی سەرمایەداریدا، ل٤٤.

* ژمارە (٧)، ساڵی چوارەم، ئازاری ١٩٨٤:

- قۆناغێکی تازە لەبزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کورد و لەدایکبوونێکی نوێ، حیکمەت (رەسوڵ مامەند)، ل١.
- چەپی توندڕەو لەژیانی سیاسی رۆژهەڵاتدا، سۆسیالیست، ل١٠.
- خوارووی ئەفریقیا رووبەڕووی دوژمنکارییەکان دەبێتەوە، وەرگێرانی لەعەرەبیەوە: هەڵمەت، ل١٩.
- ئاژانسی موخابەراتی ئەمەریکا (CIA) لەسەردەمی رێگان، نووسینی: تیسرنس کانوون، تەرجەمەی: ب. ئامانج (سەعد عەبدوڵلا)، ل٣٠.
- ئیعلامی فاشیستەکان، ئاسۆ حەسەن، ل٣٦.
- چەند سەرنجێك دەربارەی کێشەی کوردستان و عێراق و پێداویستی ئەمڕۆی، رێبوار (رێبوار عەبدولڕەحمان)، ل٤٠.
- ئیمپریالیزم، سۆسیالیست، ل٤٧.
- عن الادب والفن والسياسه، سیروان (عەباس عەبدوڵلا یوسف)، ل٥٠.

* ژمارە (٨)، ساڵی چوارەم، کانوونی یەکەم ١٩٨٤:

- پەیوەندی ئۆرگانیزمی شۆڕشی رزگاری نیشتمانی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، ب. گۆران (سەعد عەبدوڵلا)، ل١.
- پۆلۆنیا لەدەمی مار هاتە دەر، ئامادەکردنی: عەبدولڕەزاق مەرزەنگ، ل٨.
- گەلی کورد و تاقیکردنەوەی حوکمی زاتی، ئامادەکردنی: م. بەختیار، ل١٥.
- ئەزموونی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان و رێگای گەشەسەندنی ناسەرمایەداری، ئامادەکردنی: شاهین، ل٢٣.
- پەرەسەندن و قووڵ بوونەوەی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی، ئامادەکردنی: کامەران شۆڕش، ل٢٩.
- فەرهەنگی سیاسی: دیموکراتی شۆڕشگێڕ، ل٣٦.

- الماركسية والادب والفن، بقلم: ل.ج، ل٣٧.
- التوجه الاشتراكي هو طريق الى التقدم الاجتماعي، اعداد: اشتى (عادل مراد)، ل٤٢.

## ٤- طريق الحرية:

ئۆرگانی ناوەندی حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق. بەزمانی عەرەبی لەدەرەوەی وڵات لەسوریا (دیمەشق) دەرچووە. عادل موراد، عەدنان موفتی، عەبدولخالق زەنگەنە، سەرپەرشتی دەرچوونیان کردووە. یەکەم ژمارەی بە (١٢) لاپەڕەی قەبارە (A4) لەتەموزی ١٩٨٢دا دەرچووە. لەم ژمارەیەدا: چەندین وتار و دەنگ و باس و هەواڵەکانی حزبی لەناوەوە و دەرەوەدا تێدا بڵاوکراوەتەوە. لەلاپەڕەی یەکەمدا، وتارێك بەبۆنەی یەکەمساڵیادی شەهید ساڵح یوسفی لەگەڵ وێنەکەیدا، بڵاوکراوەتەوە. هەروەها وتارێك لەسەر دەست درێژییەکانی ئیسرائیل بۆ سەر گەلی فەلەستین و لوبنان، وێڕای وێنە و پۆستەری شەهیدانی حزبی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

* ژمارە (٣-٤)ی بە (٢٠) لاپەڕە لەتشرینی دووەمی ١٩٨٢دا، دەرچووە.

بەشێك لەبابەتەکانی ئەم جووت ژمارەیە:

- لاپەڕەی یەکەم: بەمانشێتێکی گەورە نووسراوە: (پێشمەرگە قارەمانەکان پەرە بەچالاکییە شۆرشگێڕییەکانیان دەدەن دژ بەدام و دەزگاکانی رژێمی دکتاتۆری خوێن ڕێژی سەدام).
- هەر لەلاپەڕەی یەکەمدا، سەروتار لەژێر ناونیشانی: (هەڵوێستی سیاسیمان: رووخانی رژێمی سەدام ئەرکێکی نیشتمانی بەپەلەیە)، بڵاوبۆتەوە. لەسەروتاردا هاتووە: (.... تاقمە فاشیستەکەی بەغدا بەردەوامن لەجەنگە نارەواکەیاندا و لەسەر سیاسەتی تیرۆر و داپلۆسین بەردەوامن، بۆیە تەنیا رێگە لەبەردەم هێزە نیشتمانی و دیموکراسی و ئیسلامیە شۆرشگێڕەکاندا گیانی تەبایی و هاوکارییە لەبەرەیەکی نیشتمانی دیموکراتی فراواندا بۆ روخاندنی تاقمە عەفلەقیەکەی بەغدا).
- بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیستی کوردستان دەربارەی

هێرشەکانی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان.

- لاپەڕە چوار، بۆ بڵاوکردنەوەی چالاکییەکانی پێشمەرگە، تەرخان کراوە.
- لەلاپەڕە پێنجدا، لەیادی یەکەم ساڵڕۆژی شەهید بوونی کادیری جوتیاران شۆڕشگێڕی ناسراو هەڤاڵ شەهید عەبدوڵڵا سوور، وتارێك بڵاوکراوەتەوە... لەم وتارەدا هاتووە: (سوار چاکیان کوشت... بەڵام کوردستانیش مەڵبەندی هەزاران سوارچاکە).

هەر لەم ژمارەیەدا، دەقی ئەم وتارە بەزمانی عەرەبی کەپێشتر لەیەکەم ساڵڕۆژی شەهید بوونی ساڵح یوسفی بەزمانی عەرەبی لەرۆژنامەی (تشرین)، لەسوریادا، بڵاوکرابۆوە، دووبارە بڵاوکراوەتەوە. لەم وتارەدا هاتووە: (ساڵح یوسفی پەیکەرێکە لەترۆپکی شاخەکان و گۆڕەپانی دەشتەکانی خوارووداا... سەیدا ئەو کوردە نیشتمانپەروەرە بوو کەهەرگیز دەستی بۆ دوژمنانی نەتەوەی عەرەب و عێراق درێژ نەکردووە).

- لەلاپەڕە یازدەدا، وتارێك لەسەر شەهیدی قارەمان (مام ئاراس)، بڵاوکراوەتەوە جگە لەم بابەتانە، چەندین باس و بابەتی تری تێدا بڵاوکراوەتەوە.

* ژمارە (٥)، بە (٤٠) لاپەڕە، لەئازاری ١٩٨٣دا، دەرچووە.
* ژمارە (١)ی ساڵی سێیەم، بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (A3)، لەشوباتی ساڵی ١٩٨٤دا، دەرچووە.
* ژمارە (١٢-١٤)ی لەیەك بەرگدا، لەتشرینی دووەمی ١٩٨٨دا، دەرچووە.

لەدوو ساڵی بەراییدا، لەهەر ساڵێکی تازەی دەرچوونیدا، لەژمارە (١)ەوە دەستی بەبڵاوکردنەوە دەکردەوە.

* لەپاش راپەڕین هەمان ژمارەی (رێگای ئازادی)، ژمارە (٧١) دراوەتە (طريق الحرية). واتە: ژمارە (٧١)ی (طريق الحرية)، لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩١دا، دەرچووە.

## ٥- خەباتی قوتابیان

لەسەر بەرگی یەکەمیدا نووسراوە: گۆڤاری ناوەندی یەکێتی قوتابیانی کوردستان. ئەم رێکخراوە، سەر بەحزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق،

بوو. لەسەرەتای دروستبوونییەوە کاردۆ گەڵاڵی، سەرپەرشتی دەکرد. شەهید (سەڵاحەدین محەمەد ئیسماعیل– مامۆستا سەڵاح)، ئاسۆ حەسەن، کامەران قادر شۆڕش، ئەمین قادر، ئاری، لەکادیرە چالاکەکانی بوون. ئەم گۆڤارە، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو– رێنووسی ئارامی)، دەرچووە. ژمارە (٠) سفری، لەمانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٣دا، دەرچووە.

– ژمارە (١)، ئازاری ١٩٨٣.

– ژمارە (٢)، ئەیلولی ١٩٨٣.

– ژمارە (٣)، کۆتایی تشرینی دووەمی ١٩٨٣.

– ژمارە (٤)، کانوونی دووەمی ١٩٨٤.

– ژمارە (٥)، شوبات و ئازاری ١٩٨٤.

– ژمارە (٧)، کۆتایی ساڵی ١٩٨٤.

هەمووی بەسەر یەکەوە، (١٢) ژمارەی لێدەرچووە. دوای راپەڕین، ئەم رێکخراوە لەگەڵ رێکخراوی (یەکێتی لاوانی سۆسیالیستی کوردستان)، یەکیان گرتووە و ناوەکەی بۆتە: (یەکێتی خوێندکاران و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان).

– ئیندێکسی چەند ژمارەیەك:

* ژمارە (٢)، قەبارە (١٧×٢١سم)، ٢٤ لاپەڕە، ئەیلولی ١٩٨٣.

– خەباتمان، ل٣.

– شەهید سەلاح بەخوێنی پڕ لەهیوایەوە مێژووی خەباتمان دەڕازێنێتەوە، ل٨. ئەم بابەتە هەرچەندە ناوی لەسەر نییە، بەڵام پاش سۆراغ کردن، بۆمان دەرکەوت کە (رێبوار عەبدولڕەحمان)، نووسیویەتی.

– ساڵی خوێندنی ٨٢–٨٣ چۆن بەسەرچوو؟! ل١٠.

– با خەبات کەین لەپێناوی کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا، ل١٣.

– ١٤ی تەموز و کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا، ل١٧.

– رێکخراوە جەماوەرییەکانی قوتابیان و لاوانی جیهان تاوانەکانی تاقمی جەلال تاڵەبانی ریسوا دەکەن، ل١٩.

- خەباتمان، پاشماوە، ل٢١.
- بروسکەی یەکێتیمان بۆ ح.س.ك، پاشماوە، ل٢١.
- بۆ شەهیدێك، شیعر، یەزدان شێر، ل٢٢.
- ساڵی خوێندنی ٨٢-٨٣، پاشماوە، ل٢٢.
- بروسکەی یەکێتیمان بۆ حزبی سۆسیالیستی کوردستان، ل٢٣.
- کۆپلەیەك لەقەسیدەی چیانشینەکان، شیعر، ئاسۆ (ئاسۆ حەسەن)، ل٢٤.

* ژمارە (٣)، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەمی ١٩٨٣، قەبارە (١٧×٢١سم)، ٢٠ لاپەڕە.

- خەباتمان، ل١.
- ئەم هەواڵە، ل٣.
- لەئاهەنگی ماتەمینی هەڤاڵ (سەلاحەدین محەمەد)، ل٤.
- گەلی یەمەن لەیادی ئۆکتۆبەردا، ل٧.
- بۆ زیندانیەك، هێمن، ل٨.
- هەواڵی قوتابیان لەدەرەوەی وڵات، ل٩.
- یادی مبایعە و ڕاپەڕین، سەنگەر، ل١١.
- قادسیە و تطوع لەکوردستان، بەختیار، ل١٢.
- قادسیەی شووم لەساڵی چوارەمی دا، سالار، ل١٣.
- چالاکی قوتابیان، ل١٥.
- مانەوە، کورتە چیرۆك، هەڵمەت، ل١٦.
- نامەیەك بۆ قوتابیان، بڵند، ل١٩.
- قصر جمهوری أم مرقص؟! أبو شهاب، ل٢٠.
- بۆ ئەو کەسەی دەنگم نایگاتێ، شیعر، ڕێبوار (ڕێبوار عەبدولڕەحمان). لەسەر دیوی دەرەوەی بەرگی دواوە، بڵاوکراوەتەوە.

* ژمارە (٤)، قەبارە (١٧×٢١سم)، کانوونی دووەم، بەبەرگەوە (١٨) لاپەڕەیە. لەسەر بەرگی یەکەمیدا، ئەم دروشمە نووسراوە: (ژیانێکی بەختەوەرانە دوارۆژێکی پڕشنگدار).

- خەباتمان: ڕژێمی فاشی سەدام بەجاشایەتی جەلال... ناپارێزرێ!! ل١.

- بۆ پێشمەرگە، هێمن، ل٣.
- قوتابیە شۆرشگێڕەکانی کوردستان رادەپەڕن، ل٤.
- زانکۆی سەلاحەدین... لەنێوان چەوسانەوە و راپەڕیندا، توانا، ل٥.
- هەواڵ: تونس (باسێکە لەسەر راپەڕینی قوتابیان لەتونس)، ل٧.
- دەرچوانی ئامادەیی بەرەو کوێ؟ یەزدان شێر، ل٨.
- ئاستی ژیانی قوتابیان، سەنگەر، ل٩.
- ساڵی تازە، ل١٠.
- دەرچوونی ژمارە (٣)ی گۆڤاری رێبازی لاوان، ل١٠.
- راکێشانی قوتابیان بۆ بەرەکانی جەنگ، بایز (د. محەمەد کیانی)، ل١١.
- قوتابیانی یەمەن لەکۆنگرەی شەشەمدا، ل١٢.
- راگواستن بەردەوامە، ل١٢.
- سامانتا ئەو دەنگەی کۆشکی سپی بێزار کرد، وەرگێڕانی: بڵند، ل١٣.
- لەسێدارەدانی سەربازەکان، هەواڵ، ل١٥.
- کارت دابەش کردن!، ئامانج، ل١٥.
- هەڵبژاردنی ساختە، ل١٦.
- چیا، شیعر، ئاسۆ (ئاسۆ حەسەن)، ل١٧.
- سەلاحەدینی ئەیوبی دەگەڕێتەوە، شیعر، کاکە زیاد لادێی، لەسەر بەرگی دواوەی گۆڤارەکەدا، بڵاوکراوەتەوە.

* ژمارە (٥)، قەبارە (١٧×٢١سم)، شوبات و ئازاری ١٩٨٤، ٢٠ لاپەڕەیە.

- خەباتمان، سڵاو لەیادی سی و یەکەمین ساڵڕۆژی لەدایك بوونی یەکێتیمان، ل١.
- بڵاوبوونەوەی ژمارە (٤)ی رێبازی لاوان، ل٣.
- قوتابیان پێشەنگی خەباتن بۆ گەل و نیشتمان، ل٤.
- تطوع و هەڵوێستی شۆرشگێڕانەی قوتابیان، ل٥.
- ٨ی ئازار جەژنی ئافرەتان، ل٦.
- کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابوری زانکۆی بەغدا بەرەو کوێ؟، ل٧.
- ئاوڕێك لەمێژوو، ل١٠.

- ئەم هەواڵە، ل١١.
- هەواڵ: قوتابیانی پاکستان، ل١١.
- خوێندن و قادسیەی دۆڕاو، ل١٢.
- بەرەی نیشتمانی دیموکراسی و بڕیارێکی شۆرشگێڕانە، ل١٣.
- مافی چارەی خۆنووسین لەقامووسی جەلالییەکاندا، ل١٤.
- لەیادی یەکەمی شەهید بوونی هەڤاڵی پایەبەرز کاکە ئاری، ل١٥.
- جەژنی نەورۆز، ل١٦.
- هەواڵەکانی قوتابیان (بەغدا، ناسریە، بەسرە، زانکۆی موستەنسریە، بوخارست)، ل١٧.
- کۆنگرەی چوارەمینی یەکێتی قوتابیانی جیهان، هەواڵ، ل١٨.
- لەیادی راپەرینەکانی نەورۆزدا، ل١٩.
- هەواڵ: لەدایك بوونێکی نوێ، ل٢٠.
- هەواڵ: بەیاننامەیەکی نوێ، لەدیوی ناوەوەی بەرگی دواوەی گۆڤارەکە، بڵاوکراوەتەوە.
- بۆ کوردستان، شیعر، رێبوار (رێبوار عەبدولڕەحمان)، لەدیوی دەرەوەی بەرگی دواوەی گۆڤارەکە، بڵاوکراوەتەوە.

## ٦- دەنگی لاوانی کوردستان

بڵاوکراوەیەکی ناو بەناو بووە رێکخراوی (لاوان و خوێندکارانی سۆسیالیستی کوردستان لەدەرەوە)، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی) و عەرەبی، دەریکردووە. یەکەم ژمارەی لەمانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٣دا، دەرچووە[٣٣٩].

## ٧- سورێن

ئۆرگانی لقی سلێمانی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق)، یەکەم ژمارەی لە ١٩٨٣/٨/١٣دا، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی

ئـارامی)، دەرچـووە. بابەتـەکانی بـریتی بـوون لەچـالاکییەکانی پێـشمەرگە و بابەتی ڕۆژ و هوشیار کردنەوە و ڕێکخـستن و ئاشـکراکردنی پیلانـەکانی ڕژێـم و بابەتی ئەدەبی. (محەمەد شاکەلی، محەمەدی حاجی مەحمود، حەمە شوان[٣٤٠]، حاجی عەبدوڵڵای سیامێوەیی، حوسێن خەلیفـە، جـەمالی حەمـە نوقڵـە، مـلازم مەجید کاکەیی، خاڵە جوتیار، قادر جەباری، مامۆستا دلشاد، ئامانج شـاکەلی)، لەژمارەکانی شاخدا، بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە. محەمەد شاکەلی، بـەناوەکانی (بـاوکی دلێـر، چـاودێرێك) و محەمـەدی حـاجی مـەحمود بـەناوی (سـەربان)، بابـەتیان تێـدا بڵاوکردۆتـەوە. بـەئامێری دەسـت تایـپ کـراوە و بـەڕۆنیۆ و فۆتۆستێنسڵ، لەبەری گیراوەتەوە. سەرپەرشتکاری سەرەکی، ئامانج شـاکەلی، بـووە. دواتـر، (ئـاری کاکـەیی)یـش بووەتـە هاوکـاری. ژمـارە (٣)ی لەتـشرینی دووەمـی ١٩٨٣دا، دەرچـووە. بابەتـەکانی ئـەم ژمارەیـە، بـەزمانی کـوردی و عـەرەبی بـووە، تایبـەت بـووە بـەیادی شـەهیدانی حـزب (مامۆسـتا دلـشاد و هەڤاڵەکانی)، کەلەنەبەردییەکی شێرەمەڕدا، شەهید بوون... جگە لەم بابەتانە، کۆمەڵێك چالاکی پێشمەرگە و بابەتی تریشی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

ژمـارە (٤)ی بـەکوردی و عـەرەبی بـووە، لـەئازاری ١٩٨٤دا بـە (٨) لاپـەڕە دەرچـووە. ژمـارە (٦٦)ی سـاڵی نۆیـەمی، دوای ڕاپـەڕین، لـەکانوونی یەکـەمی ١٩٩١دا، دەرچووە.

## ٨- ڕێبازی لاوان

لەژێر ئاڕمی (ڕێبازی لاوان)دا، نووسـراوە: گۆڤـاری ناوەنـدی یـەکێتی لاوانـی سۆسیالیستی کوردستان. ئـەم ڕێکخـراوە لـە ١٩٨٣/٤/٤دا، لەشـاخ دامـەزراوە. ژمارە (١)ی ساڵی یەکەم، بە (١٦) لاپەڕەی قەبارە (١٧×٢١سم)، لەمانگی ئابی ١٩٨٣دا دەرچووە. ژمارە (٢)، (١٨) لاپەڕەیـە، لەسـەرەتای تـشرینی دووەمـی ١٩٨٣، بەقـەبارەی (١٧×٢١سـم)، دەرچـووە. ژمـارە (٣)، (١٤) لاپـەڕەیـە، لەناوەڕاسـتی کـانوونی دووەمـی ١٩٨٤، بەقـەبارەی (١٧×٢١سـم) دەرچـووە. ژمـارە (٤)، بـە (١٤) لاپـەڕە، لەناوەڕاسـتی ئـازاری ١٩٨٤، بەقـەبارەی (١٧×٢١سم) دەرچووە. لەسەر ئەم چوار ژمارەیەی سەرەوە، نووسراوە: نرخی

(١٠٠) فلسه. ژماره (٥)، (١٤) لاپەڕەیە، لەحوزەیرانی ١٩٨٤ بەقەبارەی (١٧×٢١سم)، لەحوزەیرانی ١٩٨٤دا دەرچووە. نرخی لەسەر نییە. ژمارە (٦-٧)، (٢٠) لاپەڕەیە، لەتشرینی دووەمی ١٩٨٤، بەقەبارەی (١٧×٢١سم) دەرچووە. نرخی لەسەر نییە. ژمارە (٨)، (١٦) لاپەڕەیە، لەتەموزی ١٩٨٦، بەقەبارەی (١٧×٢١سم) دەرچووە. نرخی لەسەر نییە. ئەم ژمارەیە (ژمارە ٨)، ئەو باڵە دەریانکردووە کەلەئابی ١٩٨٥ لەحزب جیابوونەوە و قادر عەزیز سەرپەرشتی دەکردن. ژمارە (١٦)، لەبەهاری ١٩٨٩دا، دەرچووە. هەموو ژمارەکانی بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- ڕێنووسی ئارامی)، دەرچووە. هەندێك لەژمارەکانی، لەلایەن ڕێکخستنەکانی حزب لەدەرەوەی وڵات، لەسوید، دووبارە چاپ و بڵاوکراونەتەوە.

- ئێندێکسی چەند ژمارەیەك:

* ژمارە (١)، ئابی ١٩٨٣:

- ڕێبازمان، ل١.
- بروسکەی یەکێتیمان بۆ ح.س.ك، ل١.
- لەبیرەوەری ٨ی ئابدا، ل١.
- بەیانی دامەزراندنی یەکێتی لاوانی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق، ل٢.
- لەپێناوی ئاشتی جیهانیدا با دەنگی لاوانمان یەکخەین، ئاشتی، ل٤.
- تەئسیری شەڕی قادسیەی شووم بەسەر لاوانی گەلەکەماندا، شێرکۆ، ل٥.
- ڕێکخراوە جەماوەرییەکان تاوانەکانی تاقمی جەلالی خۆفرۆش ریسوا دەکەن، پەیامنێری ڕێبازی لاوان لەدیمەشق، ل٧.
- الفاشية والشباب، أبو نصير (زهير الجزائيري)، ل٨.
- ئەدەبی لاوان: چیرۆك، خاتوو شاناز دەژێیتەوە، ئاسۆ (ئاسۆ حەسەن)، ل١٠.
- لەپێناوی ئاشتی: پاشماوە، ل١٢.
- لەبیرەوەری ٨ی ئابدا: پاشماوە، ل١٣.
- شەهید فاروق: پاشماوە، ل١٣.
- بروسکەی یەکێتیمان: پاشماوە، ل١٤.

- بەیانی دامەزراندنی یەکێتیمان: پاشماوە، ل١٤.
- ڕێبازمان: پاشماوە، ل١٥.
- شەهید فاروق نموونەی لاوێکی هوشیار بوو، ل١٦.
- گەڵا و گوڵیش تاوانبارن، شیعر، زرار جۆلا، ل١٦.

* ژمارە (٢)، سەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٨٣:

- لاوەکانی کوردستان و هەڵوێست لەجەنگی قادسیە، ل١.
- شاڵاوێکی تازەی ڕژێم بۆ گواستنەوەی جوتیارانی کوردستان، پەیامنێرمان لەباڵەك، ل٢.
- حزبی دیموکراتی شۆڕشگێڕ و ڕێکخراوی جەماوەری، ئازاد مەحمود، ل٣.
- بێکاری لاوان لەوڵاتە سەرمایەدارەکان، ئاشتی، ل٥.
- چاوپێکەوتن لەگەڵ هونەرمەندی ناسراو عومەر چاوشین، ئامادەکردنی: م. بەختیار، ل٧.
- مادام شەڕ بەردەوامە رووتاندنەوەی گەلیش بەردەوام دەبێت، پەیامنێرمان لەهەولێر، ل١٠.
- ئەدەبی لاوان: کورتە چیرۆك، موژدە، هەڵمەت، ل١١.
- لووتکە، شیعر، ڕێبوار عەبدولڕەحمان، ل١٥.
- شیعرێکی نازم حیکمەت، وەرگێڕانی: سیروان (عەباس عەبدوڵڵا یوسف)، ل١٥.
- هۆ سەلاح گیان خۆشمان دەوێی، شیعر، فەرهەنگ (ئیسماعیل تەنیا)، ل١٦.
- بۆ مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراقی تێکۆشەر، ل١٧.
- نامەیەك بۆ رای گشتی جیهانی، شوان محەمەد (ئاسۆ حەسەن)، ل١٨.

* ژمارە (٣)، ناوەڕاستی کانوونی دووەمی ١٩٨٤:

- سەربەستی، لەبەرگی یەکەم دیوی ژوورەوە، بڵاوکراوەتەوە.
- با ساڵی تازە ساڵی هەنگاونانی مەزن بێ بەرەو خەبات، ل١.
- لەپێشوازی ساڵی تازەدا، ل٢.
- شەهید شێرکۆ... نموونەی قوربانیدانی لاوانە بۆ گەل، ل٣.
- پێشانگای کەلتوری فەلەستین، ل٤.

- یان ئیعدام یان مردن لەبەرەکانی شەڕ، ل٤.
- رۆڵی لاوان لەکۆمەڵدا، ئامادەکردنی: م. بەختیار، ل٥.
- دوا هەنگاو بۆ ئیدانەکردنی جەنگ، ل٦.
- قوتابیانی دیانا بەرووی رژێمدا دەتەقنەوە، ل٧.
- هەموو شتێك لەپێناوی شەڕدا، ل٧.
- چاوەڕوان بن بەم زوانە گۆڤاری (خەباتی قوتابیان)، ژمارە (٤)، دەردەچێت، ل٧.
- کۆڕێك بۆ کورتە چیرۆك، ل٨.
- ئەدەبی لاوان: دوو خەونی پێچەوانە، کورتە چیرۆك، رێناس، ل٩.
- دوو چیرۆکی زۆر کورت، سیروان (عەباس عەبدوڵلا یوسف)، ل١١.
- پۆستەی رێباز، ل١٢.
- تاوان لەیادێکدا، شیعر، رەوەند، ل١٣.
- شێرکۆ نەمرد، ئاسۆ حەسەن، لەبەرگی دووەم دیوی دەرەوەدا، بڵاوکراوەتەوە.

* ژمارە (٤)، ناوەڕاستی ئازاری ١٩٨٤:
- دیموکراسی، لەبەرگی یەکەم دیوی ناوەوەدا، بڵاوکراوەتەوە.
- با خەبات بکەین لەپێناوی یەکخستنی تێکۆشانی لاوان، ل١.
- ئەتۆم و گەورەترین تاوان دەرهەق بەمرۆڤایەتی، دلشاد (ئاسۆ حەسەن)، ل٢.
- نەورۆز رۆژی نوێی خەباتە، ئاسۆ حەسەن، ل٣.
- لاوانی رۆژئاوا لەگەڵ کێن، م. بەختیار کردوویەتی بەکوردی، ل٤.
- الامل، ل٥، (ناوی گۆڤارێکی تازەیە، ژمارە یەکی لێ دەرچووە).
- لەیادی راپەرینەکانی نەورۆزی پاردا، ل٦.
- لەجەژنی ئافرەتانی جیهاندا، دەستەی نووسەران، ل٧.
- نموونەیەك لە (٢٠٠٠٠) تاوان، ئامادەکردنی: ئاڵا، ل٨.
- دەنگوباسی لاوان و قوتابیان، ل٩.
- چیرۆکێکی زۆر کورت، سیروان (عەباس عەبدوڵلا یوسف)، ل١٢.

- رابیتەی نووسەر و رۆژنامەنووس و هونەرمەندانی پێشمەرگە، ل١٢.
- پۆستەی رێبان، ل١٣.
- شەهید کرێکار قادر و شەهید ئیدریس مەولود، ل١٤.

* ژمارە (٥)، حوزەیرانی ١٩٨٤:

- سۆسیالیستی، لەبەرگی یەکەم، دیوی ناوەوەدا بڵاوکراوەتەوە.
- قوتابیان جارێکی دیکەش دەیسەلمێنن کەپێشەنگی خەباتی گەلەکەیانن، ل١.
- دەربارەی ئازاردان، ل٢.
- خەباتی قوتابیان، بەم زوانە ژمارە (٦)ی ئەم گۆڤارە دەردەچێت، ل٢.
- کۆبوونەوەی رێکخراوە دیموکراسییەکانی لاوان و قوتابیانی کوردستان و عێراق، ل٣.
- چاوەڕوان بن بەم زوانە ژمارە یەکی گۆڤاری (دەنگی لاوان و قوتابیان) دەردەچێت، ل٤.
- فیستیڤاڵی دوازدەمینی لاوان و قوتابیانی جیهان، ل٥.
- تا منداڵیش لەکوشتن و بڕینی فاشیستەکان رزگاریان نابێت، ل٦.
- تاوانێك لەسەدان هەزار تاوان، مام عەلی، ل٧.
- عودەی قوتابی! !، ئامانج، ل٨.
- دەنگ و باسی لاوان و قوتابیان، ل٩.
- پێناسەی عاشقێك و مەدالیایەك، شیعر، زرار جۆلا، ل١٣.
- شەهید زبێر ئادەم، دوا لاپەڕە.

* ژمارە (٦-٧)، تشرینی دووەمی ١٩٨٤:

- ئاشتی: لەبەرگی یەکەم، دیوی ناوەوەدا بڵاوکراوەتەوە.
- لەنێوان بەرداشی شەڕ و زەبر و زەنگی فاشیزمیدا...، ل١.
- بروسکەی پیرۆزبایی بۆ یەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراق، ل٢.
- چاوەڕوان بن بەم زوانە ژمارە ٢ی گۆڤاری (دەنگی لاوان و قوتابیان) دەردەچێت، ل٢.
- بەلاغی کۆبوونەوەی لیژنەی باڵای هاوکاری، ل٣.

- رۆڵی لاوان لەخەباتدا، عەبدولرەزاق مەرزەنگ، ل٥.
- دەرچوون و وەرگرتنی قوتابیان لەزانکۆکانی عێراق، رێناس، ل٧.
- لەگەڵ لاوێکی پێشمەرگە، ئامادەکردنی: م. بەختیار، ل٨.
- لەپێناوی ئاشتی و دۆستایەتی و هاوکاری دژ بەئیمپریالیزم: کورتەیەك لەمێژووی فیستیڤاڵە جیهانییەکانی لاوان، د.ع (دارا عومەر)، ل٩.
- یادێکی شووم، ل١٠.
- میهرەجانی سیاسی لەکێوە بۆ کێ؟، ل١٢.
- لەرۆژی جیهانی قوتابیان، ل١٢.
- لەیادی دامەزراندنی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، ل١٣.
- تیپی کرێکاران، ل١٣.
- مەبەست ئاشکرایە، ل١٣.
- لەدژی رژێمی فاشستی بەغدا، ل١٣.
- دەربارەی بارودۆخی عێراق دەڵێن، ل١٤.
- لەچالاکییەکانی رێکخستنە نهێنییەکان، ل١٤.
- کۆبوونەوەی دوو قۆڵی یەکێتیمان و رێکخراوی لاوانی خەباتی فەلەستین، ل١٤.
- رێکخراوە دیموکراتی و نەقابیەکان لەگەڵ خەباتی گەلەکەمان هاوکاری دەکەن، ل١٥.
- پێشوازی ساڵی نوێ، ل١٦.
- رۆڵی لاوان لەخەباتدا: پاشماوە، ل١٦.
- شانۆی لاوان، ب. رووناك، ل١٧.
- ژوانی نوێ، شیعر، ئاسۆ حەسەن، ل١٨.
- لەنامەی لاوێکی پێشمەرگە، ل٢٠.
- دوو کۆپلە شیعر: تاوان، وەسیەت نامەیەك بۆ دایکم، ب. دەوەن (ئیسماعیل تەنیا)، لەبەرگی دووەم، دیوی ناوەوەدا بڵاوکراوەتەوە.
- رێز و خۆشەویستی بۆ یادی دامەزراندنی یەکێتی لاوانی دیموکراتی جیهان، لەبەرگی دووەم، دیوی دەرەوەدا بڵاوکراوەتەوە.

* ژماره (٨)، تەموزی ١٩٨٦:

ئەم ژمارەیە باڵی جیابۆوەی حزب، بەناوی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- ئیتجاهی دیموکراتی شۆرشگێڕ)، دەریانکردووە.

- بەرەو ڕاپەڕینی سەرتاسەری، ل١.
- هەڵوێستمان، ل١.
- لەم ژمارەیەدا، ل١.
- شەڕی قادسیە روو لەساڵی حەوتەمە، حەسیب (ئاسۆ حەسەن)، ل٢.
- بەیانێکی هاوبەش، ل٤.
- خوێندکاران بەخۆپیشاندان شالاوی رەشبگیری رەت دەکەنەوە، ل٥.
- هەش بەسەری ئەوانەی بەدڵیان نین، ئالا، ل٦.
- شالاوێکی تری رەشبگیری، ل٧.
- ملحق راية الحرية، ژمارە یەکی بلاوکرایەوە، ل٧.
- روونکردنەوەیەك، ل٧.
- ئاوڕێك لەهونەری سینەما، کاردۆ (ئاسۆ حەسەن)، ل٨.
- بنگرد بووکی سەربڕاوی کوردستانە، ل٩.
- کوڕە کەچەڵ، شیعر، هەژار دێدەوانی، ل١٠.
- چیرۆکی ژمارە: کاروان سەرایەك، گۆران (گۆران جەلال)، ل١١.
- لەپێناوی دزیەکی خۆیاندا، ل١٣.
- پاشماوەی لاپەڕە پازدە، ل١٣.
- ئاوڕدانەوەیەك لەهونەری سینەما: پاشماوە، ل١٣.
- هەڵوێستمان: پاشماوە، ل١٤.
- بەرەو ڕاپەڕینی سەرتاسەری: پاشماوە، ل١٥.
- شەهیدی نەمر... وەهاب حەمەڕەش (شوان)، ل١٦.

## ٩- بەهدینان

ئۆرگانی ناوەندی لقی دهۆکی حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق. یەکەم ژمارەی لەتشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٣)دا، بەچوار لاپەڕەی قەبارە

(٢١×٣٤سم)، بەزمانی کوردی (کرمانجی ژووروو– رێنووسی ئارامی)، لەگوندی (کافێ)ی نێوان بەری گاراو زێبار، دەرچووە. تەنها سێ ژمارەی سەرەتایی ساڵی یەکەمی بەزمانی کوردی بووە. لەژمارە (٤)ەوەی ساڵی یەکەم، تاوەکو راوەستانی، تەنها بەزمانی عەرەبی دەرچووە. نرخی (٥٠) فلسە. هەمووی بەسەر یەکەوە، (١٠) ژمارەی لێدەرچووە. ژمارە (١٠)ی لەکۆتایی پایزی ١٩٨٥دا، دەرچووە. دەربارەی بڵاوبوونەوەی یەکەم ژمارەی (بەهەدینان)، لەلاپەڕە (٦)ی ژمارە (٧)ی، ساڵی سێیەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٣ی (رێگای ئازادی)دا، بەم شێوەیە ژمارە (١)ی بەهەدینان، نمایشکراوە: ژمارە (١)ی بەهدینان، بڵاوکراوەی لقی بادینانی حزبمان لەکۆتایی تشرینی یەکەمدا کەوتە بەردەستان کەبەشێوەی کرمانجی سەروو بڵاوکراوەتەوە. چەند وتار و هەواڵی بەنرخ و سوود بەخشی گرتۆتە خۆ. هیوادارین بەهدینان دەوری کاریگەری خۆی ببینێ و بەردەوام بێت.

– ژمارە (٥)ی ساڵی (١)ی لەمایسی ١٩٨٤دا بە (٤) لاپەڕە دەرچووە.
– ژمارە (١)ی ساڵی (٢)ی لەتشرینی دووەمی ١٩٨٤دا، بە (٤) لاپەڕە دەرچووە.
– ژمارە (٣)ی ساڵی (٢)ی لەکانوونی دووەمی ١٩٨٥دا، بە (٤) لاپەڕە دەرچووە.
– ئیندێکسی چەند ژمارەیەك:

* العدد (٤)، السنة (١)، بداية اذار ١٩٨٤:

– اذار شهر العطاء والامجاد، ص١.
– طريقنا: التصعيد الخطير في الحرب وتحركات مشبوهة للأنقاذ نظام صدام من الأنهيار، ص١.
– كل المجد لشهيدنا الخالد (سعدي عزيز) ولرفاقه الأبطال، ص١.
– عمليات بطولية، ص٢.
– أخبار الداخل، ص٢.
– بقية المواضيع، ص٣.
– اللجنة العليا لـ(جود) تعقد إجتماعها وتصدر بلاغها الختامي، ص٤.

- الديمقراطية الثورية وطريق تطورها الطبيعي، ص٤.
- الجلاليون أصبحوا أداة بيد الفاشية، ص٤.

* العدد (٥)، السنة (١)، آيار ١٩٨٤:

- تحية للأول من آيار عيد الطبقة العاملة العالمية، ص١.
- طريقنا: من أجل تحويل الأنتفاضة الطلابية إلى إنتفاضة شعبية عارمة، ص١.
- الحزب الشيوعي العراقي يحتفل بالذكرى اليوبيلية الخمسين، ص١.
- عمليات بطولية، ص٢.
- أخبار الداخل، ص٢.
- وصايا في حرب الأنصار، ص٢.
- ننبه، ص٢.
- مسيرة الشعوب لن تخلو من الزمر المأجورة، ص٣.
- إدانة كردية شاملة للأتفاقية صدام- جلال المذلة، ص٣.
- بقايا المواضيع: ص٣.
- لا تزال قلعة دزه صامدة بوجه أعدائها، ص٤.
- من منهاج الحزب، ص٤.
- مصطلحات سياسية: الأستعمار الجديد، ص٤.
- الحل الأمبريالي الرجعي للقضية الكردية، ص٤.
- من الجذر، شعر، شيركو بێكەس، ص٤.

* العدد (١)، السنة (٢)، تشرينى الثاني ١٩٨٤:

- بمزيد من التطور والرسوخ (جود) تدخل عامها الخامس، ص١.
- الهجوم التركي، ص١.
- طريقنا: جود تضع (أوك) أمام إمتحان صعب، ص١.
- المصب النهائي لمخططات السلطة، ص٢.
- من نشاطات رفاقنا في الداخل، ص٢.
- الزاوية الثقافية: أهمية برنامج الحزب ونظامه الداخلي، ص٣.
- بقايا المواضيع: ص٣.
- جاش الديسكو، ص٤.

- ويجلوا النباح مرة اخرى، ص٤.
- إستشهاد ثلاثة من رفاقنا الأبطال، ص٤.
- إنتصار الثورة الوطنية الديمقراطية لشعوب أين يمكن؟، ص٤.
- النظام في الصحافة، ص٤.

* العدد (٣)، السنة (٢)، كانون الثاني ١٩٨٥:
- طريقنا: أوك والمساومة الخاسرة، ص١.
- جود تجتمع وتصدر بياناً للشعب، ص١.
- أساليب بربرية فاشلة، ص١.
- في داخل أربيل، ص١.
- قفزتين بدلاً من واحدة، ص٢.
- الرد الأكثر حزماً، ص٢.
- بقايا المواضيع، ص٢.
- من هنا وهناك، ص٣.
- مصطلحات السياسية: النضال الطبقي والوطني، الديمقراطية الثورية، ص٣.
- الزاوية الثقافية: الوحدة الفكرية والتنظيمية في الحزب، ص٣.
- الفن والأرتزاق، ص٤.
- عمليات بطولية، ص٤.
- إصدارات جديدة، ص٤.
- نواياهم، ص٤.
- من قصيدة أنشودة النضال، شعر، كلسرخي، ص٤.

* لەسەر ئارمی (بهدينان)، ئەستێرەیەکی سوور هەیە، لەسەر ئەستێرەکەش لەناو لاکێشەیەکی باریك نووسراوە: (الديمقراطية للعراق والحكم الذاتي الحقيقي لكردستان). لەژێر ئارمی (بهدينان)یش نووسراوە: (جريدە دوريە يصدرها الحزب الاشتراكي الكردستاني– العراق، فرع دهوك). مانشێتەکانی لاپەڕە یەك، هەمووی بەرەنگی سوور نووسراون.

## ١٠- پەیامی شۆڕشی کوردستانی عێراق

لەسەر بەرگەکەی نووسراوە: (بڵاوکراوەی ڕاگەیاندنی ناوەندی حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق). لەژێر دروشمی: (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان)، دەرچووە. ژمارە (١)ی بە (٢٠) لاپەڕەی قەبارە (٢١×١٧سم)، لەحوزەیرانی ١٩٨٤دا، دەرچووە. ژمارە (٧-٨)ی لەبەرگێکدا کەدوا ژمارە بووە و لەحوزەیران و تەموزی ١٩٨٥دا، دەرچووە. گرنگی بەبڵاوکردنەوەی هەواڵ و بابەتی عەسکەری و چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی حزبی سۆسیالیست دەدا. لەم کاتەدا، (دەنگی پێشمەرگە) دەرنەدەچوو، (پەیام) جێگەی ئەوی گرتبۆوە.

- ئیندێکسی ژمارە (١)، حوزەیرانی ١٩٨٤:
- هەواڵ و لێدوان، ل١.
- هەڵوێستی قوتابیانی کوردستان، ل١.
- بەپێویستی دەزانین ڕاستیان تێبگەیەنین، ل١.
- سووتاندنی زیلێکی پڕ لەسەرباز، هەواڵ، ل١.
- عێراق لەرۆژنامەکانی جیهاندا، ل٢.
- بەرەی نیشتمانی دیموکراسی عێراقی.. جێگای هیوای گەلەکەمانە، ل٣.
- چالاکییەکانی پێشمەرگە، ل٥.
- هەواڵ و لێدوان: پاشماوە، ل٩.
- هەڵوێستی قوتابیانی کوردستان: پاشماوە، ل٩.
- سووتاندنی زیلێکی: پاشماوە، ل١٠.
- بەپێویستی دەزانین: پاشماوە، ل١١.
- ناوچەی ڕۆست: پاشماوە، ل١٣.
- لێرە و لەوێ، ل١٤.
- ڕۆمانیا: قوتابیان لەشاری ئەیاشی، ل١٦.
- چالاکییەك، ل١٦.
- جەماوەری شۆڕشگێڕ بڕیاری وەزارەتی داخلیەی ڕژێم ڕەت دەکەنەوە، ل١٦.

– ڕاپۆرتێك، هەواڵ، ل١٧.
– بۆ ئاگاداری، ل١٧.
– تاوانێکی دیکەی پۆل پۆتەکان، ل١٨.
– شۆڕش شۆڕشی گەلە هی سەپان و ڕەنجدەرە، ل١٨.
– بەرەو باوەشی شۆڕش، ل١٨.
– لەلاپەڕەیەکی ڕۆشنبیریدا: فاشیزم، ل٩.
– لەڕێگای ئازادیدا: شەهیدی نەمر بەکر تۆفیق بەکر، دوا لاپەڕە.
گەلی عەلی بەگ، چالاکییەك، ل٢٠ (دوا لاپەڕە).

## ١١ – پەیامی برایەتی

لەژێر ئارمەکەیدا نووسراوە: (ئۆرگانی لقی کەرکوکی حزبی سۆسیالیستی کوردستان– عێراق). ژمارە (١)، ساڵی (١)، بەهەشت لاپەڕەی قەبارە (A4)، لەکانوونی دووەمی ١٩٨٥دا، دەرچووە. بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو– ڕێنووسی ئارامی) و عەرەبی، بابەتەکانی بڵاو دەکردەوە. تەنها چوار ژمارەی لێدەرچووە و وەستاوە. (ئامانج شاکەلی و ئاری کاکەیی)، سەرپەرشتیان کردووە و لەزۆربەی ژمارەکانیدا، بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە. بەئامێری دەست تایپ کراوە و بەڕۆنیۆ لەبەری گیراوەتەوە. ئەوکات، بارەگای لقی کەرکوك لەشارباژێڕ بووە. (محەمەد شاکەلی)یش نووسینی تێدا بڵاوکردۆتەوە.

## ١٢– قەندیل

لەژێرەوەی بەرگی یەکەم، لەناو لاکێشەیەکی باریکدا نووسراوە: (گۆڤارێکی ئەدەبی– ڕۆشنبیری سەربەخۆیە). (مارف عومەر گوڵ)، بەرپرسیاری بووە و سەرپەرشتی کردووە. حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەچاپخانەی شەهید (سەیدا ساڵح یوسفی)، چاپ و بڵاویانکردۆتەوە، نرخی (٧٥٠) فلسە. گۆڤارەکە، وەرزی، یان بڵێین ناو بەناو دەرچووە. یەکەم ژمارەی لەشوباتی ١٩٨٧، لەشێوە و قەبارەی زەنگیانە کتێب بە (٩٦) لاپەڕە دەرچووە. ژمارە (٣)ی لەکانوونی یەکەمی ١٩٨٧دا، دەرچووە. ژمارە (٤)، دوا ژمارە بووە و لەتەموزی ١٩٨٨دا، دەرچووە.

## ١٣- پەیامی ئازادی

ڕۆژنامەیەك بوو، لقی دیالای (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق)، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- ڕێنووسی ئارامی)، لەپاش ڕاپەڕین لەکوردستانی ئازاد کراودا، دەریدەکرد. یەکەم ژمارەی لەناوەڕاستی ١٩٩١دا، بەهەشت لاپەڕەی قەبارە گەورە دەرچووە. ژمارە (٣)ی دوا ژمارە بووە و لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩١دا، دەرچووە.

## ١٤- زەنگ

لەژێر ناوی (زەنگ)دا، نووسراوە: (ئۆرگانی یەکێتی قوتابیان و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان- لقی هەولێر). (٨) لاپەڕە، نرخی (٥٠٠) فلسە. ئەم ڕۆژنامەیە، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- ڕێنووسی ئارامی)، لەشاری هەولێر دەرچووە. یەکەم ژمارەی بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (٤١×٢٨,٥سم)، لەکانوونی یەکەمی ١٩٩١دا، دەرچووە. ژمارە (٢)، دوا ژمارە بووە لەکانوونی دووەمی ١٩٩٢دا، دەرچووە. دەستەی نووسەرانی لەسەر نەبوو، بەڵام ئەم نووسەرانە سەرپەرشتیان کردووە: ئاسۆ حەسەن، ڕێبوار عەبدولڕەحمان، ئیسماعیل تەنیا، برزۆ عەلی هەژار، مستەفا پەژار، عەباس عەبدوڵلا یوسف، کەریم دەشتی، هیمداد حوسێن، خالید جوتیار.

بیرۆکەی دەرکردنی ئەم ڕۆژنامەیە لەوەوە هات کەڕۆژانی کۆنگرەی ڕاپەڕینی یەکێتی نووسەرانی کورد کەلەڕۆژانی ١٥-١٧/١٠/١٩٩١، لەشەقڵاوە بەسترا. من و ئاسۆ حەسەن، ڕۆژانە دەچووینە شەقڵاوە و دەهاتینەوە هەولێر. ڕۆژێکیان، کاتی نیوەڕۆ، ئاسۆ حەسەن گوتی: بۆ گۆڤارێکی ئەدەبی دەرنەکەین؟! هەوڵ دەدەین حزب یارمەتیمان بدات و بۆمان چاپ و بڵاو بکاتەوە. ناوەکە پێشنیاری من بوو. نیاز وابوو گۆڤار بێت و تەنها بابەتی ئەدەبی بڵاو بکاتەوە، بەڵام کەپرس بەمامۆستا (سەعد عەبدوڵلا)ی لێپرسراوی لق کرا، ئەو پێی باشبوو، گۆڤار نەبێت و ڕۆژنامە بێت. تایبەت بەئەدەب نەبێت و هەمەڕەنگ بێت. هەروەها ببێتە ئۆرگانی لقی هەولێری یەکێتی قوتابیان و لاوانی سۆسیالیستی

کوردستان. پێشنیارەکەی ناوبراو کەوتە بواری جێبەجێ کردنەوە. ئەوکات بارەگای رۆژنامەکە، لەدوو ژووری یەکێتی ناوبراو بوو لەقوتابخانەیەکی چۆڵکراوی تەنیشت هوتێلی شیراتۆن. دەرگای سەرەکی قوتابخانەکە بەرامبەر بارەگای (یەکێتی نەقابەکانی کرێکارانی جاران) و (بارەگای حزبی شیوعی) لەدوای راپەڕین، بوو.

## ١٥- تیشك

لەسەر بەرگی گۆڤارەکە نووسرابوو: دەنگی قوتابیان و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان- لقی سلێمانی. بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی)، یەکەم ژمارەی بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (٢٢×٣٣سم)، لەشوباتی ١٩٩٢دا، دەرچووە. ژمارە (٢)ی لەئازاری ١٩٩٢دا، دەرچووە. ژمارە (٣)ی لەگوڵان (مایس)ی ١٩٩٢دا، دەرچووە.

## ١٦- زمناکۆ

رۆژنامەیەك بوو، یەکێتی قوتابیان و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان، لقی سلێمانی، بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی)، دەریدەکرد. یەکەم ژمارەی بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (٢٩×٤١سم)، لەشوباتی ١٩٩٢دا، دەرچووە. لەچاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری لەهەولێر، چاپکراوە. هەر ئەم ژمارەیەی لێدەرچووە و وەستاوە.

## ١٧- یەککگرتن

ئۆرگانی ناوەندی حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق و پارتی سەربەخۆیی دیموکراتی کوردستان (پاسۆك)، بوو. بەزمانی کوردی (کرمانجی خواروو- رێنووسی ئارامی)، لەهەولێر دەردەچوو. ژمارە (٠) سفری بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (A3)، لە ١٩٩٢/٤/٢٠دا، دەرچووە. ژمارە (١)ی لەمایسی

١٩٩٢دا، دەرچـووە. ژمـارە (٢)ی لـە ١٩٩٢/٥/١٤دا، دەرچـووە. ژمـارە (٣)ی لـەحوزەیرانی ١٩٩٢دا، دەرچـووە. ژمـارە (٤)ی لـەئابی ١٩٩٢دا دەرچـووە. تـا کـۆنگرەی یـەکگرتنی (سۆسیالیـست، پاسـۆك، پـارتی گـەل)، هـەر ئـەم پێـنج ژمارەی لێدەرچووە. سێ ژمارەی تایبەتیشی لەرۆژانی کۆنگرەدا، لێدەرچـووە. ژمارە (١)ی تایبەتی، لەیەکەم رۆژی کۆنگرە لە ١٩٩٢/٨/٢٠دا، بەچوار لاپەڕەی قـــەبارە (A3)، دەرچـــووە. ژمـــارە (٢)ی لەســـێیەم رۆژی کـــۆنگرە لـــە ١٩٩٢/٨/٢٢دا، دەرچووە. ژمارە (٣)ی لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٤دا، دەرچووە. هـەر سێ ژمارە تایبەتیەکە، چوار لاپەڕە بووە.

یەکەم ژمارەی دوای تەواوبوونی کـۆنگرە، بۆتـە: (ئۆرگـانی ناوەنـدی حزبـی یەکگرتنی کوردستان) و، لەئەیلولی ١٩٩٢دا، بـە (٨) لاپـەڕە دەرچـووە. ژمـارە (٦)ی لـــەکۆتایی کـــانوونی یەکـــەمی ١٩٩٢دا، دەرچـــووە. ژمـــارە (١٦)ی لـــە ١٩٩٣/٥/١٧دا، دەرچووە. تا تەواو بـوونی کـۆنگرەی سـێ حزبەکـە (کـۆنگرەی یەکگرتن)، (ئاسۆ حەسەن، برزۆ عەلی هـەژار، ئیـسماعیل تـەنیا، نـزار محەمـەد، ماجید نوری، عەباس عەبدوڵلا یوسف، مستەفا پـەژار)، کاریـان تێدا کـردووە. ئەوکاتــە (عەبـدوڵلا ئـاگرین)، لێپرسـراوی راگەیانـدنی هەرسـێ حزبەکـەی نـاو پرۆسەی یەکگرتن بوو. دوای یەکگرتنـی (حزبی یەکگرتن) و (پـارتی دیمـوکراتی کوردستان)، رۆژنامەکەش وەستا.

## ١٨- یەکگرتن

لـەژێر ئـاڕمی رۆژنامەکـەدا نووسـراوە: (جریـدة المرکزیـة لحـزبین الاشـتراکي الکردســـتاني- العـراق و الاســتقلال الـدیمقراطي الکردســـتاني- پاسـۆك). دوو لاکێـشەی بـچووك لـەلای راسـت و چـەپی ئـاڕمی رۆژنامەکـەدا، دەبینـرێن. لەلاکێـشەی دەسـتە راسـتدا نووسـراوە: (حـق تقریـر المـصیر للـشعب الکـردی، الدیمقراطیـة للعـراق). لەلاکێـشەی دەسـتە چـەپدا نووسـراوە: (الاتحـاد أسـاس النصر). ئەم رۆژنامەیە، بەزمانی عـەرەبی دەرچـووە، ژمـارە (٠) سـفری سـاڵی یەکەمی لـە ١٩٩٢/٤/٢٠دا، بـە (٨) لاپـەڕەی قـەبارە (A3)، دەرچـووە. ژمـارە (١)ی بە (٨) لاپەڕەی قەبارە (٣٣×٤٩سم)، لە ١٩٩٢/٥/١٠دا، دەرچووە. ژمارە

(٢)ی لـه ١٩٩٢/٦/١٧دا، دەرچـووە. جـارێكی تـر لەیەكـەم ڕۆژی كـۆنگرەی یەكگرتنی هەرسێ حزبەكە، لـه ١٩٩٢/٨/٢٠دا، ژمـارە (١)ی تایبـەت بـەكۆنگرە بەچوار لاپەڕە دەرچووە. (عەبدوڵڵا ئاگرین، خەسرەو گۆران، شێرزاد شـێخانی، عەبدولغەنی عەلی یەحیا، عـەباس عەبـدوڵڵا یوسـف)، لـەم ڕۆژنامەیـەدا، كاریـان كردووە.

## ١٩- ئیزگەی كوردستان

گۆڤـارێكی ڕۆشـنبیری گـشتی بـوو، (ئیزگـەی كوردسـتان- ئیزگـەی حزبـی سۆسیالیستی كوردستان- عێراق)، مانگی دوو جار بەزمانی كـوردی (كرمـانجی خواروو- ڕێنووسی ئارامی) و عەرەبی لەرانیە، دەریدەكرد. یەكـەم ژمـارەی بـە (٤٢) لاپەڕەی قەبارە (١٦,٥×٢١سم)، لەناوەڕاستی تـشرینی یەكـەمی ١٩٩٢دا، دەرچووە. هەر تەنها ئەم ژمارەیەی لێدەرچووە و وەستاوە. مامۆستا حەسـەن عوسمـان، ناسـراو بەمامۆسـتا (عەبدولكـەریم)، بەرپرسـی ئیزگـه بـووە. پـاش ئـەوەی بـاڵی ڕەسـوڵ مامەنـد، نەچـوونە نـاو حزبـی یـەكگرتنی كوردسـتان و كۆنگرەی دووەمیان بەستا، ئەم ئیزگەیە، سەر بەو باڵە بوو.

جگـه لـەم ڕۆژنامـە و گۆڤـار و بڵاوكرانـە، حزبـی سۆسیالیـستی كوردسـتان، بەهاوبەشی لەگەڵ حزب و لایەنەكانی (بەرەی جود)، ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانەشی دەركـردووە: (دەنگـی لاوان و قوتابیـان، ڕۆشـنبیری پێـشمەرگە، هەڵوێـستی ئەدەبی، بانگ، ڕێیـا سـەركەفتنێ، كفـاح الجبهـه، صـدا جـود). هـەروەها دوای دامەزراندنی بەرەی كوردستانی، بەشداری لەدەركردنی ئۆرگـانی بـەرە (بـەرەی كوردستانی، الجبهه الكردستانیه)دا، كردووە.

## ب- رادیـــۆ

حزبی سۆسیالیستی كوردستان، بۆ ئەوەی لەجـەماوەر دانـەبڕێت و زووتـر و بەئەركێكی كەمتر، دەنگوباس و چالاكی و پەیامەكانی بگەیەنێتـە پێشمەرگە و ئەندام و دۆست و هـەوادارەكانی و جـەماوەری گەلەكـەمان. جگـه لـەدەركردنی

(بەلاغی عەسکەری)، (ڕێگای ئازادی) ئۆرگانی حزب و بڵاوکراوەی (پەیامی شۆڕشی کوردستانی عێراق) و (دەنگی پێشمەرگە)، لەهەوڵی ئەوەدا بووە، وەك حزبەکانی تری سەر گۆڕەپانی خەبات لەدژی دکتاتۆری، ڕادیۆیەك دابمەزرێنێت. بۆ ئەم مەبەستە، ڕێکخراوەکانی دەرەوە (ئەورووپا)ی حزب، ڕادەسپێرێت کەلەخەمی پەیدا کردن و کڕینی ئەم جیهازە (ڕادیۆ)دا بن... ئەوانیش، لێبڕاوانە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە نیشتمانی و حزبییە، دەکەونە خۆ. ڕێکخراوی دەرەوە (سوید)، کەئەو سەردەم یەکێك بووە لەڕێکخراوە چالاکەکانی حزب... (جەمیل محەمەد قادر بەگ)، ئامۆزای شەهید ملازم تاهیری عەلی والی، جیهازەکە دەکڕێت[٣٤١]. هەڵبەتە پارەکەش لەلایەن ئەندامانی ڕێکخراوەکانی دەرەوە، کۆ دەکرێتەوە[٣٤٢]. بەهەوڵی بێ پسانەوەی کاك جەمیل و ئازاد (ئازادە قەڵەو) و ساڵحە سوور، جیهازەکە لەبەهاری ١٩٨٣دا، دەگاتەوە شاخەکانی کوردستان[٣٤٣]. دوای ڕووداوەکەی پشت ئاشان (ئایاری ١٩٨٣)، بەهەوڵ و کۆشش و یارمەتی گروپێك لەکادیرانی ڕاگەیاندنی حزبی شیوعی عێراق، ئیستگەکە دادەمەزرێت. کادیرەکان بریتی بوون لە:

- ئەبو سوهێل (باوکی سوهێل)، ئەندازیار.
- ئەبو وەلید (باوکی وەلید)، ئەندازیار.
- فالح عەبدولجەبار، نووسەر.
- زوهێر ئەلجەزائیری، نووسەر[٣٤٤].

نەك هەر ئەم جارە، بەڵکو جارێکی تریش، حزبی سۆسیالیست، داوا لەحزبی شیوعی هاوپەیمان دەکات کەبۆ ڕایی کردن و بەرەو پێشبردنی ڕادیۆکەیان، چەند کادیرێکی (تەکنیکی، نووسەر، بێژەر)یان، بۆ بنێرێت. حزبی شیوعی بەدەنگ داواکەیان دێت و ئەم کادیرانەی ڕاگەیاندنی خۆیان دەنێرێت کەبۆ ماوەی سێ مانگ لەئیستگەکە دەمێننەوە و، کادیرەکانی سۆسیالیست لەسەر کاری (تەکنیك، بنچینەکانی کاری نووسەری ڕادیۆ، دەرهێنان، ئامادەکردنی بەرنامە)کان، ڕادەهێنن. کادیرەکان بریتی بوون لە:

- لەتیف حەسەن، نووسەر.
- ئەبو نور (باوکی نور)، بێژەر.

– ئەبو شەهاب (باوکی شەهاب)، ئەندازیار[٣٤٥].

دوای دامەزراندنی ئیستگەکە لەپشت شاخەکانی (زێوکە) و (ماشکان)[٣٤٦]، لەبەهاری ١٩٨٣دا، دەستی بەیەکەمین پەخش کردووە[٣٤٧].

ناوی ئیستگەکە دەبێتە: (دەنگی شۆڕشی کوردستانی عێراق)، تا داخرانی، هەر لەژێر ئەم ناوەدا، بەردەوامی دەبێت... ئەوکاتەی کە، (حزبی سۆسیالیستی کوردستان– عێراق)، دەبێتە خاوەن ئیزگە، چەند ئیزگەیەکی تریش لەچیاکانی کوردستانەوە، خەبات و پەخشیان دەکرد[٣٤٨].

مامۆستا (سەعد عەبدوڵڵا)، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و لێپرسراوی راگەیاندن بوو، جگە لەوتار نووسین، راستەوخۆ سەرپەرشتی ئیزگەکەشی دەکرد. بۆ ئەوەی هەوڵ و خەباتی ئەو پێشمەرگە خۆبەخشانە ون نەبن، بەپێی ئەو زانیاریانەی کەلەملا و لەولا، لەلامان کۆبوونەتەوە، هەوڵ دەدەین ناوی یەکە یەکەیان بێنین و، ئەو کارانەی کەئەنجامیان داوە، لەگەڵ شوێنی پەخشکردنی ئیستگەکە و بەرنامەکان، دەست نیشان بکەین.

*** یەکەم: شوێنی پەخشکردنی ئیستگە:**

- لەبەهاری ١٩٨٣، تاوەکو ئەیلولی ١٩٨٤، لەپشت گوندەکانی (زێوکە) و (ماشکان)، بووە.
- لەئەیلولی ١٩٨٤، گواستراوەتەوە بۆ گوندی (شووشان)[٣٤٩]، لەوێ دەستی بەپەخشکردن کردووە. تاوەکو لێکترازانەکەی حزب لە ١٣/٨/١٩٨٥.
- لە ١٣/٨/١٩٨٥، بۆ بناری قەندیل، گوندی (کاولان)، گواستراوەتەوە. لەوێ، دەست بەکار بووە تاوەکو هاوینی ١٩٨٨... لەهاوینی (١٩٨٨)ەوە، لەپەخشکردن وەستاوە تاوەکو راپەڕینی ئازاری ١٩٩١[٣٥٠].
- لەگەڵ دەست پێکردنی راپەڕین لە ٥/٣/١٩٩١، ئیستگەی (دەنگی شۆڕشی کوردستانی عێراق)، لە (نۆکان)[٣٥١]ەوە، دەستی بەپەخشکردن، کردۆتەوە[٣٥٢].
- ماوەیەکی کەم لە (نۆکان) دەبێت، دواتر بۆ شاری رانیە گواستراوەتەوە. لەکۆنە بارەگای تیپ (فرقە)ی چل و چواری سوپای عێراق، لەنێوان (رانیە و

چوارقوڕنه)، دەستی بەکار کردۆتەوە. ئەوکاتە لەرانیه و چوارقوڕنه، هەموو رۆژێك بەرنامەکانی خۆی بەزمانی کوردی و عەرەبی، لەسەر شەپۆلی ٧٥ مەتری، کاتژمێری حەوتی ئێوارە، بڵاوکردۆتەوە. هەمان بەرنامەی، بۆ رۆژی دوایی، کاتژمێری حەوتی سەر لەبەیانی، دووبارە بڵاوکردۆتەوە. تاوەکو (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)[٣٥٣]، لەگەڵ (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، تێکەڵ دەبێتەوە، بەردەوام بووە. دوای ئەمە، ئیستگەکەش داخراوە.

* **دووەم: نووسەر و کارمەندەکان:**

- بەشی کوردی: لەدەست بەکاربوونەوە تاوەکو لێکترازانەکەی ١٣/٨/١٩٨٥، (ئاسۆ حەسەن)، بەرپرسی بووە[٣٥٤].
- بەشی عەرەبی: لەدەست بەکاربوونەوە تاوەکو ١٣/٨/١٩٨٥، ئیحسان گلی ناسراو بە (خەسرەو)[٣٥٥]، بەرپرسی بووە.
- ئاسۆ حەسەن، دارا، رێبوار عەبدولڕەحمان، م. بەختیار[٣٥٦]، سەعد عەبدوڵڵا، ئەوانە نووسەری بەبڕشت و ئەکتیڤی بەشی کوردی بووینە. جگە لەمامۆستا سەعد، ئەوانی تر لەکۆتایی ١٩٨٥، حزبیان بەجێهێشتووە.
- جگە لە (خەسرەو)ی سەرپەرشتیکار، (م. بەختیار، دارا، هەڵمەت)[٣٥٧]، لەبەشی عەرەبی کاریان کردووە. ئەوەی دواییان (هەڵمەت)، بێژەرێکی باشی بەشی عەرەبی و ئینگلیزی بووە. پاش ئەوەی کەهەست دەکەن کەلەبەشی عەرەبی کەموکوڕیان هەیە، جارێکی تر داوا لەحزبی شیوعی دەکەن، چەند کادیرێکیان وەك هاوکار بۆ بنێرن. حزبی شیوعی بەدەنگیانەوە دێت و ئەم دوو کادیرەیان بۆ دەنێرێت:

١- ئەبو واثق: بەبنەچەکە کورد، خەڵکی خانەقین بوو. کادیرێکی رۆشنبیر و چالاك بوو. کوردی باش نەدەزانی.

٢- سەباح مەندەلاوی: ئەویش هەر خەڵکی خانەقین بوو. دوایی کچی (محەمەد مەهدی جەواهیری) خواست و بووە زاوای ناوبراو. دوای روخانی رژێم، لەشاری بەغدا بووە بەڕێوەبەری هونەر و رۆشنبیری لەوەزارەتی رۆشنبیری

لەبەغدا[٣٥٩].

- لەدوای ساڵی (١٩٨٥)، هەوار ئەنوەر بەرواری بووە بەرپرسی بەشی کرمانجی ژووروو. هەر لەم کاتەش (١٩٨٥-١٩٨٨)، شێرزاد شەریف شێخانی، بەرپرسی بەشی کرمانجی خواروو (سۆرانی) بووە. (عومەر بۆتانی)، ئەوکات لەسوریا (دیمەشق) بووە. پاش لێکترازانەکە، دێتەوە کوردستان و لەئیستگە دەست بەکار دەبێت و دەبێتە بەرپرسی بەشی عەرەبی.
- جگە لەم بەرپرس و نووسەرانەی ناومان هێناون، هەندێك پێشمەرگەی تریش بەئەرکی جیا جیا لەئیستگەدا، کاریان کردووە. نمونەی:
- سەید عەبدوڵڵا محەمەد (شێرکۆ): کاروباری بەڕێوەبردنی لەئەستۆ بووە. جاروبار وتاریشی نووسیوە. پۆستەری بۆ شەهیدان دروست کردووە. بابەتەکانی (ڕێگای ئازادی) و (گۆڤاری سۆسیالیست)یشی تایپ کردووە.
- عەبدوڵڵا ئیسماعیل حوسێن میرەکانی (مامۆستا فەرەیدون)، جگە لەڕێکخستن، کاری تەرجەمە و (تایپ)یشی دەکرد.
- عەبدولڕەزاق مەرزەنگ: لە ١٩٨٥ لەئیستگە کاری کردووە، پاشان لەگەڵ باڵی قادر عەزیز، ئیستگەی بەجێهێشتووە.
- هەر لەماوەی نێوان (١٩٨٦-١٩٨٨)دا، (فەرهاد خانەقینی)یش بەرپرسی بەشی عەرەبی بووە[٣٥٩].
- لەدوای ڕاپەڕین تاوەکو داخرانی ئیستگە لە (١٩٩٣/٢/١١) لەرانیە، مامۆستا حەسەن عوسمان ناسراو بەمامۆستا عەبدولکەریم، بەرپرسی ئیستگە بووە. کۆمەڵێك نووسەر، چ بەپاداشت یان وەك خۆبەخش، بابەتیان بۆ ئیستگە نووسیوە. لەوانە (کەریم دەشتی، عەباس عەبدوڵڵا یوسف، ئیسماعیل تەنیا). هەر لەم سەردەمەدا، (فوئاد ئەحمەد سلێمان)، وەك کادیرێکی چالاك کاری لەئیستگە کردووە.
- شاخەوان (سالار محەمەد کۆیی)، فەرهاد جاف، عەبدوڵڵا قەرەداغی، محەمەد ئەحمەد (خەڵکی کفری بووە)، بابە شێخ، م. ف. جەمال (مەریوان فەتحی قەڵادزەیی)[٣٦٠]، وەك نووسەر و کارمەند، کاریان کردووە.

- هونەرمەند دلشاد بەرواری ناسراو بە (كۆڤان)، وەك دەرهێنەر كاری كردووە.
- ئارام ناسراو بە (ئارامە سوور)، لەبەشی ئەنسات.
- كرێكار هەولێری (عەزەدین- خوارزای بەكر حەمە)، لەبەشی پەخشكردن.
- خالید گروانشی، هەردی، مەمۆ،... كۆمەڵێك خەڵكی تر[٣٦١].
- مامۆستا سەلاح كەركوكی، ناسر حەفید، پۆلا مارف بەرزنجی، بابەعەلی سلێمانی، هونەر هەولێری، ئەمانەش لەهەندێك قۆناغدا، وەك كارمەند، بێژەر، نووسەر، كاریان كردووە.
- عەبدولخالق زەنگەنە، عادل موراد، عەدنان موفتی، جاروبار لەدیمەشقەوە، بەزمانی عەرەبی بۆ بەشی راگەیاندنیان دەنووسی و تەرجەمەی كوردی دەكرا و، لەئیستگە و بلاوكراوەكانی حزبدا، بلاودەكرانەوە.
- رەسوڵ مامەند، قادر عەزیز، مامۆستا محەمەد شاكەلی، مارف عومەر گوڵ، جارویار بابەت و شرۆڤەیان بۆ ئیستگە دەنووسی.
- لەبەشی زۆری شار و شارۆچكەكاندا، پەیامنێری هەبوو... جگە لەپەیامنێرەكان، لەهەرێمەكانی پێشمەرگە و ناوچە و لق و رێكخراو و شانەكانی حزبەوە، هەواڵ و بابەت و دەنگوباس، بۆ ئیستگە دەهات و بلاودەكرانەوە.

### * سێیەم: بەرنامە و گۆشەكانی ئیستگە:

ئیستگە لەسەرەتای دەست بەكاربوونیەوە، تاوەكو داخرانی، بەچەند قۆناغێكی جودا جودادا تێپەڕیوە. لەهەر قۆناغێكیشدا، بەرنامەی هەمەچەشنەی هەبووە. بەرنامە هەبووە، ماوەیەك پەخش كراوە، بەلام لەگەڵ نەمان یان رۆیشتنی ئەو نووسەرەی كەئامادەی كردووە، بەرنامەكەش خامۆش بووە... هەندێك جاریش قۆناغە سیاسییەكە و جۆری پەیوەندی نێوان حزبەكان، بەرنامەی تازەی هێناوەتە ئاراوە، كەقۆناغەكە بەرنامەكانی فەرز كردووە...

هەوڵ دەدەین چەند بەرنامەیەك بەسەر بكەینەوە، ئەگەر زۆر كەمیش بێت، چونكە تا ئێستاش لەزاكیرەی ئێمەمانان هەر زیندوون و گەرد و تۆز و

گرفتەکانی ژیان، نەیانتوانیوە خامۆشیان بکەن.

**١- کردنەوەی ئیستگە بەچەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز.**

**٢- سەروتار، یان وتەی ئیستگە:** ئەمە بابەتی رۆژ بوو، پاش ئەوەی کەئیستگە بەخوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئان دەکرایەوە، وتاری ئیستگەش دەخوێندرایەوە. ئەوکاتە، چ روداو و پێشهاتێك، باسی رۆژ بوایە، ئیستگەش هەروەستەی لەسەر دەکرد و هەڵوێستی حزبی روون دەکردەوە. بابەتەکانیش بەپێی قۆناغ دەگۆڕان. بۆ نموونە: (شەڕی براکوژی، بەرقەرار بوونی ئاشتی، شەڕی عێراق- ئێران، سەردانی وەفدی حزب بۆ دەرەوە، پەیوەندییە ناوخۆیی و هەرێمیەکان، هەڵوێست وەرگرتن لەدانووستاندن لەگەڵ حکومەت، راپەڕینی جەماوەری، راپەڕینی خوێندکاران، وێرانکردنی دێهاتەکان،...تاد). ئەمانە، زۆر جاران دەبوونە هەوێنی وتەی ئیستگە... شێوەی خوێندنەوەشی، ئاسایی بوو، حەماس و دەنگ هەڵبڕینی تێدا نەبوو.

**٣- چالاکییەکانی پێشمەرگە:** بریتی بوو لەخوێندنەوەی شەڕ و چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگەی حزب (هەندێك جارانیش هاوبەش لەگەڵ لایەنەکانی جود)، لەدژی هێزەکانی سوپا و جاش، لەناو شار و شارۆچکە و ناوچەکانی تری کوردستان. لەم رووەوە زیانەکانی دوژمن و دەستکەوتەکانی پێشمەرگە و ژمارە و ناوی هێزی بەشدار بوو، بەیان دەکرا. جگە لەچالاکی پێشمەرگە، باسی چالاکییەکانی رێکخستنەکانی حزب لەناو شار و شارۆچکەکانیشدا، دەکرا، کەبەزۆری بریتی بوون لە: (بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکانی حزب، بڵاوکردنەوە و هەڵواسینی پۆستەری شەهیدان لەسەر دیواری کوچە و شەقامەکان، تەمبێ کردنی جاش و ئەو کەسانەی کەبەشێوەیەك لەشێوەکان، هاریکاری رژێمیان دەکرد، بڵاوکردنەوەی هەواڵی سەردانەکانی وەفدی حزب لەدەرەوەی وڵات،...تاد). هەندێك جاریش، ئەگەر ئەم رۆژە هەواڵ و چالاکی کەم بوایە، هەوڵدەدرا بەبڵاوکردنەوەی هەندێك چالاکی هونەری و رۆشنبیری، کەلێنەکان پڕ بکرێنەوە.

**٤- خەباتی گەلان:** هەر جارەی باس لەئەزموون و خەباتی یەکێك لەو گەلانە دەکرا، کەلەقۆناغێك لەقۆناغەکاندا، وەك نەتەوەی کورد، بن دەست بووینە،

لەئـەنجامی خـەباتی نەپـساوەیاندا، توانیویانـە لـەژێر دەسـەڵاتی داگیرکەرانـدا رزگار بن و سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن... ئەو گەل و وڵاتانەی هەمیشە باس دەکران، بریتی بـوون لـە: لاوس، کـەمبۆدیا، ئـەفریقای باشـوور، شـیلی، کوبـا، خـــەباتی رزگـــاریخوازی فەلەســـتین، یـــەکێتی ســـۆڤیەت، لیبیـــا، باشـــووری سودان،...تاد.

**٥- داستانەکانی پێشمەرگە:** بەشێوەیەکی ئەدەبی و تێکەڵ کردنی سۆز و واقیـع، باسـی ئـەو شـەڕانە دەکـرا، کەشـەڕی گـەورە و قارەمانانـە بـوون، توانیبوویان لەهزر و بیری پێشمەرگە و جەماوەر جێگیر بن... شەڕەکان گەورە بوون، ژمارەیەکی کەمی پێشمەرگە بەرامبـەر بـەهێزی زۆر و زەوەنـدی سـوپا و جاش و بەبەشداری فڕۆکە و تانك و تۆپی دوورهاوێژ، لەگەڵ ئەوەی کەتەرازووی هەردوو هێزەکە، زۆر لاسـەنگ بووینـە، ئـەوجا پێشمەرگە توانیویانـە شـەڕێکی گـەورەی (داسـتان ئـامێز)، تۆمـار بکـەن... ئـەو شـەڕ و داسـتانانە، لەسـاڵانی (١٩٨٣-١٩٨٥)دا، ئاسـۆ حەسـەن، دەینووسـی و شـەهید هەڵمـەت (ئیـبراهیم حەمیـد هـەولێری)، بەدەنگـە پـڕ لەسـۆز و حەماسـەتەکەی دەیخوێنـدەوە... نموونـەی هەنـدێك لەشـەڕەکان: (داسـتانی دەشـیتۆ، سمـاقوڵی، شـێرەمەڕ، شیوەپیران، شەڕی چیای هەورێ، شەڕی گرتنـی خـەبیرە فەڕەنـسیەکان....). زۆربەی ئەو شەڕانەی کەباس دەکران، ئـەو شـەڕانە بـوون کەلـەدژی هێزەکـانی رژێم ئەنجامدرا بوون.

**٦- لـەڕێگای ئازادیـدا:** ئەمـەش چـۆن لەرۆژنامـە، ئۆرگـانی حـزب (ڕێگـای ئازادی)، گۆشەیەکی جێگیر بوو لەدوا لاپەڕەدا، بەهـەمان شـێوە، لەئیـستگەش ببووە گۆشەیەك. لـەم بەرنامەیـەدا باسـی ژیاننامـە و سـاڵانی خـەباتی حزبـی و پێـــشمەرگایەتی و شـــوێن و کـــات و چـــۆنیەتی شـــەهید بـــوونی یـــەکێك لەپێشمەرگەکانی حزب، دەکرا... ئەو کەسـەی کەبەرنامەکـەی ئامـادە دەکـرد، ژیاننامەکەی بەشـێوەیەکی ئـەدەبی، پەخـشان ئـامێزی پـڕ لەسـۆز دەنووسـی. ئەوەی دەشیخوێندەوە، دەنگێکـی وای هـەبوو، کەکاریگـەری لەسـەر هەسـت و ســـۆزی بیـــسەران، بەجێدەهێـــشت. لـــەکاتی خوێندنـــەوەی بەرنامەکـــەدا، مۆسیقایەکی غەمگینی ماتەم ئامێزی لەگەڵ پەخش دەکرا.

**٧- رای جەماوەر:** لەم بەرنامەیەدا، هەڵوێستی چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردی لەبارەی شەڕ و بەرگری و پێکدادانی نێوان حزبەکان و رەفزکردنەوەی خزمەتی سەربازی و بوون بەجەیشی شەعبی و...تاد، روون دەکرانەوە. جاروباریش گفتوگۆ لەگەڵ خەڵك دەکرا، بەتایبەتیش ئەو خەڵکانەی کەلەژێر سێبەری ناوچە ئازادکراوەکاندا، دەژیان.

**٨- ئەدەب و شۆڕش،** یان ئەدەب و رۆشنبیری: لەم بەرنامەیەدا، باسی رۆڵی ئەدەب لەشۆڕش و قۆناغی رزگاری گەلاندا، دەکرا. جاروبار، (شیعر، چیرۆك)[٣٦٢]ێك، دەخوێندرایەوە (هەڵبەت شیعر و چیرۆکی بەرگری)، ناوەڕۆکەکەی شیدەکرایەوە و هەڵدەسەنگێندرا، زێتر جەخت لەسەر لایەنە پۆزەتیفەکەیەوە دەکرایەوە... هەواڵ و کۆڕ و چالاکییە ئەدەبیەکان (ئەوانەی کەلەناوچە ئازادکراوەکان ئەنجام دەدران)، پەخش دەکران. ئەم گۆشەیە، لەسالآنی (١٩٨٣-١٩٨٥)، لەلایەن ئیحسان گلی (خەسرەو)، بەرپرس و بێژەری عەرەبی دەخوێندرایەوە. هەندێك جارانیش شەهید هەڵمەت دەیخوێندەوە. ئەمانە، هەردووکیان دەنگێکی باش و کاریگەر و پڕ لەحەماسەتیان هەبوو.

**٩- لێرە و لەوێ:** بڵاوکردنەوەی کورتە هەواڵی سەرنج راکێش و هەمەڕەنگ بوو، زێتر ئەو هەواڵانە بوون کەلەژێر سایەی رژێمدا روویاندابوو. هەواڵەکان، هەواڵی ئاسایی و باو نەبوون. دوای خوێندنەوەی هەواڵەکە، کۆمێنتێکی تەنز ئامێزیشی لەگەڵدا بڵاو دەکرایەوە.

**١٠- رژێم لەرۆژنامە عەرەبی و جیهانییەکاندا:** بەکورتی باسی ئەو گۆڤار و رۆژنامانە دەکرا کەوتاریان لەسەر شەڕ و سیاسەتی دیکتاتۆریانەی سەدام، بڵاو دەکردەوە. ناوی نووسەرەکە دەهێنرا و چەند برگەیەکیشی لێدەخوێندرایەوە.

**١١- جگە لەو بەرنامە جێگیرانە،** زۆر جارانیش وتاری درێژ درێژ، بەزنجیرە و بەچەند رۆژێك دەخوێندرایەوە. ئەمانەش تایبەت بوون بە: (شۆڕشەکانی کورد، تەعریب و تەهجیر، ژیاننامەی سەرکردە کوردەکان).

*** چوارەم: زمان، ماوە، کات و شوێنی پەخشکردن:**

سەرەتا کەئیستگە دامەزرا، ماوەی بەرنامەکانی تەنها یەك کاتژمێر بوو، چل و پێنج خولەك بەکوردی و پازدە خولەکیش بەزمانی عەرەبی بوو. پاشان، وردە

ورده ماوەی پەخشی بەرنامەکان زیاد کرا... لەهەندێك قۆناغدا، دوو کاتژمێر بەزمانی کوردی و نیو کاتژمێر بەزمانی عەرەبی و پازدە خولەکیش بەزمانی ئینگلیزی، پەخش دەکرا. لەبەشە کوردییەکەی، هەواڵ و چالاکی و بابەت بەدیالێکتی (کرمانجی ژووروو)ش، دەخوێندرایەوە.

بۆ مەسەلەی کات و شەپۆلەکانی پەخشکردن، هەموو کاتێك وەك یەك نەبووە. بۆ ئەم مەبەستە، دەقی ئەم پروپاگەندە (ریکلام)ە بڵاو دەکەینەوە کەلەژمارە (٢٤)ی (ڕێگای ئازادی)دا بڵاوکراوەتەوە. لەوێدا هاتووە: (دەنگی شۆڕشی کوردستانی عێراق هەموو رۆژی بەرنامەکانی خۆی لەسەر شەپۆلێکی کورتی ٤١ مەتری بەرامبەر بە ٧,٥ مێگاهێرتز لەسەعات ٣ی پاش نیوەڕۆ بەکاتی هاوینی بەغدا، بۆ ماوەی نیو سەعات بەزمانی کوردی و لەسەعات چواریشەوە بەزمانی عەرەبی بڵاو دەکاتەوە)[٣٦٣].

*** پێنجەم: گرفتەکان: گرفتی پێشکەوتن و بەردەوام بووی ئیستگە زۆر بوون، لەوانە:**

– نەبوونی کادیری شارەزا: ئەوانەی لەم بوارەدا کاریان دەکرد، زۆربەیان ئارەزوومەند بوون. جگە لەمەش، ژمارەیان زۆر کەم بووە. هەربۆیە هەندێك جار ناچار بووینە کادیری راگەیاندن، لەحزبە هاوپەیمانەکان، بخوازن. زمان زانیش، بەتایبەتی زمانە زیندووە جیهانییەکان، ئەمەش یەکێکی تر بووە لەگرفتەکان. لەم رووەوە، کادیری زمانزان، زۆر کەم بووە. ئیستگەش وەك دەڵێن: وەك ئاش (ئاسیاو) وایە، هەر تێیکەی هەرگیز ناڵێ بەسە و هەر داوا دەکات...

– نەبوونی شوێنی پێویست: دەبوایە ئەم شوێنەی کەئیستگەی لێدادەمەزرێت، یارمەتیدەر بێت تاوەکو زۆرترین خەڵك بتوانن گوێگری بن. جگە لەمەش، خانوو و ژووری پێویست، یان نەبووە، یان زۆر کەم بووە. شەڕی ناوخۆش، سەرباری هەموو ئەمانە، وای کردبوو کەجیهازی ئیستگە هەردەم لەسەر پشتی هێستر بێت، هەر ماوەیەو لەشوێنێك بگیرسێتەوە.

– تەشویش (هانی هانی) خستنە سەر شەپۆلەکانی ئیستگە لەلایەن رژێمەوە، ئەمەش گرفتێکی بەرچاو بوو.. رژێم هەوڵی دەدا بەهەموو شێوەیەك

پەیام و دەنگ و باسی حزب و پێشمەرگە نەگاتە جەماوەر. بۆ ئەم مەبەستە، هەر ماوەیەو جۆرە تەشویشێکی دەخستە سەر شەپۆلەکانی بڵاوکردنەوە... جاری وا هەبووە تا کورتە هەواڵێك خوێندراوەتەوە، دوو سێ جار جێگۆڕکێ بەشوێنی پەخشکردنی کراوە. دەبوایە بەردەوام دەستت لەسەر میلی شوێن گۆڕینی رادیۆ بێت، تاوەکو بتوانی هەواڵەکە ببیستی... لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لەهەندێك قۆناغدا، پەخشی ئیستگە زۆر بەهێز بووە، جگە لەکوردستان، (لەبەهاری ١٩٨٤ پەخشەکەی گەیشتۆتە بەغدا و سوریا و تاران و کوێت)[٣٦٤].

## ١- یەكێتی قوتابیانی كوردستان:

ئـەم رێكخـراوە سـالێك دوای دامەزرانـدنی (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی كوردسـتان) و لەسـالی ١٩٧٧دا، دامـەزراوە. خۆیـان بەدرێژەپێـدەری (یـەكێتی قوتابیـانی كوردسـتان- عێـراق)ی سـەر بـە (پـارتی دیمـوكراتی كوردسـتان- عێراق)، زانیوە، كەلەرۆژی ١٩٥٣/٢/١٨دا، دامـەزرابوو. بۆیـە ناوەكـەی خۆیـان نەگۆڕیوە. لەسەردەمی شۆڕشی نوێ (١٩٧٦-١٩٩١)یشدا، بۆ ئـەوەی لەگـەڵ ئـەو رێكخـراوەی قوتابیـان (پـارتی دیمـوكراتی كوردسـتان)دا جیـا بكرێتـەوە، ئـەوەی سۆسیالیـست نـاوی (یـەكێتی قوتابیـانی كوردسـتان) و ئـەوەی پـارتی (یەكێتی قوتابیانی كوردستان- عێـراق) بـوو. تـەنها جیاوازیەكـەیان، داش (-) عێراق بووە و بەس.

(كـاردۆ گـەلالی)، ئەنـدامی كۆمیتـەی ناوەنـدی (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی كوردستان)، دامەزرێنەری ئەم رێكخراوە بووە. هەر خۆی داینـەمۆی سـەرەكی بوو. ئەندامە چـالاكەكانی ئـەوكاتی (سـەردەمی خـەباتی ژێـر زەمینـی ١٩٧٧-١٩٧٩)، ئەمین قادر (مامۆسـتا ئـەمین) و كامـەران قـادر شـۆڕش و سـەلاحەدین محەمـەد ئیـسماعیل و سمكـۆ ئـەنوەر و بـەلێن عەبـدوللا و بـەهرۆز گـەلالی و محەمـەد عومـەر ئەحمـەد (مامۆسـتا دارا) و رێبـوار عەبـدولڕەحمان و عومـەر محەمەد ئەمین (مامۆستا كاوە) و ئاسـۆ حەسـەن و ئیحسان گلـی (خەسرەو)، بوون.

كـاردۆ گـەلالی، لەبـەر ئـەوەی لەسـەردەمی شۆڕشـی ئەیلولـدا، كـادیرێكی چـالاكی پـارتی و (یـەكێتی قوتابیـانی كوردسـتان- عێـراق) بـوو، لەگـەڵ دامەزراندنی بزوتنەوەدا، هەستی بەرۆڵی چالاكی قوتابیان لەشـۆڕش و خـەباتی ژێر زەمیندا كردبوو، بۆیە زوو كەوتە خـۆیی و بـەزووترین كـات، لـەنێو ئەندامـە چالاكەكانی بزوتنەوەدا، كـەقوتابی بـوون، ئـەم یەكێتیـەی زینـدوو كردۆتـەوە و تۆڕێكی فراوانی نهێنی لەقوتابیان، دروست كرد.

(یـەكێتی قوتابیـانی كوردسـتان) لەسـەردەمی شـاخدا، سـەرەڕای خـەباتی پیشەیی هـانی ئەندامەكانیـشی داوە كەلـەكاتی پێویـست پەیوەنـدی بەشـاخ و

ریزەکانی پێشمەرگەوە بکەن. کۆمەڵێك چالاکیشیان ئەنجامداوە، وەك:

- بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (خەباتی قوتابیان) کەژمارە سفر (٠)ی لەمانگی کانوونی دووەمی ١٩٨٣دا، دەرچووە.
- دروست کردنی پۆستەر بۆ شەهیدانی حزب.
- بەشداری کارای لەخۆپیشاندانەکانی قوتابیانی کوردستان و بڵاوکردنەوەی دروشمەکانی ئەم رێکخراوە و حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەناو شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا، کردووە.
- سازکردنی کۆڕی شیعر و چیرۆك خوێندنەوە لەناوچە ئازادکراوەکاندا.
- بەشداریکردنیان لەئاهەنگ و بۆنە نیشتمانیەکاندا، نموونەی: نەورۆز، یەکی ئایار، ساڵرۆژی دامەزراندنی حزب...تاد.
- بەشداریکردنیان لەکۆبوونەوەی (رێکخراوە دیموکراتیەکانی لاوان و قوتابیانی کوردستان و عێراق). ئەم رێکخراوە لە (لۆلان)، لەکۆبوونەوەیەکی فراوانی نێوان رێکخراوەکانی قوتابیان و لاوانی هەموو حزب و لایەنەکانی بەرەی (جود)، لە ١-٣/٦/١٩٨٤دا، دامەزرابوو. دوای دامەزراندنیان، گۆڤارێکیشیان بەناوی (دەنگی لاوان و قوتابیان) دەردەکرد، کەیەکەم ژمارەی لەحوزەیرانی ١٩٨٤، بە (٥٨) لاپەڕە لەچاپخانەی (خەبات)ی پارتی دیموکراتی کوردستان دەرچووە. ژمارە (٩)ی لەتشرینی دووەمی ١٩٩٠، بە (٨) لاپەڕە دەرچووە[٣٦٥].
- چەندین ئەندامی چالاکیان لەریزەکانی خەباتی شۆرشگێڕانەی (پێشمەرگایەتی و رێکخستن)دا، شەهید بووە، لەوانە: (کاردۆ گەلاڵی و سەلاح محەمەد و دیار سۆربەشی و...تاد).
- بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و روونکردنەوەی هەڵوێست لەئاست رووداوە گەرمەکاندا. لەسەردەمی شاخ، تاوەکو ١٩٨٥، رێبوار عەبدولڕەحمان لێپرسراوی سەرەکی بووە. دوای رێبوار، لەساڵی (١٩٨٦-١٩٩١)، هەڤاڵ (هەنگاو عەبدوڵڵا خان)، لێپرسراوی یەکەمی بووە. ئەم رێکخراوە، لەدوای راپەڕین، لەگەڵ (یەکێتی لاوانی سۆسیالیستی کوردستان) یەکیان گرتووە و ناوەکەیان بۆ (یەکێتی قوتابیان و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان) گۆڕاوە.

لــەدوای راپــەڕین، جگــە لەچــالاکی رێکخراوەیــی و حــزبیش، لــەرووی راگەیاندنیشەوە دەست پێشخەر بووینـە و ئـەم بڵاوکراوانـەیان دەرکـردووە: (زەنـگ، زمنـاکۆ)، کەلەلاپــەڕەکانی پێـشووتردا بەدرێـژی باسمـان لێـوە کردوون.

هــەروەها لــەدوای راپــەڕین، تیپێکــی مۆسیقاشــی هــەبووە بــەناوی تیپــی مۆسیقای (شەهید کاردۆ)، کەهونەرمەندان: (مستەفا رەئوف و زیـاد ئەسعەد و محەمەد عەزین)، بەڕێوەیان دەبرد.

## ٢- یەکێتی لاوانی سۆسیالیستی کوردستان:

ئەم رێکخراوە لەئەنجامی کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵێك لاوی پێشمەرگەی حزبـی سۆسیالیستی کوردسـتان، کەلەرێکـەوتی ١٩٨٣/٤/٤، لەناوچـە ئازادکراوەکانـدا بەسترا، دامەزرا. بەشێك لەو لاوانەی کەدەستیان هەبوو لەدامەزرانـدنی یـەکێتی قوتابیـانی کوردسـتان، بوونـە دەسـتەی دامەزرێنــەری یـەکێتی لاوان. یـەکێتی لاوان، سـەرەڕای بەشـداری کردنیـان لەچالاکیەکانی پێـشمەرگە لـەدژی رژێـم، لـەپێناوی هێنانـەدی ژیـانێکی ئـارام و پـڕ لەبەختــەوەری بـۆ گـەنجان، لـەژێر دروشمـەکانی: (سەربەسـتی، دیموکراسـی سۆسیالیـستی، ئاشـتی)، خـەباتیان دەکرد. رێبوار عەبدولڕەحمان، ئیحسان گلـی (خەسرەو)، سـەلام مـەلا سـەید نوری[٣٦٦] ناسراو بە شێرکۆ، فەرەیدون مورشـید خورشـید (فـاروق)، ئیـبراهیم ئەحمـەد (شـوان)، حـەکیم مـەلا قـادر (دلاوەر)[٣٦٧]، ئەندامـە چالاکەکانی ئـەم رێکخراوە بوون.

یەکێتی لاوان، لەخەباتی پێشمەرگایەتی دا، کۆمـەڵێك شـەهیدی بەخشیوە، لەوانە: (فاروق، شێرکۆ مـەلا نـوری، شـوان، کرێکـار، ئیـدریس، دلاوەر...تـاد). یەکــەمین بــەیانی دامەزرانـدنیان لــەرۆژی ١٩٨٣/٤/٤دا، بڵاوکردۆتــەوە. جگــە لەخــەباتی پێـشمەرگایەتیدا، وەك یــەکێتی قوتابیــان، بەشــدارییەکی کارایــان لەجۆشــدانی خــەباتی سیاســی و هانــدانی گــەنجان بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی سیاســەتەکانی رژێــم دا، کــردووە. لەشــار و شارۆچــکەکاندا، بەشــدارییان لەخۆپیشاندانەکاندا کردووە. بەیاننامە و پۆستـەری شـەهیدان و بڵاوکراوەکـانی

حزبیـــان لـــەناو جـــەماوەردا بڵاوکردۆتـــەوە. ڕێنـــوێنی کـــار و چـــالاکییەکانی پێشمەرگەیان لـەناو شـار و شارۆچـکەکاندا کـردووە. هـەروەها، گۆڤارێکیـشیان بەناوی (ڕێبازی لاوان)، بڵاوکردۆتـەوە کەیەکـەم ژمـارەی لـەمانگی ئـابی سـاڵی ١٩٨٣دا دەرچووە. ئەم گۆڤـارە، سـەرەڕای هـەواڵ و چـالاکییەکانی گـەنجان و ڕێنـوێنی کردنـی شـێوەکانی خـەبات، بابـەتی ئـەدەبی لەشـیعر و چـیرۆکیش، بڵاوکردۆتەوە. بەشدارییەکی کارایـان لەگـەڵ ڕێکخراوەکـانی قوتابیـان و لاوانـی سەر بەحزبەکانی ناو بەرەی (جود)دا کردووە و ئەندامی ئەو کۆبونەوە هاوبەشە بووینــە کەئــەم ڕێکخراوانــە لــەرۆژانی ١-٣/٦/١٩٨٤، لەناوچــەی (لــۆلان)دا، بەستوویانە.

لەقۆناغی دوای راپەڕین، هەردوو ڕێکخراوی یەکێتی قوتابیان و یەکێتی لاوان یــەکیان گــرت و ڕێکخراوێکــی تازەیــان بــەناوی (یــەکێتی قوتابیــان و لاوانــی سۆسیالیستی کوردستان) دامەزراند.

## ٣- یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردستان:

هەرچەندە چـەندین مامۆسـتا لـەریزەکانی هێـزی پێـشمەرگەی کوردسـتان و ڕێکخستنەکان و سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیـستی کوردسـتاندا، چ لەشـاخ، چ لەشاردا، خەباتیان کردووە، بەڵام لەپێش راپەڕین (١٩٧٦- ئازاری ١٩٩١)، ئەم ڕێکخراوە، بەشێوەی ڕێکخراوی سەربەخۆ، بوونی نەبووە. چـەندین مامۆسـتای وەك: (عەلی هەژار، مەلا ناسیح ئیسماعیل، سەعد عەبدوڵڵا، ئـەمین قـادر، شـێخ محەمەد شاکەلی)، لەشـار بەپیـشە مامۆسـتا بووینـە و دواتـر بوونەتـە ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی و مەکتـەبی سیاسـی. هـەروەها چـەندین مامۆسـتای تـریش نمونەی: (عەبدوڵڵا حاجی سمایل میرەکانی (فەرەیدون)، عـەلی ئەکبـەر فـەیزڵڵا (دلـشاد)، محەمــەد عومــەر ئەحمــەد (دارا)، سـلێمان ئەسـعەد دۆڵەبـەکرەیی (ڕێبوار)، شێرزاد عومەر عوسمان، خالید ئەحمەد) پێش ئەوەی ببنە پێشمەرگە مامۆستا بووینە و رۆڵی کادیری ڕێکخستنیان بینیوە.

لەسەردەمی شاخ، بەکردەوە تەنها یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان (یـەکێتی مامۆستایانی کوردستان)ی هەبووە. دوای راپەڕین، هەر حزبەو دەیویست خۆی

سەرکردایەتی ئەو توێژە کاریگەر و زۆر و زەوەندەی کوردستان بکات. بۆیە بەرەنجامی ئەم کێبڕکێیە، هەموو حزبەکان (بەگەورە و بچووکەوە)، ڕێکخراوی (یەکێتی مامۆستایان)ی تایبەت بەخۆیان، دروست کرد.

(حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، لەمانگی ئەیلولی ١٩٩١دا، لەگەڵ دەست پێکردنی ساڵی نوێی خوێندن، لەسەرکردایەتییەوە ڕێنوێنی ئەندامەکانی کرد، بەو ئاڕاستەیە کار بکەن و هەرچی زووترە ئەم یەکێتیە دروست بکەن، تاوەکو بەگوێرەی سەنگی خۆیان لە (یەکێتی گشتی مامۆستایانی کوردستان)، پێگەی خۆیان هەبێت. بەم شێوەیە، داواکاری ئاڕاستەی لقەکان کرا، بۆ ئەم مەبەستە بکەونە خۆ. لەکەسی یەکەمی لقەکانیشەوە، ڕاستەوخۆ پشتگیریان لێدەکرا.

لەهەولێر، کەبنکەی سەرەکی (پایتەخت)ی جموجۆڵی سیاسی و ڕێکخراوەیی هەموو حزبەکان بوو، دەست کرا بەکۆبوونەوەی ڕێکخراوی مامۆستایان. من (ئیسماعیل تەنیا)، بەو سیفەتەی کەئاگاداری دروست بوونی (یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردستان) بووم، لەلایەن لێپرسراوی لقی هەولێری حزب (مامۆستا سەعد عەبدوڵلا)وە، ئاڕاستە کراین کەبەشداری ئەو کۆبوونەوانە بکەین بەئاڕاستەی دروست کردنی (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان). مامۆستا سەرەکییەکانی لقی هەولێر بریتی بوون لە: (حەمید ئیبراهیم، شێرزاد عومەر عوسمان، ئیسماعیل تەنیا، محەمەد ڕەحمان)، دواتریش، مامۆستایان: (وەیسی ساڵح، تەحسین عەلی شێروانی، ڕەشید ئەحمەد ڕەواندزی، جەعفەر حوسێن، مامۆستا شەمسەدین، ڕەمەزان ڕەسوڵ عومەر، ماجید محەمەد ئەمین حوسێن، عەبدولعەزیز عەدۆ، پشتیوان، عەونی، ئیبراهیم مەدحی ئیبراهیم)، پەیوەندیان بەم ڕێکخراوە تازە دامەزراوە کرد.

یەکەم کۆبوونەوەی مامۆستایانی حزبەکان، لەبارەگای حزبی شیوعی عێراق (نەقابەی کرێکارانی سەردەمی بەعس)، لەفلکەی ئاوی کەسك و سوور (نافورە)، نێوان شارەوانی هەولێر و هوتێل شێراتۆن، بەسترا. سەرەتا، هەر نوێنەری (یەکێتی) و (پارتی) و (شیوعی) و (سۆسیالیست) بوون. من (ئیسماعیل تەنیا) و حەمید ئیبراهیم، نوێنەری سۆسیالیست بووین. عوسمان دەشتی و مامۆستا (ڕێبوار)ی مەڵبەندی هەولێر، نوێنەری یەکێتی و ئەنوەر

سلێمان، نوێنەری حزبی شیوعی و محەمەد ئیسماعیل نوێنەری پارتی، بەشداری کۆبوونەوەکە بووین. لەگەرمەی گفتوگۆ و را گۆڕینەوە و پلان دانان بۆ کاری داهاتوو، عوسمان دەشتی گوتی: جگە لەیەکێتی نیشتمانی کوردستان، حزبەکانی تر رێکخراوی مامۆستایانیان نییە. ئەوەی دروستیان کردووە تەنها بۆ کێبڕکێ و (بدعە)یە. ئەنوەر سلێمان، نوێنەری حزبی شیوعی بەرپەرچی دایەوە و باسی رابردووی خەباتی حزبی شیوعی لەم بوارەدا کرد. هەروەها نوێنەری (پارتی)ش، بەهەمان شێوە هاتە قسە.

لەدوای ئەم کۆبوونەوەیە، وردە وردە کۆبوونەوەکان، بەردەوام بوون. نوێنەری ئێمە لەم کۆبوونەوانەدا، بەگشتی بریتی بوون لە: (حەمید ئیبراهیم، شێرزاد عومەر، ئیسماعیل تەنیا، وەیسی سالح، محەمەد رەحمان). یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردستان– مەکتەبی سکرتاریەت، کەتازە چەند مانگێك بوو دروست ببوو، یەکەم بەیاننامەی خۆی لەپاش کۆبوونەوەیەکی فراوان کەنوێنەری هەموو لقەکان، لەرانیە تیایدا بەشدار و ئامادە ببوون، لەرۆژی ٢٧/١٢/١٩٩١دا، بڵاوکردەوە. لەناوەڕۆکی بەیاننامەکەدا هاتبوو:

- یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردستان لە ٢٧/١٢/١٩٩١، لەشاری رانیەی راپەڕین کۆبوونەوەیەکی فراوانی سازکرد بۆ ئەندامانی مەکتەبی سکرتاریەت و لێپرسراوانی دەستەی لقەکانی دیالا و سلێمانی و کەرکوك و هەولێر و دهۆك و نەینەوا بۆ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ دەربارەی هەندێ کێشە و کاروباری پەیوەندیدار بەجوڵانەوەی پیشەیی مامۆستایان.
- کارکردن بۆ پتەوکردنی بەرەی کوردستانی و پشتگیری کردنی.
- پێشنیارکردن بۆ پێکهێنانی لیژنەی خۆ سازکردن بۆ کۆنگرەی یەکگرتووی هەموو مامۆستایانی کوردستان، لەهەل و مەرجی گونجاودا.
- جەخت کردنەوە لەسەر داوا رەواکانی مامۆستایان و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانیان.
- گۆڕانکاری بنەڕەتی لەکەرتی پەروەردە و فێرکردن.

پاش ئەم بەیاننامەیە، لقەکانی یەکێتی مامۆستایان، بۆ بەستنی یەکەم کۆنفرانس کەوتنە خۆ. بۆ ئەم مەبەستە، لەرۆژی یەك شەممە ١٦/٢/١٩٩٢،

کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ، لەبارەگای لقی هەولێری حزب، (٢٥) مامۆستا ئامادەبوون، بۆ هەڵبژاردنی نوێنەری خۆیان بۆ کۆنفرانس. بۆ نوێنەرایەتی لقی هەولێر، ئەم مامۆستایانە خۆیان پاڵاوت و بەم شێوەیە دەنگیان هێنا: (شێرزاد عومەر ١٩ دەنگ، محەمەد رەحمان ١٩ دەنگ، ئیسماعیل تەنیا ١٧ دەنگ، وەیسی ساڵح ١٧ دەنگ، رەشید ئەحمەد ١٦ دەنگ، تەحسین عەلی شێروانی ١٥ دەنگ، حەمید ئیبراهیم ١٥ دەنگ، مامۆستا شەمسەدین ١١ دەنگ، مامۆستا سەباح ١١ دەنگ، عەبدولعەزیز عەدۆ ١٠ دەنگ).

پاش جیاکردنەوەی دەنگەکان: (شێرزاد عومەر، محەمەد رەحمان، ئیسماعیل تەنیا، وەیسی ساڵح، رەشید ئەحمەد)، بوونە نوێنەری لقی هەولێر بۆ بەشداریکردنی کۆنفرانس. هەروەها مامۆستایان: (حەمید ئیبراهیم و تەحسن عەلی و شەمسەدین)یش بوونە ئەندامی یەدەگ بۆ کۆنفرانس.

کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆی رۆژی ١٩٩٢/٢/٢٠، لەبارەگای مەکتەبی سیاسی حزب لەرانیە، بەئامادەبوونی هەموو لقەکانی (هەولێر، سلێمانی، دهۆك، کەرکوك، راپەڕین)، کۆنفرانس دەستی بەکارەکانی خۆی کرد. سەرەتا، (رەسوڵ مامەند)، سکرتێری حزبی سۆسیالیستی کوردستان، وتارێکی پێشکەش کرد و کۆنفرانسەکەی کردەوە. دواتر، (د. مەحمود عوسمان) وتەیەکی پێشکەش کرد. ناوەڕۆکی هەردوو وتەکە، بریتی بوون لەگێڕانەوەی چۆنیەتی دروست بوونی حزب و رۆڵی لەخەباتی چەکداری و دروستکردنی بەرەی کوردستانی و خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنی گشتی لەکوردستاندا. لێپرسراوی لقی سلێمانی حزب (محەمەدی حاجی مەحمود)یش ئامادەی کردنەوەی کۆنفرانسەکە بوو. دوای پێشکەش کردنی ئەم دوو وتارە، وتاری لقەکان، بەم شێوەیە خوێندرایەوە:

- لقی سلێمانی لەلایەن حسام حەکیم.
- لقی هەولێر لەلایەن شێرزاد عومەر عوسمان.
- لقی دهۆك لەلایەن عەبدوڵلا عەبدولکەریم بامەڕنی.
- لقی کەرکوك لەلایەن حەمە سەعید سابیر.
- لقی راپەڕین لەلایەن عوسمان مەحمود ئەحمەد.

پـاش نیـوەڕۆی هـەمان ڕۆژ، کۆمـەڵێك لیژنـە بـۆ بـەڕێوەبردنی کـۆنفرانس دروست کران، کەبەم شێوەیە بوو:

أ- لیژنـەی داڕشـتنی پێشەکی پـەیڕەو و پڕۆگـرام: حـەجی جەعفـەر، حوسـام حەکیم، سەدیق شڕۆ.

ب- لیژنەی داڕشتنەوەی پڕۆگرام: ئازاد فەتحوڵلا، ڕێبـوار عـەلی ڕەزا، ئەحمـەد فەقێ ڕەسوڵ، ژیلەمۆ.

ج- لیژنەی داڕشتنەوەی پەیڕەوی ناوخۆ: ئیسماعیل تـەنیا، ئەحمـەد عەبـدوڵلا زەرۆ، عوسمان مەحمود ئەحمەد، عومەر مەحمود پیرۆت.

د- لیژنەی دانانی پلانی داهاتووی یەکێتی مامۆستایان بـۆ لایـەنی (ڕاگەیانـدن، پەیوەندییەکانی ناوخۆ و دەرەوە، چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، کارە زانستی و پەروەردەییەکان، ئیـدارە و دارایـی)، مـەحمود عومـەر، ڕەشـید ئەحمـەد، محەمەد ڕەحمان، تەحسین عەلی، ئازاد مەحمود، وەیسی ساڵح، دڵنیا حەمە ساڵح).

هـ- لیژنەی داڕشتنەوەی بەیانی کۆتایی کـۆنفرانس: (جەعفـەر حوسـێن، خالیـد ئەحمەد، ئەنوەر حەمەلاو).

و- لیژنەی لێکۆڵینەوەی هەڵبژاردنی مامۆستایانی کوردستان (گشتی): شـێرزاد عومـەر عوسمـان، حەمیـد ئیـبراهیم ئیـسماعیل، سـەدیق سـەعید، عەبـدوڵلا عەبدولکەریم، محەمەد سەعید سابیر.

ی- لیژنـەی سەرپەرشـتیکردنی هەڵبـژاردنی ئەنـدامانی مەکتـەبی سـکرتاریەت: جـەلال حەمـەدەمین، نیـشتیمان قـادر ڕەشـید، ئیـبراهیم مـەدحی ئیـبراهیم.

لەڕۆژی ٢١/٢/١٩٩١، سەرلەبەیانی، لیژنەکان کەوتنـەکار. پاشـان، مامۆسـتا محەمەد شاکەلی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب بەشداری کرد و، هەنـدێك قـسەی کـرد. سـەر لـەئێوارە، کاتـژمێر (٣,٣٠)، دەسـت کـرا بەپرۆسـەی هەڵبژاردن بۆ مەکتەبی سکرتاریەت. بۆ هەڵبژاردنی حـەوت کـەس، دە کـەس خۆیان پاڵاوت، کەئەم مامۆستایانە بـەم شـێوەیە دەنگیـان هێنـا: (شـێرزاد عومەر ٢٢ دەنگ، جەعفەر حوسێن ١٨ دەنگ، دڵنیا حەمە ساڵح ١٦ دەنـگ، حوسام حەکیم ١٥ دەنـگ، نیـشتیمان قـادر ١١ دەنـگ، ڕەشـید ئەحمـەد ١٠

دەنـگ، ئیـبراهیم مـەدحی ٩ دەنـگ، عومـەر مـەحمود ٦ دەنـگ، ئـەنوەر حەمەلاو ٤ دەنگ، ئازاد فەتحوڵڵا ٤ دەنگ).

پاش جیاکردنەوەی دەنگەکان، ئـەم مامۆسـتایانە بوونـە ئەنـدامی مەکتـەبی سکرتاریەتی یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردسـتان: (شـێرزاد عومـەر، جەعفەر حوسێن، دڵنیا حەمە ساڵح، حوسـام حـەکیم، نیـشتمان قـادر، ڕەشـید ئەحمەد، ئیبراهیم مەدحی ئیبراهیم).

دوای یـەکگرتنی حزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان و پـارتی سـەربەخۆیی دیوکراتی کوردستان (پاسۆك)، ڕێکخراوی مامۆستایانی هەردوو حزبەکە یەکیان گرت و لەڕۆژی ١٩٩٢/٦/١دا، بەیانێکیان بڵاوکردەوە.

لە ١٩٩٢/٤/٣٠دا، لەسەرتاسـەری کوردسـتان، پرۆسـەی هەڵبـژاردنی گشتی مامۆسـتایان، ئەنجامـدرا. جگـە لەیـەکێتی مامۆسـتایانی پـارتی و یـەکێتی، ڕێکخراوەکانی تر بە (یەکێتی مامۆسـتایانی سۆسیالیـستی کوردسـتان)یـشەوە، نـەیانتوانی دەنگـی پێویـست بێـنن و ببنـە ئەنـدام لـە (یـەکێتی مامۆسـتایانی یەکگرتووی کوردستان).

دوای هـێن و منهـێن و سـازش کـردن، لەچوارچـێوەی سـازان (تـەوافوق)دا، ئەندامی حزبە دەرنەچووەکان لەپرۆسەی هەڵبژاردن، لەمەکتـەبی سـکرتاریەت، بەشـداریان پێکـرا، کەلەسۆسیالیـست و پاسـۆك: (شـێرزاد عومـەر عوسمـان و هوشیار حاجی)، بوونـە ئەنـدامی مەکتـەبی سـکرتاریەتی یـەکێتی مامۆسـتایانی کوردستان.

ئیـدی دوای ئـەم هەڵبژاردنـە، هـەموو ڕێکخراوەکـانی مامۆسـتایانی سـەر بەحزبـەکان، بەسۆسیالیستیـشەوە، هەڵوەشـێندرایەوە. پـێش ئەنجامـدانی کۆنگرەی گشتی مامۆستایان (ئیسماعیل تەنیا و وشیار حەمەد حاجی لەلیژنەی ڕاگەیاندنـدا بـوون کـەئامادەکاریان بـۆ کـۆنگرەی گـشتی یـەکێتی مامۆسـتایان دەکـرد. هـەروەها شـێرزاد عومـەر عوسمـانیش، لەلیژنـەی دارایـی کـۆنگرەدا بوو)(٣٦٨).

## ٤- یەكێتی ئافرەتانی سۆسیالیستی كوردستان:

ئـەم رێكخـراوە لـەقۆناغی خـەباتی شـاخ (١٩٧٦-١٩٩١)دا بـوونی نـەبووە. ئـەوەی هـەبووە، تـەنها بەشـداری كردنـی كـچ و ژنـانی كـورد بـووە لـەناو رێكخستنەكانی حزبـی سۆسیالیـستی كوردسـتاندا. ئـەم كـچ و ژنانـە، كۆمـەڵێك ئەرك و كاری خەباتیان لەناو شار و شارۆچكەكاندا، ئەنجام داوە كەبۆ پیاوەكان پڕ لەكێشە و گرفت تر بووە. جگـە لـەكاری رێكخـستن، زۆر جـارانیش یارمـەتی ئەنجامـدانی چـالاكییەكانی پێـشمەرگەیان لـەناو شـارەكاندا داوە و بـەكردەوە بەشداری چالاكییەكانیان كردووە لەتەمبێ كردن و چـەك كردنـی ئـەو كەسـانەی كەكاری سیخوڕیان بۆ رژێم كردووە[٣٦٩]. هەروەها، (دەورێكـی گرنگیـان هـەبوو لەراپەڕینی مایسی ١٩٨٤ی شاری سلێمانیدا. ئەم راپەڕینە زێتر دژی بەجەیـشی شەعبی كردنی خوێندكاران بوو)[٣٧٠].

دوای راپەڕین، (حزبی سۆسیالیـستی كوردسـتان)یـش، وەك حزبـەكانی تـر، بیری لەدامەزراندنی رێكخراوێكی تایبەت بەئافرەتانی كردەوە. بۆ ئەو مەبەستە، كۆمەڵێك ئافرەتی سەر بەحزبیان هانـدا، كەئـەم رێكخـراوە (یـەكێتی ئافرەتـانی سۆسیالیستی كوردستان)، دروست بكەن و چالاكییەكانیان لەریزی ئافرەتانـدا، پـەرە پێبـدەن. لەهـەموو شـارەكانی كوردسـتاندا (لـق)یـان هـەبوو. لەلایـەن مەكتەبی سیاسی و خودی كەسی یەكەمی لقەكانی حزبەوە، پشتگیری ماددی و مەعنەوی دەكران.

## ١- ناكۆكییەكانی نێو سەركردایەتی حزب:

بزوتنەوەی سۆسیالیستی كوردستان، لەلایەن چەند كەسایەتیەكی خاوەن بیروبۆچوونی جیاواز دامەزرا. ئەوەی ئەم كۆمەڵە خەڵكە نیشتمانپەروەرەی كۆكردبۆوە، ئەوەبوو كەبەهەر شێوەیەك بێت، بتوانن نوێنەرایەتی كورد بكەن و لەرێگای دانوستاندنەوە لەگەڵ حكومەتی بەغدا، مافەكانی كورد، بەدەست بهێنن. ئەو كەسانە نوێنەرایەتی خەڵكی (نەخوێندەوار، عەشایەر، خوێندەوار، دیموكراتخواز، ماركسی، نەتەوەیی)یان دەكرد. جگە لەمەش، بەسەر دوو گروپی جیاوازدا، دابەش ببوون و باكگراوندی مێژوویی جیاوازیان هەبوو. بەشێكیان لەلێكترازانە مێژووییەكەی (پارتی دیموكراتی كوردستان) لەساڵی (١٩٦٤-١٩٧٠)، لەگەڵ حزبی دایك (پارتی) مابوونەوە، كەلەنێو خەڵكی بە (مەلایی)، ناسراو بوون. بەشەكەی تریان بەگەڵ باڵە جیابۆوەكە (باڵی مەكتەبی سیاسی)، یان (جەلالی)، كەوتبوون. ئەوانە لەزەمانێكدا، تا سەر ئێسقان دوژمنایەتی و دژایەتی یەكتریان كردبوو، تا گەیشتبووە سنووری كوشتن و خوێن رشتن. بەكورتی شەقی زەمانە، ئەوانەی لەرێكخراوێكی تازەدا كۆكردبۆوە. كەسایەتیە بەرچاو و گرنگەكانی بزوتنەوە لەساڵی یەكەمی دروست بوونیدا، بریتی بوون لە:

- **ساڵح یوسفی:** ناوبراو، هەر لەسەرەتاوە لەریزەكانی پارتیدا خەباتی كردبوو، نوێنەری پارتی بووە لەشاندەكانی دانوستاندن لەگەڵ حكومەتە یەك لەدوا یەكەكانی عێراق. كەسایەتیەكی نیشتمان پەروەر و كورد پەروەر بووە. زێتر باوەڕی بەخەباتی ئاشتیخوازانە و دانووستاندن هەبووە. (دیموكراتخواز و ئاشتیخواز بوو، سۆسیالیست نەبوو، بەڵام كەدەیدیت خەڵكەكەی زیاتر بڕوایان بەسۆسیالیستە و، یان رێكخراوەكە رێكخراوێكی سۆسیالیستیە دژی ئەوە نەبوو... لەبەر ئەوەی بەهەموو پێوەرێك وەكو كەسایەتی، وەكو تەمەن و رۆشنبیری، ئەو لەهەمووان شایستەتر بوو بۆ سكرتێری ئەو رێكخراوە، واتە هیچ كەسێك موونافیسی ئەو نەبوو لەناو بزوتنەوە)[٢٧١].

- **عەلی عەسكەری:** زیاتر وەك كەسایەتی و فەرماندەیەكی عەسكەری

ناوبانگی دەرکردبوو. پێشتر لەریزەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی (جەلالی)دا بوو. پاش ساڵی ١٩٧٠ گەڕابۆوە ناو ریزەکانی پارتی، بەڵام هەر هاوسۆزی مام جەلال بوو.

- **رەسوڵ مامەند:** کۆنە کادیرێکی چالاکی پارتی بوو. تا نسکۆی ١٩٧٥، هەر لەگەڵ پارتیدا بووە و سەنگەری نەگۆڕیوە. دوای نسکۆ، رێبازی (مارکسی- لینینی) هەڵدەبژێرێ و باوەڕی بەوە هێناوە کەخەباتی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لەم رێگایەوە دەتوانێت بەمافەکانی بگات. ئەو سەر بەبنەماڵەیەکی جوتیاری خاوەن موڵك بوو، بۆیە زۆرجار ناحەز و دژ بەرەکانی دەیانگوت: سەرۆك عەشیرەتە، یان کوڕە کوێخا و دەرەبەگە. (قادر عەزیز)ی کۆنە هاوڕێ و هاوخەباتی، کەلەهەندێك قۆناغدا بەهۆی یەکنەبوونی بیروبۆچوونەکانیان دژایەتی کردووە، تا ئاستی جودا بوونەوە، ئەو دەنگۆیانە رەت دەکاتەوە و دەڵێت: (نا، سەرۆك عەشیرەت نەبوو، کاك رەسوڵ ئەسالیبی عەشایەری هەبوو، بەڵام پیاوێکی تێکۆشەر بوو، باوەڕیشی بەسۆسیالیزم هەبوو... بەڵام پەیوەندی عەشایەری هەبوو... کەس موونافیسی نەبوو، لەبەر ئەوەی بەهەموو پێوەرێك لەهەمووان شایستەتر بوو)[٢٧٢].

- **عەلی هەژار:** لەسەردەمی لاوێتیەوە لەریزەکانی پارتیدا خەباتی کردووە. کۆمەڵێك پۆستی گرنگی لەم حزبەدا هەبووە، تا گەیشتۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. پاش نسکۆ باوەڕی بەخەباتکردن لەسەر رێبازی (سۆسیالیستی)، هێناوە.

- **مەلا ناسیح:** کادیرێکی چالاك و خوێندەواری پارتی بووە. لەساڵی ١٩٦٤ بەگەڵ باڵی جەلالی کەوتووە. باوەڕی بەخەباتی کوردایەتی هەبووە.

- **دکتۆر خالید سەعید:** کەسایەتیەکی دیاری خەباتی چەکداری و پێشمەرگایەتی بووە. لەشۆڕشی ئەیلول کۆمەڵێك پۆستی گرنگی عەسکەری لەئەستۆ بووە. هاوسۆزی مام جەلال بوو.

- **عومەر مستەفا دەبابە:** کەسایەتیەکی دیار و بەرچاوی باڵی جەلالی بووە. لەهەموو قۆناغەکانی خەباتدا، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ (مام

جەلال)دا، هەبووە. لەهەوڵی ئەوەدا بووە بزوتنەوە بەرەو ڕێکخراوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) ببات و تەسلیم بە (مام جەلال)ی بکات.

– **کاردۆ گەلاڵی**: کادیرێکی چالاکی پارتی و بزوتنەوەی خەباتی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)، بووە. پاش نسکۆ، بۆتە هەڵگری بیروباوەڕی چەپ و لەخەباتی ڕزگاریخوازی کورددا، ڕێبازی (مارکسی – لینینی) هەڵبژاردووە. باوەڕی بەچەمکی (سۆسیالیستی زانستی) هەبووە، تا سنووری پەرگیری (تەتەروف). ئەو (ئەوەندە متەتەریف بوو لەکۆمۆنیستی، باوەڕ ناکەم لینین وا بوو بێت... مرۆڤێکی زۆر خەباتکار و جدی بوو، ئەگەر سۆسیالیست چەند کادیرێکی وەك کاردۆی هەبوایە، ڕۆژی بەم ڕۆژە نەدەگەیشت)(٣٧٣).

– **سەید کاکە**: پێشمەرگە و کادیرێکی دیار و بەرچاوی پێشمەرگایەتی شۆڕشی ئەیلول بوو، بەتایبەتی لەدەشتی هەولێر. ئەو، مرۆڤێکی نەخوێندەوار بوو، جگە لەخەبات دژی ڕژێم و نۆکەرەکانی، هەروەها کوردایەتی کردن، باوەڕی بەهیچ ڕێبازێکی سیاسی (نەخوازەڵڵا سۆسیالیستی، سۆسیالیستی زانستی) نەبوو. تا سەر ئێسقان دژی ئاغا و دەرەبەگەکان بوو.

– **نورەدین عەبدولڕەحمان**: باکگراوندی گروپی (جەلالی) هەبوو. لەساڵانی (١٩٦٤–١٩٧٠)، لەگەڵ ئەو باڵەدا بووە.

– **سەعدی عەزیز (سەعدی گچکە)**: سەرکردەیەکی عەسکەری دیاری پارتی بوو. تا نسکۆ هەر لەگەڵ پارتیدا ماوەتەوە و سەنگەری نەگۆڕیوە.

– **تاهیری عەلی والی**: کەسایەتیەکی دیاری جەماوەری و کادیرێکی پسپۆڕی بواری سەربازی بوو. لەشۆڕشی ئەیلول کۆمەڵێك پۆستی عەسکەری پێ سپێردراوە. فەرماندەیەکی مەیدانی بووە. تا نسکۆ هەر لەگەڵ پارتیدا ماوەتەوە. دوای ئەوەی بزوتنەوە دەچێتە شاخ و دەبێتە باڵێکی دیاری خەباتی چەکداری شۆڕشی کورد، بیروبۆچوونە جیاوازەکان، دەگەنە ئاستی ململانێ کردنی یەکتری. بۆ نموونە: هەر دوای دوو ساڵ خەباتی شاخ، ململانێی نێوان دوو کەسایەتی دیاری بزوتنەوە دەگاتە ئاستی یەکتر بوغزاندن. لەبەر ئەوە (ڕەسوڵ مامەند)ی ئەندام مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەساڵی (١٩٧٨)، دەست

لەپۆستەکەی دەکێشێتەوە و زێتر خەریکی کاری رێکخستنی بزوتنەوە دەبێت[٣٧٤]. جگە لەمەش ناکۆکی دەکەوێتە نێوان هەڵگرانی (سۆسیالیستی زانستی) و (سۆسیال دیموکرات و کوردایەتی).

کەبزوتنەوە، لەنیمچە بەرەی (یەکێتی) دەچێتە دەرەوە، لەسەر بنچینەی فراوانبوون و خۆ بەهێزکردن لەگەڵ (لیژنەی ئامادەکردن- پارتی دیموکراتی کوردستان) کەدکتۆر مەحمود عوسمان رابەرایەتی دەکرد، یەکیان گرت. ئەم دوو رێکخراوە، جگە لەدژایەتی کردنی یەکێتی و کوردایەتی کردن، هیچ چەمکێکی تر، کۆی نەکردبوونەوە. رابەر و کەسایەتیەکانی (لیژنەی ئامادەکردن)، باوەڕیان بەسۆسیالیست و سۆسیالیستی زانستی نەبوو. لەگەڵ ئەم ناکۆك بوونەش، لەرێکخراوێکدا یەکیان گرتبوو. گەرا دانانی ئەم ناکۆکیانە، لەئایندەدا کاریگەری تەواوی کردە سەر حزبی سۆسیالیستی کوردستان. دوای هاتنی بازنەی رۆشنبیری (حەلقەی سەقافی) و بەشداریکردنیان لەیەکەم کۆنگرەی حزبدا، ناکۆکیەکان زێتر دەرکەوتن، بەتایبەتی لەنێوان سەرکردە دیارەکان. بۆ نموونە:

- **لەکۆنگرە دوو میحوەر دروست ببوو:** یەکەمیان باوەڕی بەوە هەبوو کەدەبێت حزبی سۆسیالیستی کوردستان لەسەر رێبازی (سۆسیالیستی زانستی) خەبات بکات. رەسوڵ مامەند، نوێنەرایەتی ئەم میحوەرەی دەکرد و هەریەکە لە (قادر عەزیز و مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا و شێرکۆ شێخ عەلی) و بەشێکی هەرە زۆری کادیرە پلە دووەکانی رێکخستن، پشتگیریان لێدەکرد.

میحوەری دووەم، باوەڕی بەکوردایەتی کردن هەبوو لەسەر رێبازێکی دیموکراتی پێشکەوتنخوازانە. د. مەحمود، نوێنەرایەتی ئەم میحوەرەی دەکرد و بەشێك لەسەرکردە و کادیرە عەسکەرییەکان، پشتگیریان لێدەکرد.

سەرەنجام میحوەری یەکەم سەرکەوت، کەبووە هۆی رەنجان و ساردبوونەوەی بەشێك لەئەندامانی کۆنگرە. هەتا خودی دامەزرێنەری بزوتنەوە (ساڵح یوسفی) بەچەسپاندنی (سۆسیالیستی زانستی)، ناڕازی و دڵگران بوو.

- شەهید بوون و لەدەست دانی کۆمەڵێك سەرکردەی دیاری سۆسیالیست، نموونەی: (عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، عەلی هەژار، کاردۆ گەلاڵی، ساڵح

یوسفی، شێرکۆ شێخ عەلی، ئەنوەری مەجید سوڵتان، قادر شۆڕش، سەعدی گچکە) و شکستە عەسکەرییەکانی حسك لەشەڕی ناوخۆ لەگەڵ یەکێتی، ناکۆکیەکانی نێو حزبی قوڵتر کردەوە. تەکەتول و جەمسەربەندی و دژایەتی یەکتری کردن، لەکۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی حزب لەساڵی (١٩٨٣) و (١٩٨٥)دا، زیاتر و قوڵتر دەرکەوتن. بۆ نموونە، لەکۆبونەوەکەی (شووشان)دا:

- قادر جەباری زۆر دژی رەسوڵ مامەند بووە[٣٧٥].
- خیلافاتی میحوەری لەکۆبوونەوەکەی شوشان، پایزی ١٩٨٥، (رەسوڵ مامەند، سەعد عەبدوڵڵا، خاڵە حاجی، سەید کاکە، ئەحمەد فەقێ رەش) لەلایەك و (قادر عەزیز و عەبدولخالق زەنگەنە و تا رادەیەك قادر جەباری)، لەلایەکی تر[٣٧٦].
- میحوەری قادر عەزیز و عەبدولخالق: (خاڵی حاجی)، نوێنەری حسك لەئێرانیان تاوانبار دەکرد و بەکەسێکی نامولتەزیم و پیاوی ئێرانیان دەزانی. (خاڵە حاجی پیاوێکی چالاك و بزێو بوو، بەڵام ئیلتیزامی بەبڕیارەکانی سەرەوەی خۆی وەکو پێویست نەدەکرد، بۆیە زۆر جاران لەلایەن شەخسی کاك رەسوڵەوە بانگ دەکرا و لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرا. یەك دوو جاریش لەکارەکەی دوور خرایەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو باشتر نەبوو دەگەڕێندرایەوە سەر کارەکەی)[٣٧٧].
- عادل موراد و عەدنان موفتی دژی قادر عەزیز بوون، قادر عەزیزیش دژی ئەوان[٣٧٨]. هەروەها قادر عەزیزیش دژی (خاڵە حاجی، مامۆستا سەعد، سەید کاکە، محەمەد شاکەلی، محەمەدی حاجی مەحمود، مەلا ناسیح)بوو[٣٧٩]. سەید کاکە گۆتەنی: جگە لەعەبدولخالق زەنگەنە، دەنا (قادر عەزیز) دژی سکرتێری حزب و هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بوو[٣٨٠]. هەروەها پاش جیابوونەوەی قادر عەزیز، بەتایبەتی لەساڵی ١٩٨٨ بەدواوە، قادر جەباری زۆ دژایەتی (رەسوڵ مامەند و خاڵە حاجی) دەکرد[٣٨١].

لەدوای راپەڕینیش، دوو جەمسەری ئاشکرا بەحزبی سۆسیالیستەوە دیار بوو. رەسوڵ مامەند، وەك سکرتێر، بارەگای مەکتەبی سیاسی لەرانیە دانابوو.

کەچی دکتۆر مەحمود لەشەقڵاوە بارەگایەکی کردبۆوە و بەبەردەوامی دەوامی لەوێ دەکرد و نەدەچووە رانیە... ئەم ناتەبایی و جەمسەربەندییە لەناو کۆنە سۆسیالیستەکانی ناو حزبی (یەکگرتن)یشدا، هەر درێژەی هەبووە. لەوێ، گوایا سۆسیالیست نەماوە و هەرسێ حزب بوونەتە حزبێکی تازە، کەچی لەوێش سۆسیالیستەکان، دژایەتی یەکتریان دەکرد(٣٨٢).

لەراستیشدا باری قورسی هەموو ئەم ململانێ و جەمسەربەندییە کەوتبووە سەر شانی رەسوڵ مامەند، بەو سیفەتەی سکرتێری حزب بوو. دەبوایە پارسەنگی ململانێکان رابگرێت و خۆی نەداتە پاڵ کەسێك و یەکێکی تر فەرامۆش بکات. ئەو (پیاوێکی نیشتمانپەروەر و رۆشنبیر و تێکۆشەر بوو.. زۆربەی مەرجەکانی سەرکردە و رابەری تێدا بوو، بۆ ئەویش تا نەمانی حزب چەندین کۆسپ و گرفت هاتنە پێش کەرێگر بوون لەوەی ببێتە مەرجەع و سەرکردەیەکی بێ مونافیس)(٣٨٣). ئەو دەیویست حزبەکە تووشی لێکترازان نەبێت، هەوڵی دەدا سەرکردەکان لەیەك نزیك بکاتەوە(٣٨٤).

لەئەنجامی ئەم هەموو جەمسەربەندی و دژایەتی یەکتر کردن و جێگیر نەبوونی فکر و سیاسەتی حزب، زۆرجاران (لێدوان و بۆچوونی سەرکردەیەکی سۆسیالیست وەك سەرکردەیەکی حزبی شیوعی بوو، لەهەندێك کاتیشدا لەرووی مەسەلەی نەتەوایەتییەوە وەك پاسۆك وا بوون)(٣٨٥).

## ٢- کۆبوونەوەکانی گوندی (شووشان) و جیابوونەوەی قادر عەزیز:

دوای ئەوەی ململانێ و تانە و تەشەر لەیەکتردان دەگاتە ئاستی نەخوازراو و تەقینەوە، سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، کۆبوونەوەیەکی چارەنووسساز لەگوندی (شووشان)، لەرۆژی ١٩٨٥/٧/٢٦، ساز دەکات. ئەم کۆبوونەوە پڕ لەکێشە و ململانێ و تۆمەت بەخشینەوەیە، شازدە رۆژ دەخایەنێت و لەرۆژی ١٩٨٥/٨/١١دا، کۆتایی پێدێت. تەوەری کۆبوونەوەکان، بریتی بوون لە:

- شەڕی عێراق- ئێران و درێژەکێشانی.
- حزب و رێکخراوە ئیسلامیە عێراقیەکان.

- یەکێتی و شکستی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم.
- ئاڵای شۆڕش و دەرهاویشتەکانی.
- بەرەی جود و هەڵسەنگاندنی.
- پارتی کرێکارانی کوردستان و خەباتی کوردانی باکوری کوردستان.

ئەمانە، هەموویان تەوەر و باسی لاوەکی بوون، گرنگی و شوێنێکی ئەوتۆی نەبوو لەکۆبوونەوەکاندا. فراوانبوونی کێشەکانی ناوخۆی حزب و بێ چارەسەر مانەوە، تەوەری سەرەکی و بنچینەیی تەواوی رۆژانی کۆبوونەوەکان بوو...

بەشێوەیەکی گشتی، هەموو لایەك یەکتریان تاوانبار دەکرد، بەڵام دوو میحوەری سەرەکی هەبوو، میحوەرێك کەقادر عەزیز و عەبدولخالق زەنگەنە سەرپەرشتیان دەکرد. میحوەرەکەی تر، سکرتێری حزب و تەواوی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حزب بوون... لەمیانەی گفتوگۆ توندەکاندا، زۆرجاران وەك هۆکارێك ناوی ئەدیب شەعبان (ئارام)، کادیری پێشکەوتووی حزب دەهات و بەسەرچاوەیەکی پشێوییەکانیان دەزانی.

ئەو کاتەی ئەم کۆبوونەوەیە ئەنجامدرا، بەهۆی نەبەستنی کۆنگرەوە، بۆشاییەکی فراوان کەوتبووە سەرکردایەتییەوە، چونکە (ساڵح یوسفی، کاردۆ گەلاڵی، عەلی هەژار، ملازم تاهیری عەلی والی، شێرکۆ شێخ عەلی، قادر شۆڕش) شەهید ببوون. هەروەها حاجی حاجی برایم، لەتشرینی یەکەمی ١٩٨٣، پەیوەندی بە (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە کردبوو. عەزیز عەقراوی، دوای یەکەمین کۆنگرە، حزبی بەجێ هێشتبوو. محەمەد فاتیح وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی تەسلیم بەرژێم ببۆوە. ئەبو عەلی و هیوا بەهجەت ناسراو بە (مام وریا)، پاش تەواو بوونی کۆنگرەی یەکەم (مایسی ١٩٨١)، جارێکی تر، نەبینرانەوە[٢٨٦].

میحوەری قادر عەزیز، کۆمەڵێك کادیری پێشکەوتووی لەگەڵدا بوو، کەزیاتریان خەڵکی هەولێر و دەوروبەری بوون. ساڵێك پێش ئەم کۆبوونەوەیە، لەمانگی ئابی ١٩٨٤، عەریف عەلی فەرماندەی هەرێمی (١٠)ی سەفین و غەفور ئەحمەد (مام غەفە)، فەرماندەی هەرێمی (٧)ی قەرەچوغ و بورهان بلەیی، فەرماندەی هەرێمی (١٧)ی کۆڕەك، لەئەنجامی تێکشکانی هێزەکانی حسك و

بـــەرەی (جـــود)ەوە بەرامبـــەر بەیـــەکێتی، بـــەخۆیان و بەشـــێکی زۆر لەپێشمەرگەکانیانەوە، ریزی حزبیان بەجێ هێشت و پەیوەندیان بەیەکێتییـەوە کـرد. دواتـر، برهـان بلـەیی تەسـلیم بـەرژێم بـۆوە. کاردانـەوەی بەشـێك لەفەرماندەی هەرێمەکان ئەوەبوو کە: لەئەنجامی خروقـات و گوێڕایـەڵ نـەبوون بـەبڕیارەکانی سـەرکردایەتیەوە، سـزا درابـوون. سـاڵێك پێـشتر، واتـە لـەئابی ١٩٨٣، لەلایەن سەرکردایەتییەوە ئیجرائاتیان لەگەڵدا کرابوو[٣٨٧].

دوای کۆبوونەوەکان، کـەهیچ ئـەنجامێکی وای لێنەکەوتـەوە، قـادر عـەزیز و نزیکەی (١٢٠) کادیر و پێشمەرگە، لەشەوی ١٣-١٤/٨/١٩٨٥دا حزبیـان بـەجێ هێشت و جیابوونـەوە. بـەرەو ناوچـەی بـارزان (بنکـە کۆنـەکانی لقـی هـەولێری حزب)، بەرێکەوتن. بەشێك لـەو کـادیر و پێـشمەرگانەی وەك: ئـەدیب شـەعبان (ئارام)، سمکۆ ئەنوەر، رێبوار عەبدولڕەحمان، هیوا سەید سەلیم، رەشـاد مـەلا جەلال کەردزی (سامان)، لەم ململانێ و لێکترازانـە بـێ هیـوا بـوون و، هـەر زوو تەسلیم بەرژێم بوونەوە.

باڵی جیابۆوەی قادر عەزیز، لـەرۆژانی ١٢-١٤/١٢/١٩٨٥، لەناوچـەی (گـەلی زێـوە)ی نزیـك شارۆچـکەی ئامێـدی، بـەئامادەبوونی (٤٦) کـادیر و پێـشمەرگە کۆبوونەوەیـەکیان سـاز کـرد و خۆیـان بـە (حزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان/ ئیتجاهی دیموکراتی شۆرشگێڕ) ناساند[٣٨٨]. هەرچەندە باڵی جیابۆوە لـەحزب، بیانووی خۆیـان هـەبوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، (یـەکێتی و پـارتی سـەرەڕای کێـشە و ململانێـی مێـژوویی خۆیـان، حـەزیان نـەدەکرد حزبـی سۆسیالیـست لەسنوورێکی دیـاریکراودا گەشـە بکـات)[٣٨٩]. هـەروەها حزبـی شـیوعیش رۆڵـی خۆی هـەبوو لەهانـدانی ئـەم گروپـە و جیابوونـەوەیان لـەحزب، بـەو سـیفەتەی ئەوان (باڵی جیـابۆوە)، لەئایـدۆلۆژیای حزبـی شـیوعی نـزیکن نـەك جەماعـەتی سەرکردایەتی و رەسوڵ مامەند.

مەکتەبی سیاسـی و گروپـی زۆرینـە (باڵـی رەسـوڵ مامەنـد)، گروپـی (قـادر عەزیز)یان بەوە تاوانبار دەکرد کە: خاوەن ئایدۆلۆژیەکی پەڕگیرن و ناواقیعیانە بـیر دەکەنـەوە. لـەپێناو پاراسـتنی یـەکڕیزی حـزب پێویـستە گیـانی دان بەخۆداگرتن و لێبووردنیان هەبێت... لەبەرامبەر ئەوەدا، گروپی جیابۆوە، پاش

لـێکترازان، لەناميلکەيەکـدا بـەناوی: (هەڵوێـستی شۆرشـگێڕی نــەك لادان و پاشـگەزبوونەوە)، کەلەسـەرەتای ئـابی ١٩٨٦دا، بڵاویـان کـردەوە، کۆمـەڵێك هۆکـار دەسـت نيـشان دەکـەن بـۆ دەرچـوونيان لـەحزب لـەگرنگترينيان بـەلای ئەوانەوە بريتی بوون لە:

١- بـاڵی راسـتڕەو (مەبەسـت لـەباڵی سـەرکردايەتی و رەسـوڵ مامەنـد- ئيـسماعيل)، کۆمەڵـە خـەڵکێکی خۆيـانی بـێ هەڵبـژاردن هێنايـە کۆميتـەی ناوەنـدی کەهێـشتا راسـپاردەکانی کـۆنگرە (کـۆنگرەی يـەك)، لەچـاپ نەدرابوون. ل٢-٣.

٢- نەبوونی سەرکردايەتيەکی شۆرشگێڕ. ل٤.

٣- دەبـوو هـەر چـوار مـانگ کۆميتـەی ناوەنـدی کۆبێتـەوە، بـەپێی پـەيڕەوی ناوخۆ، کەچی جاری وا هـەبووە زيـاتر لەسـاڵ و نيوێـك خۆيـان لێ دەبـوارد. ل٥-٦.

٤- پەيڕەوکردنی سياسەتی رازی کردنی خەڵك لەبەرژەوەندی خۆيان. ل٦.

٥- بايەخ نەدان بەرێکخستن و هێڵە فيکرييەکەی و رێکخـراوە جەماوەرييـەکان. ل٦.

٦- هێرشـە نـاڕەوا و گومـان لێکراوەکـەی سـەرکردايەتی ينـك لەيـەکی ئايـاری ١٩٨٣ بۆ سەر بارەگاکانی حـزب لەئاشـقولکە و پـشت ئاشـان کەهـەر تـەنها بەرتيلێك بوو بۆ رژێمی فاشی و سەرگرتنی سەوداکەيان. ل٧.

٧- هـەر بۆ زيـاتر تێکـدانی حزبەکـە دەسـتی خـەڵکێکی زۆريـان لەناوچـەکانی سـەرکردايەتی و لقـی سـلێمانی و هــەولێر و علاقـاتی دەرەوە بەهـەردوو بەشەکەی لـەئێران و سـوريا بـەڕەڵلا کـرد. هـەروەها دەسـتکاری پـەيڕەو و پرۆگرامی حزبيان کرد کەهەموو لايەك دەزانن دەستکاری کـردن لەپـەيڕەو و پرۆگرامی حزب تەنيا لەدەسەڵاتی کۆنگرەدايە. ل١٠.

٨- نـەبوونی يـەك هەڵوێـستی حـزب دەربـارەی ينـك. بـۆ نموونـە لەکاتێکـدا هێزەکانی حزب و جود لەناوچەکانی هەولێر، لەزێبارۆك و قەڵاسنج و سـەفين و شوێنەکانی تر کەوتبوونە بەر شاڵاوێکی درندانەی هێزەکـانی ينـك و رژێـم، لەناوچـەی سـلێمانی بـەجيا لەسياسـەتی حـزب و تەنانـەت بەدەرچـوونيان

لەسیاسەتی جود لەسەر ئاستی سەرکردایەتی کۆبوونەوە و رێککەوتنیان لەگەڵ یەك ساز دەکرد. ل١٢.

٩- درەنگ بەستنی کۆبوونەوە، بۆ نموونە: لە ٩-١٩٨٣/٩/١٣ تاوەکو ١-١٩٨٥/٨/١٠ کەدەکاتە نزیکەی دوو ساڵ هیچ کۆبوونەوەیەك نەکرا. ل١٢.

١٠- تاقمی راستڕەو، تەواو لەرێباز و ئایدۆلۆژی حزب لایان دابوو. لەپەیڕەوی ناوخۆدا هاتووە: (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- عێراق، حزبێکی دیموکراتی شۆرشگێڕی پێشکەوتنخوازە). هەر لەهەمان ماددەش لەخاڵی دووەمدا هاتووە: (حزب خەباتی نەتەوایەتی خۆی بەخەباتی کۆمەلایەتی دەبەستێتەوە). لەراپۆرتی سیاسی کۆنگرەشدا هاتووە: (حزبمان باوەڕی تەواوی بەسۆسیالیزمی زانستی و بەیەکەوە گرێدانی دیالێکتیانەی خەباتی نەتەوایەتی و چینایەتی هەیە). ل١٨.

١١- نەبوونی نەخشەیەکی رێکوپێکی ئیدارە و دارایی لەکۆکردنەوە و زەبت کردنی داهات و دابەشکردنی عادیلانە بەسەر دەزگاکانی حزب و هێزی پێشمەرگە و دەستکاری کردنی. ل٢٢.

١٢- نادیاری لەداهاتی حزب و شێوەی سەرف کردنی. ل٢٢-٢٣.

١٣- پاش کەڵەکە بوونی گرفتەکان، کادیرەکان لەیاداشتێك لە ١٩٨٥/٨/١٣ داوایان کرد، کۆنفرانسێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان ببەسترێ لەماوەی دوو مانگ. ئەگەر هەر تا کاتی کۆنگرەی دووەم دیاری بکەن. کەچی مەکتەبی سیاسی ئامادە نەبوون وەلام بدەنەوە. ل٣٣[٣٩٠].

دوای ئەم لێکترازان و جیابوونەوەیە، رووداوی هەرە ناخۆش، شەهید بوونی (قادر مستەفا) بوو لەرۆژی ١٩٨٥/١١/٥، بەدەستی هەڤاڵ و هاوسەنگەرەکانی، هەموو لایەنەکان (پارتی، یەکێتی، شیوعی)، سەرکۆنەی ئەم کارەیان کرد و بەتاوانێکی گەورەیان لەقەڵەم دا و داوایان کرد بکەرەکانی بەسزا بگەیەنرێن.

ئەم لێکترازانە، گەورەترین و کاریگەرترین گورزی کوشندە بوو بەر جەستەی حزب کەوت و بووە سەرەتایەکی یەکلاکەرەوە بۆ لاوازبوون و بێ هێز بوونی، کەجارێکی تر نەتوانێت بکەوێتەوە سەر پێی خۆی.

## ٣- ڕوداوی شەهید کردنی قادر مستەفا:

قادر مستەفا، یەکێك بوو لەپێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان. لەدەشتی هەولێردا، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو. لەشۆڕشی ئەیلولدا، چواردە ساڵ پێشمەرگایەتی کردبوو. لەدوا ساتەکانی شۆڕش، پلەی سەرلق بوو. دوای نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە کوردستان، ڕژێم بۆ خوارووی عێراق دووری خستۆتەوە. لەگەڵ دامەزراندنی بزوتنەوەدا، پەیوەندی کردووە و بۆتە پێشمەرگە و فەرماندەی کەرت لەهەرێمی دەشتی هەولێر. ئەوکات، -سەردەمی مەفرەزە سەرەتاییەکان- کۆمەڵێك پێشمەرگەی ناسراوی لەگەڵدا بووە، لەوانە، ئەحمەد قەمبەری، ئەحمەد کوردە، ئەحمەد سماقە، میرزا حەمەدەمین، بەکر عەزیز سینەم، کاوە مەخموری، عەلی قەڵغانی، مستەفا کەندالْ، جەوهەر گردەسۆری[٣٩١]. ئەو، بەو سیفەتەی کەخەڵکی ناوچەکە بوو، ماوەیەکی زۆریش هەر لەم دەڤەرەدا، پێشمەرگە بووە و لەدژی ڕژێم جەنگاوە، دێ بەدێ، زورگ و تەلان و بەست و کەند و لەندی هەموو ناوچەکەی بەسەر کردۆتەوە و شارەزاییەکی باشی هەبووە. زۆر دژی شەڕی براکوژی (ناوخۆ)ش بووە. هەتا پێی کرا بێت، لەم جۆرە شەڕانە خۆی لاداوە و خۆی دزیوەتەوە. حاجی مەمۆ، کادیری دێرین و پێشکەوتووی کۆمەڵە و یەکێتی، سەرەڕای ئەوەی کەلەڕووی ڕێکخستن و پێکهاتەی فکرەوە لەگەڵ ناوبراو یەکیان نەگرتۆتەوە و سەر بەدوو ڕێکخراوی سیاسی جیاواز بوون، دەربارەی کەسایەتی (قادر مستەفا)ی پارتیزان، دەنووسێت: (وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزانی سەرکەوتوو کەلەخەباتی چەکداری نوێدا نموونەی کەم بوو، سەرباری نەخوێندەواری[٣٩٢] و لادێی لەگەڵ سەختیەکانی خەبات و پێشمەرگایەتی دا قاڵ ببۆوە)[٣٩٣].

(شاخەوان عەباس)، ئەویش یەکێك بوو لەپێشمەرگە دێرینەکانی یەکێتی و ماوەیەکی زۆر لەدەڤەری دەشتی هەولێر و لەهەمان دەڤەری (قادر مستەفا)، خەباتی کردووە و پلەی سەرتیپی (٨٤)ی هەولێری هەبووە، ئەویش -شاخەوان-، نموونەی قادر مستەفا، دژی شەڕی ناوخۆ بووە، لەکاتێکدا کەپەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی و سۆسیالیست لەوپەڕی گرژیدا بووە، ئەویش

حەزی نەکردووە بەشداری شەڕی ناوخۆ بکات. هەربۆیە (قادر مستەفا و نایف فارس باوە هەردەم بەرگریان لێ کردووە و بەلێپرسراوێکی بێ گرفت و دوورەپەرێزی شەڕی ناوخۆیان لەقەڵەم داوە)[٣٩٤].

یەکێتییەکان، زۆر دژایەتی (قادر مستەفا)یان نەدەکرد. زۆر جاران، بەتایبەتی لەسالانی (١٩٨٢-١٩٨٥)، کەلەدەڤەری دەشتی کۆیە و خۆشناوەتی مامۆستا بووم، بەندە (ئیسماعیل تەنیا)، بەچاوی خۆم بینیومە و هەروەها بیستوومە کاتێك کەلەگەڵ کادیر و مەفرەزەکانی یەکێتی دانیشتووم، ئەوان لەدوو روانگەوە سەیری بێ گرفتی و دوورەپەرێزی (قادر مستەفا)یان لەشەڕی ناوخۆ دەکرد:

- پێیان دەگوت: قادر سەلامەت، چونکە خۆی نەداوەتە بەر شەڕی ناوخۆ و خۆی بەدوور گرتووە.

- دەیانگێڕایەوە: زۆرجاران، هەر چوار دەوری قادر مستەفا و پێشمەرگەکانیمان گەمارۆ داوە، وتوومانە و پێمان وابووە سەد دەر سەد دەستگیری دەکەین، کەچی ئەو، زۆر بەسەرکەوتوویی بازنەی گەمارۆکەی ئێمەی شکاندووە و خۆی دەرباز کردووە. هەروەها دەیانگوت: قادر مستەفا بخەیتە ناو پەرداخێك و سەرەکەی دابخەی، ئەو لەژێرەوە دەچێتە دەرەوە و خۆی دەرباز دەکات. ئەم بۆچوونانە لەم کاتانەدا، مەغزای تایبەتی هەبووە. لەوانەیە ئەوان بەترسنۆك و کەسێکی راکردوو لەقەڵەمیان دابێت، بەلام لەراستیدا، ئەو مانایە دەگەیەنێت کەناوبراو سەرکردە و پارتیزانێکی خاوەن ئەزموون و شارەزا و بەپلان بووە، لەهەمان کاتیشدا، نەیویستووە ببێتە هۆکارێك بۆ گەرمتر بوونی شەڕی ناوخۆ.

شاخەوان عەباس، دەنووسێت: (ئەگەرچی ئێمە لەگەڵ قادر مستەفا بیروباوەڕمان جیاواز بوو لەبەرئەوەی ئەو بزوتنەوە بوو، بەلام بەویژدانەوە دەبێ دان بەوەدا بنێم کەپیاوێکی سەرڕاست و شارەزا و خۆڕاگر و خۆشەویستی جوتیاران بوو و هەرگیز رێگەی نەدەدا پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی ئازاری کەس بدەن)[٣٩٥].

لەشەڕی پارتیزانی دا، ئەزموونێکی باشی هەبوو، هەربۆیە نامیلکەیەکیشی

لەسەر شەڕی پارتیزانی چاپ و بڵاو کردەوە.

ئەو فەرماندە ماندوو نەناس و خاوەن ئەزموونی چواردە ساڵ لەشۆڕشی ئەیلول و نۆ ساڵ لەشۆڕشی نوێدا، لەرووداوێکی نەخوازراودا، بەدەستی هاوڕێکانی خۆی شەهید کرا. دوای ئەوەی باڵی جیابۆوە دەچنە ناوچەی بارزان، ناوبراو (قادر مستەفا)، لەبەر ئەوەی دۆستێکی نزیکی عەلی حاجی فەرماندەی پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی دەبێت، دەیەوێت بچێتە ئەو دەڤەرە. بارەگاکەی عەلی حاجی، لەبەری لای عەشیرەتی زێبار لەگوندی (سیدان) دەبێت. قادر مستەفا کەچواردە پێشمەرگەی لەگەڵدا دەبێت، لەرۆژی ١٩٨٥/١١/٥دا، تووشی مەفرەزەیەکی باڵی جیابۆوە دەبێت. پاش گفتوگۆ و هێن و منهێن، ناوبراو لەگەڵیان دادەنیشێ و ناگەنە هیچ ئەنجامێك، بۆیە داوای لێدەکەن چەك دابنێت. ئەویش بەمە رازی نابێت، لەئەنجامدا تەقەی لێدەکەن و ناوبراو شەهید دەکەن. هەشت پێشمەرگەش لەوانەی کەلەگەڵیدا بوون، چەك دەکەن[٣٩٦].

## ٤- ئاشتبوونەوەی گشتی و دامەزراندنی بەرەی کوردستانی:

دوای ماوەیەکی زۆر لەشەڕی یەکتر قڕکردن و بەرپێنەدان و یەکتر تۆمەتبار کردن و شەڕی راگەیاندن و دەروونی نێوان لایەنەکانی بەرەی جود (پارتی، سۆسیالیست، شیوعی، پاسۆك) لەلایەك و یەکێتی بەتەنها لەلایەکی ترەوە، هەموو لایەکیان تەواو ماندوو ببوون، کێرڤی ژمارەی چەکدار و ئەندام و هەوادارانیان روو لەدابەزین بوو... ئەم شەڕە بێ ئەنجامە و ماڵ وێران کەرە کەلەساڵانی (١٩٨٠- ئابی ١٩٨٣)دا، لەوپەڕی توند و تیژیدا بوو، دوای شەڕی قەندیلی دووەم (ئابی ١٩٨٣)، وردە وردە، بەرەو دامرکانەوە و خامۆش بوون دەچوو. هەموو لایەنەکان، ئەو باوەڕەیان لا دروست ببوو کەهیچ لایەنێکیان ناتوانێت لایەنی بەرامبەر لەناو بەرێت، یان بیبەزێنێت.

یەکێتی لەگەرمەی مفاوەزات دا بوو لەگەڵ رژێم. هێزەکانی جود بەتایبەتی (سۆسیالیست و شیوعی)، لەئاشقولکە و پشت ئاشان لەلایەن یەکێتییەوە گورزێکی کەمەرشکێنیان بەرکەوتبوو. لەناوچەکانی خۆشناوەتی و دەشتی

هەولێر، لەبەر باڵادەستی مەفرەزەکانی یەکێتی کەلەگەڵ حکومەت لەمفاوەزاتدا بوون، بەنهێنی و مەفرەزەی بچووك بچووك، لەناوچەکە دەسوڕانەوە. دوای درێژە کێشانی مفاوەزات و نادیاری ئەنجامەکانی، یەکێتی وردە وردە لەناو خودی خۆیەوە، دەنگی ناڕەزایی لێ بەدیار دەکەوت و هەست دەکرا، درزی تێدەکەوێت. لەم سەرو بەندەدا، کەیەکێتی گەیشتبووە قەناعەتێك کەرژێم ئامادە نییە داواکانیان جێبەجێ بکات لەلایەك و، لەدەستدانی دۆست و پشتیوانە سەرەکییەکانی لەبەرەی (جوقد) و هەردوو وڵاتی سوریا و لیبیا و حزب و لایەنە فەلەستینی و لوبنانیەکان لەلایەکی ترەوە، لەئاهەنگە بەناوبانگ و مێژووییەکەی سورداش لەنەورۆزی ١٩٨٤، مام جەلال لەوتارێکی حەماسەت ئامێزدا، داوای ئاشتبوونەوەی گشتی لەتەواوی لایەنەکانی بەرەی (جود) کرد و ئامادەیی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ی بۆ زەمینە خۆش کردن بۆ ئاشت بوونەوە و کۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆ، نیشاندا... لەم کاتەدا، لایەنەکانی جود، باوەڕیان بەم بەڵێنانە نەدەکرد، چونکە یەکێتی هێشتا لەگەڵ رژێم لەمفاوەزاتدا بوو. ئەوان (لایەنەکانی جود)، لەبەیاننامەی یەکلایەنە و بەکۆمەڵدا، داوایان لەیەکێتی دەکرد کەپەیوەندییەکانی لەگەڵ رژێم بپچڕێنێت و بگەڕێتەوە ریزی نیشتمانی. لەم کاتەدا، یەکێتی جگە لەحکومەتی عێراق، هیچ دۆستێکی ناوخۆ و دەرەوەی بەدەستەوە نەمابوو. یەکێتی، لەرۆژی ١٩٨٥/١/١٥، لەبەیاننامەیەکی دوور و درێژدا، کۆتایی بەمفاوەزات هێنا و بۆ دەرخستنی راستی و نیاز پاکی، گەورەترین شەڕی لەگەڵ رژێم دەست پێکرد. ئیدی لەمە بەدواوە، لەهەوڵی ئەوەدا بوو پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی سوریا و لیبیا و ئێران لەلایەك و لایەنەکانی بەرەی جود، لەلایەکی ترەوە، ئاسایی بکاتەوە. لەم پێناوەدا، لەسەر پێشنیاری یەکێتی، لەرێکەوتی ١٩٨٤/٤/١٦، فەرەیدون دارتاش و حەمەی حەمە باقی دەچنە لای حزبی شیوعی لەناوچەی برادۆست و پەیامی یەکێتی بۆ لایەنی ناوبراو دەبەن. هەر لەم سەرو بەندەدا، مەکتەبی سیاسی یەکێتی نامەیەك بۆ پارتی دەنێرێت. هەر یەکێتی، جارێکی تر، وەفدێکی تر، کەپێکهاتبوون لە (ئازاد هەورامی و د. پێشەوا تاڵەبانی و فەرەیدون دارتاش)، لەرێکەوتی ١٩٨٤/٨/١٦، بۆ لای حزبی شیوعی

دەنێرێتەوە. حزبی شیوعی پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کەدەبێت یەکێتی ئیدانەی شەڕی ئاشقولکە و پشت ئاشان بکات...

لەناوچەی سلێمانیش، بەو سیفەتەی کەمحەمەدی حاجی مەحمود (ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوی لقی سلێمانی حزبی سۆسیالیست) و شەوکەتی حاجی مشیر ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی، کۆنە دۆست و هاوخەباتی یەکتر بوونە، بۆ ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە لەناوچەکە دەکەونەخۆ. لە ١٩٨٥/٢/١، شەوکەتی حاجی مشیر نامەیەك بۆ محەمەدی حاجی مەحمود دەنێرێت. لایەنی دووەم، لەرۆژی ١٩٨٥/٢/٢، وەڵامی نامەکەی شەوکەت، دەداتەوە. لقی سلێمانی حزبی سۆسیالیست و یەکێتی، لەرێکەوتی ١٩٨٥/٣/٢١دا، لەگوندی (ناوگردان)ی سەر بەشارۆچکەی سەید سادق، رێکەوتنی ئاشتی مۆر دەکەن. بەهۆی ئەم رێککەوتنەوە، حزبەکانی ناو بەرەی (جود)، سەرکۆنەی (سۆسیالیست)یان کرد و، بەوە تاوانباریان کرد کەتاك لایەنانە، بێ گەڕانەوە بۆ بەرەی (جود)، هەنگاویان ناوە.

محەمەدی حاجی مەحمود و شێخ محەمەد شاکەلی، پاش هەوڵێکی زۆر، قەناعەت بەسەرکردایەتی حزب دێنن کەئەوان هەنگاوێکی پۆزەتیڤیان بەئاراستەی ئاشتبوونەوە و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی تازە، ناوە. حزبی سۆسیالیست لەکۆبوونەوەی بەرەی (جود)دا، قەناعەت بەهاوپەیمانەکانی دەهێنێت کەجگە لەئاشتبوونەوەی گشتی، هیچ رێگایەکی تر لەبەردەم بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردا نەماوە. لەرێکەوتی ١٩٨٥/١٢/٢، مام جەلال لەلایەك و نەوشیروان لەلایەکی ترەوە، لەرێکەوتی ١٩٨٦/١/١٤، بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکانیان و ئاشتبوونەوە، نامە بۆ محەمەدی حاجی مەحمود، دەنێرن. محەمەدی حاجی مەحمود، رۆڵێکی کاریگەر لەسازکردنی زەمینەی ئاشتبوونەوە لەگەڵ یەکێتیدا، دەبینێت. بەپێزانین و رازی بوونی سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیست، وەفدێك کەپێکهاتبوون لە: (محەمەد شاکەلی، قادر جەباری، خاڵە حاجی)، لەرێکەوتی ١٨-١٩٨٦/٤/٢٤، دەچنە یاخسەمەر و لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی، کۆدەبنەوە و لە ١٩٨٦/٤/٢١، رێکەوتنی ئاشتی مۆر دەکەن. ئەم هەنگاوەی حزبی سۆسیالیست، بووە هاندەرێك کە (پاسۆك)یش

بەم ئاڕاستەیە هەنگاو هـەڵبێنێ. بۆیـە، لـەئایاری ١٩٨٦دا، پرۆتۆکـۆڵی ئاشـتی لەنێوان پاسۆك و یەکێتیشدا، مۆر دەکرێت. بەدەست پێشخەری و ناوبـژیوانی سۆسیالیست، یەکێتی و پـارتی، نامـە ئـاڵوگۆڕ دەکـەن. لـەرۆژی ١٩٨٦/٥/٢٥، نوێنـەرانی سـەرکردایەتی هــەردوولا، لــەبارەگای مەکتــەبی سیاســی حزبــی سۆسیالیست لەگوندی (کاولان)، لەگەڵ یەکتریدا کۆدەبنەوە و، پەیوەندیـەکانی نێوانیـان، ئاسـایی دەکەنـەوە. هـەر لـەمانگی ئایـاری ١٩٨٦دا، بەناوبـژیوانی و دەست پێشخەری حسك و خودی (خاڵە حاجی) ئەندامی سـەرکردایەتی حسك، مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی، ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی حزبـی شـیوعی عێـراق، دەگاتــە ســەفرە و زەروون و لەگــەڵ (مــام جــەلال)دا، کۆدەبێتــەوە و پرســی ئاشـتبوونەوە، تـاوتوێ دەکـەن. بەناوبـژیوانی حـسك و خـودی خاڵـە حـاجی و محەمەدی حاجی مەحمود، ئێران و یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان، لەتـشرینی یەکـەمی ١٩٨٦دا، پەیوەندییـەکانیان، ئاسـایی دەکەنـەوە و ڕێککەوتننامەیـەك مۆر دەکەن.

دوای ئەمـە، بەناوبـژیوانی حـسك و ئێـران، یـەکێتی و پـارتی (مـام جـەلال و ئیدریس بارزانی)، لەتاران، ڕێککەوتنێکی دوو قۆڵی، هاریکاری یەکتری کـردن و ئاشـتبوونەوە لــە ١٩٨٦/١١/٨دا، مـۆر دەکـەن. دوای ئەمـە، یـەکێتی و (حزبـی شیوعی عێراق)یـش، لـەبارەگای پـارتی لـەڕاژان، لـەکانوونی دووەمـی ١٩٨٧دا، کۆدەبنەوە و ڕێککەوتننامەی ئاشتی، مۆر دەکەن.

بەهــەوڵی خێرخوازانــەی هــەموو لایــەك بەگــشتی و حزبــی سۆسیالیــست بەتایبەتی، ڕێککەوتننامەی هاریکاری و ئاشتبوونەوە، لەنێوان هەموو لایەنـە دژ بەیەکەکانی دوێنێ بەرقەرار دەبێت و لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەدەنەوە.

جگـە لەگەیـشتنە قەناعـەتی هـەموو لایەنـەکان، کەلـەڕێگای شـەڕەوە هـیچ کێشەیەك یەکلا ناکرێتەوە لەلایەك و ڕوودانی لـێکترازان لـەنێو خـودی حزبـەکان لەلایەکی ترەوە، دەرفەتی ئاشتبوونەوەی رەپێشتر کـرد. حزبـەکان، هەسـتیان بەوە دەکرد، کەلەرابردوودا، بەهۆی پیادەکردنی سیاسەتی یەکتر قبوڵ نەکردن و تاکڕەوییـــەوە، وردە وردە، پێـــشمەرگە و لایـــەنگرانیان، ڕیزەکانیـــان جێدەهێڵن... یـان، ڕوو لەئـەورووپا دەکـەن، یـانیش لەشـێوەی گـروپ و حزبـی

تــازەوە، لــەحزبی دایــك جیــا دەبنــەوە. بــۆ نموونــە: لــەکاتی مــۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەنێوان لایەنەکاندا:

- ئاڵای شۆڕش، لەیەکێتی جیاببۆوە.
- حزبی زەحمەتکێشان لەسۆسیالیست جیا ببۆوە.
- بەهائەدین نوری لەحزبی شیوعی جیاببۆوە.

بەم شێوەیە، ئەمجارەش شەڕی ناوخۆی خۆکوژی، خـامۆش کرایـەوە. لـەم سەروبەندەدا، هاوئاهەنگی و هاریکاری نێوان لایەنەکان لەبەرەی (جود)دا، ئـەم گەرم و گوڕییەی جارانی نـەمابوو. بـەرەی (جـود) و (جوقـد)، بـەفیعلی لەسـەر گۆڕەپانەکە، کاریگەرییان نەمابوو. بۆیـە، بـۆ دۆزینـەوەی ئەلتـەرناتیڤێکی تـر، ئەمجارە، بەدەسـت پێشـخەری مـام جـەلال، بیرۆکـەی دامەزرانـدنی بەرەیـەکی بـەرفراوانی کوردسـتانی، هاتــە ئـاراوە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە، نـاوبراو، لـەرۆژی ٢٢/٤/١٩٨٧دا، نامەیەکی هاوشێوەی بۆ هەریەك لە: (مەسعود بارزانی، ڕەسوڵ مامەند، ئازاد مستەفا، سامی عەبدولڕەحمان)، نووسی و بەڕێکرد. ئەوانیش بـێ خۆگنخانـدن و دواخسـتن، بـەپیر بانگەوازەکـەوە چـوون. (ئـازاد مـستەفا)ی سـکرتێری پـارتی سۆسیالیـستی کـورد (پاسـۆك)، لـەرۆژی ٢٤/٤/١٩٨٧ و (مەسـعود بـارزانی)یـش لــە ٣٠/٤/١٩٨٧، بەنامــە، وەڵامــی داخــوازی و بانگەوازییەکەیانی دایەوە. پاش پرس و را کردن و دانیشتنی دوو لایـەنی و سـێ لایەنی، بۆ یەکەم جار نوێنەری لایەنەکان، لەرۆژی ١٨/٧/١٩٨٧دا، بەمەبەستی ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا، دەربارەی بیرۆکەکـە، کۆبوونـەوە. ئـەوەی زێـتر هانیـدان کەزووتر ئەم بەرەیە دابمەزرێنن، ڕوودانی کارەساتی کیمیابـارانکردنی هەڵەبجـە لــە ١٦/٣/١٩٨٨ و دەسـتپێکردن و جێبـەجێ کردنــی پرۆســەی وێرانکردنــی دێهاتەکان و ئەنفالکردن بوو لەمانگی نیسانی ١٩٨٨دا، بوو.

لـە ٢/٥/١٩٨٨، نوێنـەرانی هەریـەك لـە (پـارتی، یـەکێتی، سۆسیالیـست، پاسـۆك، پـارتی گـەل، هــەرێمی کوردسـتانی حزبـی شـیوعی)، بەمەبەسـتی تـاوتوێکردن و نووسـینەوەی بەیاننامــەی دامەزرانـدنی بــەرەی کوردسـتانی، لـەخواکورك، کۆبوونـەوە و لـە ٦/٦/١٩٨٨یـشدا، هــەر شــەش لایـەنی نـاوبراو، لەهەمان شوێن، بەیاننامەکەیان مۆرکرد و بڵاو کردەوە.

(حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)، زۆر هەوڵی ئەوەی دەدا کەبێتە ناو بەرەکەوە، بەڵام بەهۆی رازینەبوونی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)ەوە، داواکەی رەت دەکرایەوە. دوای راپەڕین و لەکۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی لە ١٠/٢٧ تاوەکو ١٩٩١/١١/١، هەریەکە لە: (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشووری)یش، لەبەرەی کوردستانی وەرگیران و بوونە ئەندام.

بەرەی کوردستانی، رۆڵێکی کاریگەر و پۆزەتیڤی گێڕا لەخۆ ئامادەکردن بۆ راپەڕین و دوای راپەڕینیش دانووستاندن کردن لەگەڵ حکومەت. هەروەها، هێنانە کایەی بیرۆکەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم و دام و دەزگای ئیداری، چونکە لەم کاتەدا، حکومەتی عێراق، تەواوی دام و دەزگا ئیدارییەکانی لەناوچە ئازادکراوەکاندا، کێشابۆوە.

دوای بەرقەرار بوون و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئۆتۆماتیکی (بەرەی کوردستانی)، رۆڵی نەما و، وردە وردە پووکایەوە[٢٩٧].

## ١- ليستى يەكگرتن (سۆسياليست و پاسۆك) و ئەنجامى هەڵبژاردنەكانى پەرلەمانى كوردستان

سێزدە مانگ دواى راپەڕين و (٣٥) رۆژ پێش پرۆسەى ئەنجامدانى هەڵبژاردن، بێ ئەوەى رێكخستنەكانى حزبى سۆسياليست ئاگاداريان هەبێت، دەنگۆى ئەوە بڵاو بۆوە كەسۆسياليست و پاسۆك بڕياريان داوە يەكبگرن و لەحزبێكى تازەدا، پێكەوە خەبات بكەن. لەكاتى ئەم يەكگرتنەدا، نەك هەر رێكخستنەكان، بەڵكو لەسەر ئاستى لقى هەولێريش، هيچ كەس پرس و رايان پێنەكرابوو.

لەرۆژى ١٩٩٢/٤/٥، لەبەيانێكى هاوبەشدا، پرۆسەى يەكگرتنيان راگەياند. ئەم يەكگرتنە، پێشتر لەقۆناغە جياجياكانى سەردەمى خەباتى شاخ، كارى بۆ كرابوو. پێشينەيەكى لەمێژينەى هەبوو. (لەمێژەوە هەنگاوى بەرەو يەكبوونيان ناوە، لەساڵى ١٩٧٩دا بەهاوبەشى فەرماندەيەتى هێزە سەربازييەكانى خۆيان كردووە... لەساڵى ١٩٨٢دا وتووێژيان كردووە بۆ يەكبوون. لەساڵەكانى ١٩٨٤ تا ١٩٨٦دا، مەفرەزەكانيان بەدوو قۆڵى و گيانێكى برايانەوە كارەكانيان ئەنجام داوە... لەساڵى ١٩٨٩دا پرۆژەى پرۆگرامى هاوبەشيان داناوە بۆ يەكگرتن.. لەمانگى ئابى ١٩٩١دا نوێنەرانى مەكتەبى سياسى هەردوو حزب لەبارەگاى سۆسياليست لەشەقڵاوە كۆبوونەوە بۆ رێگە ئاسان كردن بۆ يەكبوون... لەسەرەنجامدا لەرۆژى ١٩٩٢/٤/٥ نوێنەرانى سەركردايەتى هەردوولا لەبارەگاى پاسۆك لەسلێمانى كۆبوونەوە و لەسەر ئەم خاڵانە پێك هاتن:

١- يەكخستنى هەردوو حزب لەيەك رێكخستنى تازەدا.

٢- پێكهێنانى سەركردايەتيەكي هاوبەش تا كۆنگرەى يەكگرتن.

٣- يەكخستنى هەموو رێكخراوە پيشەييەكانى هەردوولا.

٤- كاركردن بۆ بەستنى كۆنگرە و يەكخستنى پەيڕەو و پرۆگرام.

٥- دەرگا والآيە بۆ حزب و رێكخراوى تر بۆ هاتنە ناو ئەم پرۆژەى يەكگرتنە)[٣٩٨].

سەركردايەتى هاوبەشى هەردوولا، بۆ تاوتوێكردنى پرۆژەى يەكگرتن، بۆ

دووەم جار لەرۆژی ١٩٩٢/٤/١٠، لەمەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیست لەرانیە کۆبوونەوە و، ئامانج و سەرەتا بنچینەییەکانی ئەم پرۆسەیان لەچەند خاڵێکدا خستەڕوو کەبریتی بوون لە:

١- یەکگرتنی هەردوو حزب لەسەر بنچینەیەکی نەتەوایەتی پێشکەوتنخواز.

٢- خەبات کردن لەپێناوی هێنانەدی مافی چارەی خۆنووسین بۆ نەتەوەی کورد.

٣- بڕوابوون بەعێراقێکی دیموکراتی بەمەرجێك گەلی کورد بەمافی چارەی خۆنووسینی خۆی بگات لەگەڵ دابین کردنی مافی کەمە نەتەوەییەکانی تر.

٤- خەبات کردن لەسەر جێ بەجێ کردنی دەسەلاتی یاسادانان و راپەڕاندن و دادپەروەری.

٥- بڕوابوون بەمافەکانی مرۆڤ.

٦- دژایەتی کردنی بیروباوەڕی شۆڤینی تەنگەبەر.

٧- بڕوابوون بەسۆسیالیزمی لەسەر بناغەی چەسپاندنی دادپەروەری کۆمەلایەتی و نەهێشتنی چەوساندنەوەی چینایەتی.

٨- تێکۆشان بۆ فراوان کردنی چوارچێوەی ئەم یەکگرتنە.

٩- کارکردن بۆ بەستنی کۆنگرە و پەسەند کردنی پەیڕەو و پرۆگرامێك بۆ حزبی تازە.

١٠- تا بەستنی کۆنگرە، سەرکردایەتی هاوبەش سەرپەرشتی هەموو چالاکییە سیاسی و راگەیاندن و دارایی و رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکان و پێشمەرگایەتی دەکات.

١١- خەبات کردن بۆ پتەو کردنی بەرەی کوردستانی.

١٢- دەرکردنی ئۆرگانێکی ناوەندی بەناوی (یەکگرتن)[٣٩٩].

ئەم یەکگرتنە، وا بلاو دەکرایەوە کە (رەسوڵ مامەند) کاری بۆ کردووە و دڵخوازی ئەو بووە. هەربۆیەش، کۆبوونەوەکەی سەرکردایەتی هاوبەش لە ١٩٩٢/٤/١٠، لەبارەگای ئەو (مەکتەبی سیاسی) لەرانیە بووە. هەر ئەم کاتە: بارەگایەکی تری مەکتەبی سیاسی لەشەقلاوە هەبوو، کە د. مەحمود عوسمان، لەوێ دادەنیشت.

ڕۆژی دوو شـــەممە، ڕێکـــەوتی ١٩٩٢/٤/١٣، هـــەردوو حـــزب، لەباخـــچەی (گلکەند)ی شاری هەولێر، ئاهـەنگێکیان سـاز کـرد. سـەرەتا، دکتـۆر مـەحمود، وتارێکی خوێندەوە. (عەبدوڵڵا پەشێو)ی شاعیر، بەسەردان لەدەرەوە گەڕابۆوە کوردستان. ئەویش چووە سەر مینبەری ئاهەنگەکـە و چـەند پارچـە شـیعرێکی خوێندەوە. هەروەها ئەوەشی گوت: (... من بۆ هیچ حزبێك شیعر نـاڵێم، بـەڵام چونکە ئەوە یەکگرتنە بۆیە زۆر پێخۆشحاڵم).

دوای خوێندنـەوەی شیعرەکانی پەشێو، هـەردوو تیپـی مۆسیقای (شـەهید کاردۆ گەلاڵی) و (تەلار)، بەشداری ئاهەنگەکەیان کـرد و، گـۆرانی بێـژان: (زیـاد ئەسعەد، محەمەد عەزیز، جەزا سـاڵەیی، جـەلال پـەرێشان)، چـەندین گۆرانیـان پێشکەش کرد. ئاهەنگەکە، سێ کاتژمێری خایانـد. بـۆ شـەوەکەی هـەمان ڕۆژ، کاتـژمێر هەشـتی ئێـوارە، لیژنـەی ڕاگەیانـدنی هـەردوو حـزب (سۆسیالیـست و پاسۆك)، لەگەڵ دکتۆر مەحمود، کۆبوونەوە. (شێرزاد شێخانی، ئاسۆ حەسەن، فازیـل قـەرەداغی، ئیـسماعیل تـەنیا، بـرزۆ عـەلی هـەژار)، لەڕاگەیانـدنی حزبـی سۆسیالیـست و، (نـزار محەمـەد، سـۆزان خـان، ئـازاد)، لەپاسـۆك، بەشـداری کۆبوونەوەکەیان کرد.

بڕیاردرا، تا هەڵبژاردنی پەرلەمان لە (٥/١٩)، بەلایەنی کەم دەبێت پێـنج تـا شەش ژمارە لەڕۆژنامەکە دەربکرێت و ڕۆژنامەکەش ناوی (یەکگرتن) دەبێت.

لە ١٩٩٢/٤/٣٠، یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکە دەرچوو، بەڵام لەبەر ئەوەی یـەك ڕۆژ مابوو بۆ مانگی مایس، لەسەر ڕۆژنامەکەش نووسرا بوو مانگی مایس، لەبەر ئەوە لە ٤/٣٠دا، بڵاو نەکرایەوە. ڕۆژێـك دواتـر، لـە ١٩٩٢/٥/١دا، دابـەش کـرا و بڵاو کرایەوە.

لـە ١٩٩٢/٤/٣٠دا، هەڵبـژاردنی یـەکێتی مامۆسـتایانی کوردسـتان، ئـەنجام درابوو. هەردوو لیستی سۆسیالیست و پاسۆك، بەهەردوو لایان نـەیانتوانی بـوو ڕێـژەی پێویـست وەدەسـت بێـنن و بەشـداربن لەدامەزرانـدنی ئـەم (یـەکێتی مامۆستایانی کوردسـتان)ە چـاوەڕوانکراوە. تـا ڕادەیـەك هەسـت بـەوە دەکـرا، کەئەندام و هەوادارانی حزب و جەماوەرەکەی، کەمێك بەبێ ئومێدیـەوە سـەیری هەڵبژاردنی پەرلـەمانیان دەکـرد. هەڵبـژاردنی مامۆسـتایان، پێـشینەیەکی بـاش

بوو، ئەوەی نیشان دەدا کەسۆسیالیست و پاسۆك، ناتوانن بەربەستی رێژەی لەسەدا حەوت تێپەڕێنن و بگەنە پەرلەمان. لەگەڵ هەست کردن بەم راستیەش، سەرکردەکان، ئەوەیان دووپات دەکردەوە کەبەدڵنیاییەوە زۆر لەم رێژەیە زێتر بەدەست دەهێنن.. حزبەکان، هەرکەسەو بۆ خۆی پروپاگەندەی هەڵبژاردن و رێ رۆیشتن و دروشمەکانی خۆیان بڵاو دەکردەوە. رۆژی ١٩٩٢/٥/٦، سەرکردایەتی هاوبەش، لەکاتژمێری پێنجی ئێوارە، مەزنترین خۆپیشاندان و رێ رۆیشتنیان بەئۆتۆمبیل رێك خست کەبەزیاتر لە (٢٣٥) ئۆتۆمبیل، مەزەندە دەکرا.

لەناو شاری هەولێر، لەگەڕەکەکانی (ئازادی، کوران، گەڕەکی عەسکەری، گەڕەکی سەدام، حەی عەدل، ٩٢، مەهاباد، مەنتکاوە، ئەندازیاران، روناکی، باداوە، سەیداوە، شۆڕش، ٧ی نیسان) سوڕانەوە و، هێز و بنکەی جەماوەری خۆیان نمایش کرد. ئەم دروشمانە لەمایکرۆفۆنی ئۆتۆمبیلەکانەوە دەوترانەوە: (دکتۆر مەحمود رابەرە– گەلی کورد تاجی سەرە)، (دکتۆر مەحمود سۆرانی– پێشرەوی کوردستانی)، (یەکگرتن یەکگرتن– تاکە رێگای سەرکەوتن)،...تاد. رێڕەو و خۆپیشاندانەکە، تا کاتژمێر نۆی شەو درێژەی کێشا. ئەم چالاکییە زێتر بۆ بەرزکردنەوەی ورەی ئەندام و جەماوەر و هەوادارانی حزب بوو.

پێش ئەوەی پرۆسەی هەڵبژاردن ئەنجام بدرێت، چەند رۆژێك پێش ١٩٩٢/٣/١٧، مام جەلال داوا لەسۆسیالیست دەکات پێکەوە بەیەك لیست بەشداری هەڵبژاردن بکەن. هەندێك لەئەندامانی سۆسیالیست رازی دەبن، هەندێکی تر دژی دەبن و حەز دەکەن لەگەڵ پارتی لیستی هاوبەش دروست بکەن. سەرەنجام شێوەیەك لەدژایەتی و ناتەبایی دەربارەی بەشداربوون لەگەڵ یەکێتی دروست دەبێ و هەوڵەکە ناکام دەبێت[٤٠٠]. هەندێك برادەر لەسەرکردایەتی سۆسیالیست وێنەیەکی دوور لەواقیعیان دابووە سکرتێری حزب کەئەگەر سۆسیالیست بەتەنها بەشداری هەڵبژاردن بکات، دەنگی زۆر وەدەست دێنێ و خەڵکێکی زۆر متمانەیان پێی هەیە و گوایا جەماوەر لەدوو لایەنەکە بێزار بوون، قەناعەتیان بەدکتۆر مەحمودیش کردبوو... سکرتێری حزب قەناعەتی بەوە نەبوو سۆسیالیست بەتەنها خۆی بچێتە پرۆسەکەوە بەڵام ئەو

قەناعەتەی نەدەدرکاند و حەماسەتیشی بۆ هەڵبژاردنەکە نەبوو. پاش ئەوەی رای جیاواز و ناتەبایی برادەرانی بینیبوو، لێگەڕا بوو چۆن کارەکە دەڕوات با بڕوات، خۆشی سەفەری لەندەنی کرد(٤٠١).

کاتژمێر پێنجی سەر لەئێوارەی رۆژی ١١/٥/١٩٩٢، د. مەحمود عوسمان، لەگۆڕەپانی پێش بینایەی پارێزگای هەولێر، کۆڕێکی جەماوەری ساز کرد. خەڵکێکی زۆر ئامادەی ببوون. ناوبراو، وەك پیشەی هەمیشەیی، زیتر جەختی لەسەر پاراستنی ریزەکانی گەل و یەکگرتن و پەرلەمان، کردەوە. پاشان زۆر بەکورتی، باسی ژیانی خۆی کرد. ئینجا هەڵوێستی حزبی روون کردەوە و گوتی: بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵ پێکهاتەکانی تری عێراق، بڕوامان بەسیستەمی فیدراڵی هەیە، هیچ لایەنێك ئەو هەقەی نییە داوای ئۆتۆنۆمی، یان مافی چارەی خۆنووسین بکات، چونکە ئەم بڕیارە پەرلەمانی هەڵبژێردراوی داهاتوو دەیدات... هەروەها ئەوەشی راگەیاند ماوەی شەش مانگ لەمەوبەر، دەربارەی تاقیکردنەوەکانی ئەم ساڵی خوێندن، پەیوەندیمان بەرێکخراوی (یۆنسکۆ)ی پەروەردە و فێرکردن کرد، ئەوان پێیان راگەیاندین کەدان بەبڕوانامەی ئەمساڵی قوتابیان دەنێن.

ململانێی رەسول مامەند و دکتۆر مەحمود، پێش هەڵبژاردن، بەزەقی دەبیندران. لەگەرمەی پڕوپاگەندەکردنی هەڵبژاردندا، سکرتێری حزب بەسەردان چووبووە لەندەن. هیچ ئامادەگییەکی نەبوو لەپڕوپاگەندەکردنی بۆ حزب و دەنگ کۆکردنەوە. د. مەحمودیش لەهەموو کۆڕ و کۆبوونەوە جەماوەرییەکاندا، یەکەم وشە و دوا وشەی هەر کوردایەتی بوو. سۆزی سەرکردایەتی پاسۆك و کادیرە پلە دووەکانی بەتەواوەتی بۆ لای خۆی راکێشا بوو. ئەوان (پاسۆك)، بەوە رازی دەبوون کەحزبی یەکگرتووی ئایندە، د. مەحمود، سکرتێر یان سەرۆکی بێت. ناوبراو رۆژێك لەرۆژان، پڕوپاگەندەیەکی بۆ حزب نەکرد و تەنانەت لەزۆر کۆڕ و کۆبوونەوەشدا هەر ناوی حزبی نەدەهێنا. وەك ئەوە وابوو، ئەو نوێنەری حزبێکی ترە، یان سەرکردەیەکی بێلایەنە...

ئامادەبوانی کۆڕەکانی ناوبراو، ئەگەر پێشتر نەیانزانیبوایە کەدکتۆر یەکێکە

لەکەسایەتییە دیارەکانی سۆسیالیست، ئەوا بەقسە و بۆچوونەکانی نەیاندەزانی ئەو سۆسیالیستە و نوێنەرایەتی ئەم سەرکردایەتیە هاوبەشە دەکات.

رۆژی ١٩/٥/١٩٩٢، هەڵبژاردن ئەنجام درا. خەڵکی کوردستان بەحەماسەتەوە روویان لەسندوقەکانی دەنگدان کرد. لەکاتژمێر هەشتی بەیانی دەستی پێکرد و لەکاتژمێر دوازدەی شەو تەواو بوو. لەسەرانسەری ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان، یەك ملیۆن و حەفتا و دوو هەزار و حەفسەد و چل و پێنج (١٠٧٢٧٤٥) کەس، دەنگیان دا. تەزویر و خروقاتێکی زۆر کرا. خەڵك هەبوو لەچەند شوێنێك دەنگی دابوو. ئەو مەرەکەب (رەنگ)ەی کەبۆ دڵنیابوون لەوەی دەنگدەر لەجارێك زیاتر دەنگ نەدەن، بەکارهێنرا، بەئاسانی، دەتوانرا بسڕێتەوە. لەبەر ئەم خروقات و قەڵەبالغی و پاڵەپەستۆیە، خەڵکێکی زۆر نەیانتوانی دەنگ بدەن. وەك نارەزایی دەربڕینێك دەربارەی ئەم خروقاتانە، هەموو لایەن و پارتە بەشداربووەکان (جگە لەیەکێتی)، بەیاننامە و روونکردنەوەیان، بڵاو کردەوە. پارتی دیموکراتی کوردستان، بڵاوی کردەوە: هەرچەندە ئێمە سەرکەوتووین، بەڵام دان بەم هەڵبژاردنە نانێین. حزبی شیوعی لەهەموو بنکەکانی دەنگدان، مەحزەری بنکەکانیان واژۆ نەکرد. لەبری ئەوە بەنووسراو نارەزاییان دەربڕی. د. مەحمود عوسمان، روونکردنەوەی بڵاو کردەوە.

ترس و دڵەڕاوکێ، باڵی بەسەر کوردستاندا، کێشابوو. خەڵك لەوە دەترسان، لایەنەکان نەگەنە یەك و شەڕی ناوخۆ رووبدات. پاش سێ رۆژ لەبێدەنگی و رانەگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن، پاش کۆبوونەوە و بێنە و بەردە لەنێوان یەکێتی و پارتی، هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی دانیان بەوە دانا کەتەزویر و خروقات کراوە. لەبەر بەرژەوەندی گشتی و لەکەدار نەبوونی ئەم ئەزموونە، بەئەنجامەکانی رازین، بەمەرجێك پاش شەش مانگی تر (مانگی تشرینی یەکەم)، دووبارە هەڵبژاردنێکی رێك و پێك، بکرێتەوە. حزبی شیوعی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەرێژەی لەسەدا حەوت وەلا بنرێ و هیچ رێژەیەك دانەنرێ.

لەرۆژی ١٩٩٢/٥/٢٢، لەهاوینەهەواری سەلاحەدین (پیرمام)، بەئامادەبوونی مام جەلال و مەسعود بارزانی و لایەنەکانی تری ناو بەرە، لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا، ئەنجامەکان بەم شێوەیە راگەیەنرا:

- پارتی دیموکراتی کوردستان: ٤٩١٤٩٧ دەنگ، بەرێژەی ٥٠,٢٢٪.
- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لیستی هاوبەشی زەحمەتکێشان و یەکێتی: ٤٧٥٧٣١ دەنگ، بەرێژەی ٤٩,٧٨٪.
- لیستی ئیسلامی: ٤٩١٠٨ دەنگ.
- لیستی یەکگرتن، (سۆسیالیست و پاسۆك): ٢٤٨٨٢ دەنگ.
- لیستی حزبی شیوعی: ٢١١٢٣ دەنگ.
- لیستی پارتی گەل: ٩٩٠٣ دەنگ.
- لیستی بێلایەن: ٥٠١ دەنگ.

دەنگی ئەم چوار کەسەی کەخۆیان بۆ رابەر کاندید کردبوو، بەم شێوەیە راگەیەنرا:

- مەسعود بارزانی: ٤٦٦٨١٩ دەنگ.
- جەلال تاڵەبانی: ٤١٠٠٧٥ دەنگ.
- عوسمان عەبدولعەزیز، ٣٨٨١٥ دەنگ.
- د. مەحمود عوسمان: ٢٣٣٤٢ دەنگ.

کۆی گشتی (٩٣٩٠٣٣) کەس بۆ رابەر دەنگیان دابوو. دەبوو (رابەر)، (٤٦٩٥١٦) دەنگ زیاتر بهێنێ، بەڵام هیچ کام لەکاندیدەکان ئەم رێژەیان نەهێنا، بۆیە بۆ خولی دووەمی هەڵبژاردنی چاوەڕوانکراو لە (تشرینی یەکەم)، دوا خرا. پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ (رابەر)، (٥٦٧٦٢) دەنگ و بۆ پەرلەمان (١٥٧٦٦) دەنگی لەلیستی هاوبەشی یەکێتی و زەحمەتکێشان، زیاتر هێنابوو.

سەیر لەوەدا بوو، ئەو کەسانەی کەدەنگیان بەلیستی سۆسیالیست و پاسۆك دابوو، زیاتر بوو لەو کەسانەی کەدەنگیان بەرابەری هەمان لیست (د. مەحمود) دابوو، د. مەحمود، (١٥٤٠) دەنگی کەمتر لەلیستەکەی خۆی هێنابوو. ئەوە لەکاتێکدا دەبوو کاندیدی رابەر زێتر لەلیستەکەی دەنگ بهێنێ، چونکە هەر

تـەنها نوێنەرایـەتی حـزب ناکـات، بـەڵکو نوێنـەری تـەواوی گەلـە. بـەڵام وا دەرکەوت، بەهۆی ململانێی نێوخۆی حزب، ئەوانـەی دەنگیـان بەسۆسیالیـست (لیستەکە) دابوو، هەندێکیان دەنگیان بە د. مـەحمود نـەدابوو. ئەوانـە ببوونـە دوو بەش: بەشێکیان، ئەوانەی لەگەڵ پارتی هاوسۆز بوون، دەنگیان بەمەسعود بارزانی دابوو. ئەوانەی کەلەگەڵ (یەکێتی)یش هاوسـۆز بـوون، دەنگیـان بـەمام جەلال دابوو. واتە: بەشێك لەدەنگەکانی سۆسیالیـست بـۆ کاندیـدی رابـەر، بـۆ پارتی و یەکێتی رۆیشت. بیانووی ئـەو کەسـانە ئـەوە بـوو، دەیـانگوت: دکتـۆر مـەحمود لەبەرامبـەر بـارزانی و تاڵـەبانی هـەر سـەرکەوتوو نابێـت، ئـەوجا بـا دەنگەکانمان بەفیڕۆ نەڕوات و بیدەینە ئەو کەسەی کەبەشایستەی ئەو پۆستەی دەزانین.

دوای هەڵبژاردن، ئەندامانی سۆسیالیست، بەشێکیان ئەوەیان نەدەشاردەوە و بەئاشکرا دەیانگوت: لەبەر ململانێـی توونـدی یـەکێتی و پـارتی، تـەواو لـەوە دڵنیا بووین کەدکتۆر مەحمود دەرناچێت، بۆیە دەنگمان پێنەداوە و لەبری ئەو بەمەسعود، یان (مام جەلال)مان داوە.

هۆکـارێکی تـری شکـستی لیـستی سۆسیالیـست و پاسـۆك، ئـەوەبوو: ئـەو برادەرانـــەی سەرپەرشـــتی پرۆســـەی هەڵبـــژاردن و پڕوپاگەنـــدەیان دەکـــرد، بەرچاوڕوونی تەواویان نـەبوو، هـەتا جەماوەرەکـەیش دابەشـی سـەر یـەکێتی و پارتی ببوون. رێککەوتنی پێشووی مام جەلال و کاك رەسوڵ بۆ هاوپەیمانێتی و پاشان هەڵوەشاندنەوەی، دواتر نزیك بوونەوە لەپارتی و تێکـەڵاو بـوونی ئـاڵای سـەوز و شـین (رەنگـی شـین تایبـەت بـوو بەلیـستی سۆسیالیـست و پاسـۆك)، جارێکی تر زەرد و شین، ئەندام و هەوادارانی تووشی سەرلێشێواوی و نیگەرانی کرد. سەرەنجام سۆسیالیست زیانی بەرکـەوت[٤٠٢] و لـەم پرۆسـەیەدا، شکستی هێنا.

دوای راگەیانـدنی ئـەنجامی کۆتـایی و هـاوێرکردنی دەنگـەکان، یـەکێتی و پارتی، بۆ خۆ بەهێزکردن، هەریەکەو لەلای خۆیەوە، مجامەلەی حزبـە شکـست خواردووەکانیان دەکرد و لێیان نزیـك دەبوونـەوە. هـەوڵیان دەدا، لەحکومـەتی داهـاتوو لەسـەر لیـستی خۆیـان بەشـداریان پـێ بکـەن. بـۆ ئـەم مەبەسـتە، لـە

٣٠/٥/١٩٩٢، بـەئامادەبوونی رەسـوڵ مامەنـد و دکتـۆر مـەحمود و مەسـعود بـارزانی، کۆبوونەوەیـەك لـەنێوان پـارتی و سۆسیالیـست رێکـدەخرێت. پـارتی وتبوویـان: بـەگرنگی دەزانـین لەگـەڵ سۆسیالیـست نـزیکتر ببینـەوە تـا رادەی یـەکگرتن و پێویـستیان بەکەسـانی بـەتوانا و خـاوەن ئـەزموون هەیـە و دەوری شایستە دەدرێتە برادەرانی سۆسیالیـست لەتەشـکیلەی داهـاتووی پـارتی دا...

هەروەها یەك رۆژ دوای کۆبوونەوە لەگەڵ پارتی، مام جەلال سەردانی مەکتـەبی سیاسـی حزبـی سۆسیالیـستی لەشـەقڵاوە کـرد و داوەتـی کـردن کەلەگەڵیانـدا کۆببێتەوە.

سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیست دەچنە بارەگای مام جـەلال لەشـەقڵاوە و لەگەڵیدا کۆدەبنەوە. لەوێدا، مام جەلال باسی دۆستایەتی و پەیوەندی بەهێزی خـۆی بەرامبـەر بەسۆسیالیـست تـازە دەکاتـەوە و ئامـادەیی پیـشان دەدا بـۆ هەموو هاوکارییەك. بـەڵام راسـتەوخۆ باسـی یـەکگرتن و ئـەو بابەتانـە ناکـات و دەرگای کرانەوەی هەموو بابەتێکی بەکراوەیی هێشتبۆوە[٤٠٣].

## ٢- پارتی گەل لەگەڵ پاسۆك و سۆسیالیست یەکدەگرێت :

دوای ئـەوەی (پـارتی گـەلی دیمـوکراتی کوردسـتان)، بەرێبەرایـەتی سـامی عەبدولڕەحمان، لەهەڵبژاردنی پەرلەماندا، دەنگێکی زۆر کـەمی هێنـا و هەسـتی بەوە دەکرد کەلەلایەن (یـەکێتی و پـارتی)یـەوە دژایـەتی دەکرێـت، بەناچـاری، بەوە رازی بـوو کەلەگـەڵ هـەردوو حـزب (پاسـۆك و سۆسیالیـست)، لـەحزبێکی تـازەدا، یـەکبگرێت. نـاوبراو سـەرکردەیەکی دیـاری پـارتی بـووە. هـەروەها لەدامەزراندنـەوە و رێکخـستنەوەی پارتیـدا لـەپاش نـسکۆی ١٩٧٥، رۆڵێکـی بەرچـاوی هـەبووە. لەسـاڵی (١٩٧٩)دا، لـە (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان)، سەرکردایەتی کاتی، جیابۆتەوە و لە ٢٦/٧/١٩٨١دا، پـارتێکی بـەناوی (پـارتی گەلی دیموکراتی کوردستان)، دامەزراندووە.

پرۆژەی یەکگرتن لەگەڵ پـارتی گـەل، بیرۆکەکـەی، ئـەو برادەرانـە خـاوەنی بوون کەحیـساباتی هەڵـەیان بـۆ دەنگـەکانی سۆسیالیـست کردبـوو، وێنەیـەکی ناواقیعیانەی قەبارەی حزبیان دابووە سکرتێر. بەڵام خاڵی هاوبـەش و مێـژووی

هاوبەش لەگەڵ سامی و پارتی گەل زۆر کەم بوو. سەرەتا زۆربەی ئەندامان لەگەڵ ئەوە نەبوون لەسامی نزیك ببنەوە، بەڵام کەمەسەلەکە بووە جدی، کەس رای پێچەوانەی دەرنەبڕی[٤٠٤].

هەر لەسەرەتاوە، رەسوڵ مامەند، وەك سکرتێری حزب، بەپارێزەوە بۆ یەکگرتن لەگەڵ پارتی گەل دەچوو، پێچەوانەی ئەمەش (سامی عەبدولڕەحمان) هەمیشە دژی رەسوڵ مامەند بووە و بەنەخوێندەواری لەقەڵەم داوە[٤٠٥].

دوو سێ رۆژ پاش راگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و پێکهاتنی یەکێتی و پارتی لەسەر پێکهێنانی پەرلەمان، رۆژی ١٩٩٢/٥/٢٥، شەمسەدین موفتی، بەوەرگرتنی ئۆکەی لەدکتۆر مەحمود عوسمان و رازی بوونی، سەردانی سامی عەبدولڕەحمان دەکات و پێشنیارێك دەخاتە بەردەم ناوبراو بۆ چوونە ناو ئەم یەکگرتنەی (سۆسیالیست و پاسۆك). سێ رۆژ دوای ئەم سەردانە، لە ١٩٩٢/٥/٢٨دا، دکتۆر مەحمود و شەمسەدین موفتی و عەدنان موفتی بۆ مەسەلەی یەکگرتن سەردانی سامی عەبدولڕەحمان دەکەن. دوای ئەم سەردان و یەکتر بینینانە، شاندێکی پارتی گەل لە ١٩٩٢/٦/٣ سەردانی رانیە دەکەن و لەگەڵ رەسوڵ مامەند کۆدەبنەوە و دەربارەی یەکگرتن، نیمچە رێککەوتنێك دەکەن[٤٠٦].

شەمسەدین موفتی، زیاتر لەباڵی د. مەحمود عوسمان نزیکتر بوو وەك لەرەسوڵ مامەند. ناوبراو کاتی خۆی لەسوریا، یەکێك بووە لەسەرکردەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان– لیژنەی ئامادەکردن)، کە د. مەحمود رێبەرایەتی دەکرد. لەرۆژی ١٩٩٢/٦/٨دا، بەئامادەبوونی زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی و کادیرانی هەرسێ حزب: (گەل، پاسۆك، سۆسیالیست)، کاتژمێر شەشی ئێوارە، لەبارەگای سامی عەبدولڕەحمان، لەسەر شەقامی شەست مەتری (خانووی ئەمین عامەکانی سەردەمی رژێم)، یەکگرتنیان راگەیاند و، بەیانێکی هاوبەشیان بڵاو کردەوە. سکرتێری هەرسێ حزبەکە: (رەسوڵ، سامی، ملازم شوان)، ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون.

دوای ئەمە، ئێوارە خوانێك رێکخرا و، هەر لەوێ کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسی بەسترا. لەبەیاننامە هاوبەشەکەی هەرسێ حزبەکەدا، هاتبوو: (رووداوە سامناك

و کارەساتە دڵتەزێنەکانی کوردستان، هەروەها سەرکەوتنەکانی مێژوو سەلماندوویانە گەلی کوردستان و هێزە سیاسییەکانی بەیەکگرتوویی دەتوانن خواست و ئاوات و مافە رەواکانی شۆڕشی کوردستان بەدی بهێنن و هەر ئەو هەنگاوە دڵسۆزانەیشە رۆڵی سروشتی و کاریگەری خۆی دەبینێ و وەك بورکانێکی ئاگرین دەتەقێتەوە. ئێستاش لەروانگەی هەست بەبەرپرسیاری نەتەوەییمان بەکردەوە بۆ دۆست و دوژمنی کوردی دەسەلمێنین کەبەرژەوەندی گەلی چەوساوە و ستەمدیدەی کوردستان لەسەرووی خواست و ئارەزووی تاکەکەسی و بەرژەوەندی حزبایەتی تەسکەوەیە... هەرسێ حزبی کوردستانی لەحزبێکی نەتەوەیی پێشکەوتووخوازی دیموکرات یەکیان گرت)[٤٠٧].

## ٣- کۆنگرەی یەکگرتن ٢٠/٨-١٩٩٢/٨/٢٧:

لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٠، لەژێر دروشمی: (یەکگرتن لەپێناوی سەرکەوتنی کوردستان)، هەرسێ حزب، بەئامادەبوونی (٨٦٨) ئەندام، لەهۆڵی میدیا لەشاری هەولێر، یەکەم کۆنگرەی یەکگرتنیان بەست[٤٠٨].

حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بەبەشداری ئەندامانی سەرکردایەتی و کادیر و فەرماندە عەسکەرییەکان، لەرۆژی ١٩٩٢/٧/٩، لەشاری سلێمانی، لەهوتێل (ئەبو سەنا)، پلینۆمێکی گرێدا. لەوێ، گفتوگۆ و راگۆڕینەوە و سەرنج و تێبینی خرابوونەڕوو دەربارەی کۆنگرەی یەکگرتنی هەرسێ حزبەکە و رۆڵی سۆسیالیست لەم حزبە تازەیەدا. هەر لەوێدا: باسی رۆڵی قارەمانانەی حزبی سۆسیالیست لەخەباتی شاخ و دروستبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکان و دەرچوونی لەیەکێتی و پاشان دروستبوونی شەڕی ناوخۆ، کرابوو. ئاماژە بەوە کرابوو کەلەئەنجامی شەڕی ناوخۆی شاخ، حزب (١٧٩) شەهیدی بەخشیوە.

لەم پلینۆمەدا، بەزۆرینەی دەنگ، بڕیار لەسەر ئەم خاڵانە درابوو:

- لەکۆنگرەی یەکگرتن دا، دەبێت حزبە تازەکە ناوی (حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان) بێت. بۆیەش وشەی (دیموکراتی) زیاد کرابوو. چونکە، ئەم وشەیە لەهەردوو حزبی تر (گەل) و (پاسۆك)دا، هەبوو. جگە

لــەوەش، (بزوتنـــەوە)، لەســـەرەتای دامەزراندنیـــدا، نـــاوی بزوتنـــەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان بوو. بەم کارەیان، دەیانویست هەردوو پارتی ناوبراو رازی بکەن.

- دەبێت بێ دەنگدان، سەرۆك یان سکرتێری حزبی تازە لەسۆسیالیست بێت.
- هەروەها (بڕیاریان دابوو پەلە لەیەکگرتن نەکرێ، بۆیە د. مەحمود عوسمان تووڕە دەبێت و دەڕواتەوە ئەورووپا)(٤٠٩).

لە ١٩٩٢/٧/٢٧، لەهوتێل ئەبو سەنا لەسلێمانی، هەرسێ حزبەکە، بڕیاری بەستنی کۆنگرەیان دابوو. د. مەحمود و عەدنان موفتی و عادل موراد، لەدەرەوە بوون. بەشداری کۆنگرەیان نەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کەلەکۆنگرەشدا نەبوون، سۆسیالیستەکان، ئەوانیان پاڵاوت و دەنگیشیان هێنا.

یەکەم رۆژی کۆنگرە تا کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ، بۆ خوێندنەوەی وتار و بروسکەی حزب و لایەنی میوان و بانگ هێشت کراوەکان، تەرخان کرابوو، لەوانە:

وتاری سەرۆکی شارەوانی هەولێر، پەرلەمانی کوردستان کەلەلایەن جەوهەر نامیق، خوێندرایەوە. وتاری د. رۆژ نوری شاوەیس، جێگری سەرۆك وەزیرانی حکومەتی هەرێم. وتاری وەزارەتی رۆشنبیری لەلایەن (شێرکۆ بێکەس)ی وەزیر، خوێندرایەوە. وتاری سەلاح حەفید و محەمەدی مەلا قادر و پاشان وتاری حزبەکان خوێندرایەوە، کەبریتی بوون لە:

- مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەلایەن نێچیرڤان بارزانی، خوێندرایەوە.
- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەلایەن د. کەمال فوئاد، خوێندرایەوە.
- وتاری بەرەی کوردستانی، لەلایەن هاورێ مەلا حەسەن، خوێندرایەوە.
- وتاری حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، لەلایەن د.سەردار، خوێندرایەوە.
- وتاری حزبی شیوعی عێراق، لەلایەن عەبدولرەزاق صافی، خوێندرایەوە.
- وتاری کۆمەڵەی دیموکراتی عێراقی، لەلایەن (ئەبو فراس)، خوێندرایەوە.

لەگەڵ چەند وتارێکی تریش، هەروەها چەندین بروسکەش گەیشتە کۆنگرە. لەوانە: (بروسکەی د. فوئاد مەعسوم، بروسکەی وەزیری شارەوانی و

هاوینەهەوارەکان، بروسکەی کۆلۆنێل ریتشارد ویلسۆن فەرماندەی هێزی هاوپەیمانەکان لەزاخۆ، بروسکەی بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشووری، بروسکەی بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستانی عێراق، بروسکەی حزبی پارێزگاران، یەکێتی نووسەرانی کورد- مەڵبەندی گشتی، پارتی تورکمانی عێراقی، کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان، پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران- تەیاری شۆرشگێڕ، سەرکردایەتی هاوبەشی پارتی دیموکراتی کوردی یەکگرتوو- سوریا،...تاد).
هەروەها، رەسوڵ مامەند، سامی عەبدولڕەحمان، عەبدوڵڵا ئاگرین، هەریەکەو وتاری حزبەکەی خۆیانیان خوێندەوە.

پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژ، چەند لیژنەیەك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کۆنگرە، وەك: لیژنەی راپۆرتی سیاسی و پەیڕەوی ناوخۆ و پرۆگرام و...تاد، داندران. پاش گفتوگۆکردن، کۆنگرە بڕیاری لەسەر:

- پرۆگرامی حزبی یەکگرتنی کوردستان.
- پرۆژەی ناوخۆی حزب.
- راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی یەکگرتن- دا.

کۆنگرە چەند رۆژێك بەردەوام بوو. لەدواجاردا، بڕیاردرا سەرکردایەتی حزب (٢٤) ئەندامی کارا و (٦) ئەندامی یەدەگ، پێك بێت. لە (٢٤) ئەندامەکە، هەر (٨) کەس لەحزبێك بێت. بۆ ئەم مەبەستە لەسۆسیالیست (٢٤) کەس و، لە (گەل) ٢٤ و، لەپاسۆك ٢٠ کەس خۆیان بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پالاوت. پاش پرۆسەی دەنگدان، جیاکردنەوە و ژماردنی دەنگەکان، دەستی پێکرد. هەموو پاڵێوراوەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە دەنگیان هێنا:

- یەکەم: حزبی سۆسیالیستی کوردستان: (محەمەدی حاجی مەحمود ٥٥٣ دەنگ، قادر جەباری ٥٢١، سەعد عەبدوڵڵا ٥١٨، د. مەحمود عوسمان ٤٩٣، عومەر بۆتانی ٤٤٥، رەسوڵ مامەند ٤١٧، سەید کاکە ٣٦٠، نیزامەدین مەجید گلی ٣٥٣، محەمەد شاکەلی ٣٣٠، شێروان شێروەندی ٢٩٨، عەدنان موفتی ١٩٥، مامۆستا ئەمین قادر ١٨٠، رێبوار عەبدولڕەحمان ١٤٦، خاڵە حاجی ١٣٠، سەید عەبدوڵڵا کەردزی ١١٨، موحسین عوسمان ١١١، سەید قادر جەباری ١٠٣، عەلی ئەحمەد وەیسی ٩٥، شێخ سەردار ٧٨، بەکر حەمە ٦٩، حەمەسوور تەها

٦٠، مەلا ناسیح ٥٥، بەهرۆز گەلآلّی ٤٤، مامۆستا سەلام گۆمەشینی ٤١ دەنگ).

– **دووەم:** پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان: (سامی عەبدولڕەحمان ٤٧٧ دەنگ، د. مەجید جەعفەر ٤٦٠ دەنگ، عەبدوللّا سالّح ٤١٥، بروسکە شاوەیس ٣٨٤، مەجید رزگاری ٣٠٢، رێکار ئەحمەد ٢٩١، زێرەڤان ٢٧٥، فازل جەلال ٢٣٧، پالّە باوانی ٢٣٥، عادل مەجید ١٨٦، ئەدیب چەلکی ١٧٧، دیدار ١٧٤، یوسف یاسین ١٥٢، لەزگین کۆچەر ١٤٩، کامەران کەرکوکی ١٤٥، خەسرەو عەزیز گۆران ١٢٠، جەمیل خدر ١٠٥، سەردار محەمەد ٩٧، ئەحمەد هەولێری ٩٦، موحسین قۆچان ٩٥، هوشیار رێکانی ٩٢، هەمزە رەشۆ ٨٢، هۆشەنگ ٧٣، عەبدولقادر ٢٥ دەنگ).

– **سێیەم:** پارتی سەربەخۆیی دیموکراتی کوردستان (پاسۆک): (ملازم شوان ٦٤٨ دەنگ، ملازم کەریم ٦٤٧ دەنگ، عەلی بەگ (عەلی جاف) ٣١٤ دەنگ، موژدە تاهیر ٣١١، عەبدوللّا ئاگرین ٢٩٥، مامۆستا هادی ٢٤٧، بارزان سەعید گەوهەر ٢٤٣، حوسێن جاف ٢٤٢، کامیل ژیر ٢٢٥، کەریم مەحمود (کەریم رۆژ) ١٨٠، شێخ محەمەد بالّەك ١٧٠، غاندی ئەنوەر ١٦٣، بەختیار شەوکەت ١٥٣، ئومێد عەباس ١٤٨، فەرهاد سەدیق ١١٧، مامۆستا هێمن ٩٩، عیرفان عەلی ٩٩، هوشیار کەریم ٨٧، مەلا فایەق ٨٤، مامۆستا فایەق ٥٠ دەنگ).

لەم (٦٨) پالّێوراوەی سەرەوە، دەبوو (٢٤) ئەندامی کۆمیەی ناوەندی کاراو، (٦)ی یەدەگ، هەلّبژێردرێت. بەپێی رێژەی دەنگەکان، ئەمانە بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی: (محەمەدی حاجی مەحمود، قادر جەباری، سەعد عەبدوللّا، د. مەحمود عوسمان، عومەر بۆتانی، رەسولّ مامەند، سەید کاکە، نیزامەدین مەجید گلی) لەسۆسیالیست و، (سامی عەبدولڕەحمان، د. مەجید جەعفەر، عەبدوللّا سالّح، بروسکە شاوەیس، مەجید رزگاری، رێکار ئەحمەد، زێرەڤان، فازیل جەلال) لەپارتی گەل و، (ملازم شوان، ملازم کەریم، عەلی بەگ، موژدە تاهیر، عەبدوللّا ئاگرین، مامۆستا هادی، بارزان سەعید گەوهەر، حوسێن جاف)، لەپاسۆك. هەروەها شەش ئەندامی یەدەگیش دەستنیشان کران، کەئەمانە بوون: (شێخ محەمەد شاکەلی، شێروان شێروەندی) لەسۆسیالیست و، (پالّە، عادل مەجید) لەپارتی گەل و، (کامیل ژیر، کەریم مەحمود)، لەپاسۆك.

*** هەندێك لەدەنگۆ و گرفتەكانی ناو كۆنگرە:**

– لەكۆنگرەدا، كاتێك كەپێشنیاری ناوی حزبی تازە كرا، سۆسیالیست، ناوی (حزبی سۆسیالیتی دیموكراتی كوردستان)ی پێشنیار كرد. (پاسۆك)یش (حزبی رزگاری كوردی)، پێشنیار كرد. هەردوو ناوەكە لەدەنگدان، دەنگی پێویستیان نەهێنا. جارێكی تر، سۆسیالیست پێشنیاری (حزبی یەكگرتنی كوردستان)ی كرد. بەزۆرینەی دەنگ، پەسەند كرا. هەروەها، سۆسیالیست، وشەی (حزب)ی لەجیاتی (پارت)، دانابوو، ئەوەش بەدەنگدان، یەكلابۆوە.

– دوای ئەوەی كەفەرزی دەنگەكان كرا و یەكلا بۆوە كەكێ دەرچووە و كێ دەرنەچووە، یان دەنگی پێویستی نەهێناوە، چەند ئەندامێكی كۆنگرە (سەر بەحزبی سۆسیالیست)، هەستانە سەر مینبەر و لەمایكرۆفۆنەوە گوتیان: (ئێمە بڕوامان بەم كۆنگرەیە نییە، چونكە ئەو داوایانەی كەئێمە لەپلینۆمی حزب لەسلێمانی جێگیرمان كردبوو، جێ بەجێ نەكرا و پێشێل كرا). ئەوانە: رێبوار عەبدولڕەحمان و موحسین بایز و مامۆستا كاوە و... تاد)، بوون. هەندێك لەوانە، خۆیان بۆ سەركردایەتی حزبی تازە، پالاوتبوو، بەلام دەرنەچووبوون. لەبەرامبەر ئەوانەدا، محەمەدی حاجی مەحمود، كەیەكەم دەنگی هێنابوو، رەدی داناوە. هەروەها، (رەسوڵ مامەند)ی سكرتێری حزب، بەپلەی شەشەم، دەنگێكی كەمی هێنابوو، لەدوای لێپرسراوی لقەكان: (سلێمانی، هەولێر، دهۆك) بوو. ناوبراو، لەوەلامی دەنگی نارازی كادیرەكان، وتەیەكی پێشكەش كرد و گوتی: (من ئامادەمە لەناو حزبی تازە، یەكگرتن، وەك پێشمەرگەیەك بمێنمەوە، بەلام هیوادارم كارێكی وا بكەین، هیچ هەڤاڵێكمان جیا نەبێتەوە). هەروەها لەدوا وتاری كۆنگرەدا، گوتوویەتی: (پیرۆزبایی لەبەشداربوانی كۆنگرە و هەموو شەهیدانی هەرسێ حزبەكە دەكەم... دەبێ لەمەودوا، ململانێ و خیلافات ببێتە شەرم و عار، جارێكی تر لەناو بزوتنەوەی ئازادیخوازی كورد دووبارە نەبێتەوە... رایدەگەیەنم وەك پێشمەرگەیەك، هەتا ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی حزب كادیرێكی یەكگرتن بم و بۆ سەركەوتن و پێش خستنی بەجدی تێبكۆشم)[٤١٠].

– لەسەر ئاستی پالێوراوەكانی هەرسێ حزب، ملازم شوان و ملازم كەریم،

بەپلەی یەکەم و دووەم و، محەمەدی حاجی مەحمود بەپلەی سێیەم و، قادر جەباری بەپلەی چوارەم و، سەعد عەبدوڵڵا بەپلەی پێنجەم و، د. مەحمود عوسمان بەپلەی شەشەم و، سامی عەبدولڕەحمان (بەفرۆفێڵ و دەنگ گۆڕین و تەزویر)[٤١١]، بەپلەی حەوتەم و، عومەر بۆتانی بەپلەی هەشتەم و، ڕەسوڵ مامەند بەپلەی نۆیەم، دەرچوون.

دەنگۆی ئەوە هەبوو کەپێش کۆنگرە، سامی و مامۆستا سەعد و برادەرانی پاسۆك لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کەدەنگ بەیەکتر بدەن، بەڵام پاسۆك فێڵی لەهەردوو لایان کردبوو. کڵاوی لەسەر نابوون. ڕێنوێنی ئەندامەکانی خۆیان کردبوو، پێیان گوتبوون، هەتا پێتان دەکرێ، تەنها دەنگ بەپاڵێوراوەکانی خۆمان بدەن. دەیانگوت: لێپرسراوەکانی لقەکانی حزبی سۆسیالیست، بەتایبەتی هەولێر و سلێمانی، (ڕەسوڵ مامەند)یان فەرامۆش کردووە و دەنگی پێویستیان بۆ کۆنەکردۆتەوە. لەناو سۆسیالیستەکان، قسە هەبوو، دەیانگوت: مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا، بەنهێنی ڕێکەوتنی لەگەڵ پاسۆك و گەل کردبوو، گوتبووی: (ئێوە دەنگ مەدەنە ڕەسوڵ مامەند). لەبەر ئەوە بووە ڕەسوڵ مامەند، دەنگی کەمی هێناوە.

دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامی دەنگدان، ڕەسوڵ مامەند تووشی دڵەڕاوکێ و ئیحراجییەکی زۆر ببوو، بەڵام بەئاشکرا، بەسەرخۆی نەدەهێنا.

- کەکۆنگرە تەواو بوو، لەڕۆژی ١٩٩٢/٨/٢٧دا، چەند کادیرێك لەسەر ئاستی ئەندام و کارگێڕی لق، لەوانە: (بەهرۆز گەلاڵی، مامۆستا کاوە، ڕێبوار عەبدولڕەحمان، موحسین بایز، محەمەد فاتح، دارا، سمکۆ ئەنوەر، جەرجیس حەسەن،... تاد)، ناڕازی بوون و ئەنجامەکانی کۆنگرەیان قبوڵ نەدەکرد. دەیانگوت: دەبێت ڕەسوڵ مامەند سەرۆکی ئەم حزبە تازەیە (یەکگرتن) بێت، دەنا ئێمە ڕازی نابین.
- دەیانگوت: پاش تەواو بوونی کۆنگرە، شێروان شێروەندی، لەگەڵ مامۆستا سەعد بۆتە دەمەقاڵێیان و، شێروان جوێنی بەمامۆستا سەعد داوە و، دەمانچەشی لێ هەڵکێشاوە. هەروەها، حیمایەکانی ڕەسوڵ مامەند، بانگی مامۆستا سەعدیان کردووە و، هەڕەشەیان لێ کردووە. جوێنیش بەقادر

جەباری، دراوە.

- دوو رۆژ دوای تەواو بوونی کۆنگرە، کاتـژمێر حـەوتی ئێـوارەی رۆژی ٨/٢٩، مامۆستا سەعد کۆبوونەوەیەکی بەئەندامانی ناوچەی شـار و دەرەوەی شـار، لەبارەگای لقی هەولێری حزب رێکخست، کەچەند کـارگێرێکی لقـی هـەولێر، وەك: (مامۆستا کاوە، د. پەروەر، جەرجیس)، ئامادەی ببوون.

پاش تەواو بوونی ئەم کۆبوونەوەیە، کۆبوونەوەیەکی فراوانتری لەهەمان رۆژ لەگـەڵ ئەنـدامانی حـزب کـرد. بەنـدە (ئیـسماعیل)، وەك بەشـداربوویەك لـەم کۆبوونەوەیەدا بووم. سەرنج و تێبینییەکانم یاداشت دەکرد. لەبەرامبـەر گلـەیی و گازاندەی ئامادەبووان، مامۆستا سـەعد گـوتی: (... راسـتە ئێمـە لەسلێمانی لەپلینۆمدا لەسەر چەند بنچینەیەك بڕیارمان وەرگرت، بەڵام دوای پلینۆم، کـاك رەسـوڵ و محەمـەدی حـاجی مـەحمود و نیزامـەدین مەجیـد گلـی، لەگـەڵ سـەرکردایەتی پاسـۆك و گـەل ئـەم بڕیـار و راسـپاردانەی پلینۆمیـان هەڵوەشاندبۆوە... بۆ ناوی حزبی تـازە، بەدەنگدانی ئەنـدامانی کـۆنگرە رازی ببوون... لەبەر ئەوە، هیچ تاوانێکی ئێمە نییە و خۆیان وایان بڕیار دابوو...).

- رێکار ئەحمەد دەنووسێت: (لەسۆسیالیست، خاڵە حاجی و عـەدنان مـوفتی، بـەجێگر (یـەدەگ)، هەڵبـژێردران)[٤١٢]. بـەڵام لەراسـتیدا، بـەپێی ژمـارەی دەنگـەکان، یەدەگـەکانی سۆسیالیـست، شـێخ محەمـەد شـاکەلی و شـێروان شـێروەندی بـوون، چـونکە عـەدنان مـوفتی بەپلـەی یـازدەم و خاڵـە حـاجی بەپلـەی چـواردەم دەهـاتن. شـێخ محەمـەد و شـێروان شـێروەندی، لـەپێش ئەوانەوە بوون. وەك لەلاپەڕەکانی پێـشووتردا، ئامـاژەمـان بـەدەنگی هـەموو پاڵێوراوەکان، کردووە.

- لـەرۆژانی کـۆنگرەدا: سـێ ژمـارەی تایبـەت بـەزمانی کـوردی و یـەك ژمـارە بـەزمانی عـەرەبی، لەرۆژنامـەی (یـەکگرتن)، دەرچـوو و، بەسـەر ئەنـدامانی کۆنگرەدا، دابەش کران.

- لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٩دا، یەکەمین کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزبـی تـازە (حزبـی یـەکگرتنی کوردسـتان)، بەسـترا. هـەروەها لـەرۆژی ١٩٩٢/٨/٣٠دا، حزبی یەکگرتن، سیستەمی سەرۆکایەتی بەکۆمەڵی پەسـەند کـرد و، هەریـەك

لە: (ڕەسوڵ مامەند، سامی عەبدولڕەحمان، مەلازم شوان)، بوونە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی حزبی یەکگرتن.

- لە ١٩٩٢/٩/٨دا، کاتژمێر (٩,٣٠)، شاندێکی حزبی یەکگرتن کەلە: ڕەسوڵ مامەند، محەمەدی حاجی مەحمود، سەعد عەبدوڵڵا، مەلازم شوان، عەبدوڵڵا ئاگرین)، سەردانی بارەگای (پارتی دیموکراتی کوردستان)یان کرد. ئەم سەردانە، زیاتر بۆ گەیاندنی هەواڵی سەرکەوتنی کۆنگرە و، بەخێر هێنانەوەی مەسعود بارزانی بوو. بارزانی، لەدەرەوەی وڵات گەڕابۆوە کوردستان. پاش نیوەڕۆکەی هەمان ڕۆژ، هەمان شاند، سەردانی مەکتەبی سیاسی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)یان، کرد.
- لەبەرامبەر ئەم یەکگرتنە، هەرچەندە پارتی و یەکێتی، دڵخۆشی خۆیان نیشاندا و پیرۆزباییان لەحزبی یەکگرتن کرد، بەڵام لەراستیدا، زۆریان پێ ناخۆش بوو. بۆیە، هەر پێنج ڕۆژ دوای کۆنگرە، بەئامادەبوونی مام جەلال و مەسعود بارزانی، ڕێککەوتننامەیەکیان مۆر کرد. لەم ڕێککەوتننامەیەدا، لەسەر چەند خاڵێك ڕێك کەوتبوون، لەوانە:
- بەگەڕخستنی پەرلەمان و حکومەت.
- یەکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان.
- یەکخستنی دەزگاکانی پەیوەندییەکانی دەرەوە و ئیعلام و مالیە و هەموو دەزگاکانی تر.
- یەکخستنی هەڵوێست، بەگوتە و کردەوە، لەئیعلام و ڕەفتار و کرداردا، بەرامبەر بەپەکەکە و حزبەکانی تری کوردستان(٤١٣).
- ڕێگەنەدان بەهیچ حزب و تاقمێك لەسەرپێچی کردن لەبەرامبەر پەرلەمان و حکومەت دا و، لەیەك خستنی هێزی پێشمەرگە و گومرگ و ئیدارە و دەزگا جیاجیاکانی تردا.

ئەم ڕێککەوتننامەیە، لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی هەردوولا، بڵاوکرایەوە(٤١٤).

- لە ١٩٩٢/٩/٨، کاتژمێر نۆی شەو، ڕەسوڵ مامەند، لەبارەگای لق لەهەولێر، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کادیرە ناڕازییەکانی ناو کۆنگرە، ڕێکخست.

## ٤- جیابوونەوەی باڵی رەسوڵ مامەند و هەندێك رووداوی دوای کۆنگرەی یەکگرتن :

- رەسوڵ مامەند، وەك ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی حزبی یەکگرتنی کوردستان، بەشداری لەیەکەم کۆبوونەوەی حزب، لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٩دا، کردووە. لەدانیشتنی دووەمی کۆبوونەوەکەدا، ناوبراو بروسکەیەك بۆ (عەلی بەگ)ی ئەندامی کۆمیتەی حزب و بەشداربوویەکی کۆبوونەوەکە، دەنێرێت. لەوێدا، نووسیویەتی: (لەبەر چەند ئیلتزامێك کەلەبەرژەوەندی حزبی یەکگرتن دایە، بۆم ناکرێت، هیوادارم بۆم بەبەشداربوون حیساب بکەن. هەر بڕیارێك بدەن بەلامەوە پەسەندە و ئیلتیزامی پێوە دەکەم)[٤١٥].
- لەکۆتاییەکەی مانگی ئەیلول ١٩٩٢، پاش هەوڵدان و سەردانی کردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی یەکگرتن، بەتایبەتی سۆسیالیستەکان، بۆ رانیە، بۆ لای رەسوڵ مامەند و پەشیمان کردنەوەی، باڵی رەسوڵ مامەند بەفەرمی جیابوونەوەی خۆیان لەحزبی یەکگرتن راگەیاند و، ئیستگەکەیان لەرانیە، دووبارە بەکارخستەوە. لەئیستگەکەیاندا، زۆر بەتوندی هێرشیان دەکردە سەر ئەو ئەندام سەرکردایەتیانەی سۆسیالیست کەلەناو حزبی یەکگرتن دا، بوون. هەروەها هێرشێکی توندیشیان دەکردە سەر خودی سامی عەبدولرەحمان. ناوە ناوەش، بروسکەی خانەوادەی شەهیدەکانی حزب، نموونەی: بنەماڵەی ملازم ئەنوەری مەجید سوڵتان، عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، ملازم تاهیری عەلی والی، دەخوێندەوە کەپشتگیرییان بۆ باڵی رەسوڵ مامەند و نەچوونە ناو حزبی یەکگرتن، دەکرد.
- لە ١٩٩٢/١٠/٣، تەواو ئاشکرا بوو کەباڵی رەسوڵ مامەند ناچنە ناو یەکگرتن و هەر بەناوی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، درێژە بەخەبات دەدەن و، ئامادەکاری بۆ بەستنی کۆنگرەی دووەمی حزب دەکەن. هەر ئەم رۆژە، چەند لافیتەیەك بەناوی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، لەکۆلیژەکانی زانکۆی سەلاحەدین، بەبۆنەی سالی نوێی خوێندنەوە، هەڵواسرابوو. دەگوترا: (یەکێتی قوتابیان و لاوانی یەکگرتن)، بەتەوجیهی مامۆستا سەعد عەبدوڵلا، لێپرسراوی لقی هەولێری (حزبی یەکگرتنی کوردستان)،

لێکراوەتەوە.

- لە ١٩٩٢/١٠/٥، حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بەیان و بانگەوازێکی بۆ هەموو پێشمەرگە و کادیر و رێکخستنەکانی حزب، بڵاوکردەوە. لەوێدا هاتبوو: نابێ بەهیچ جۆرێك ئەو کەلوپەل و ئۆتۆمبیل و ئامێرانەی لاتانە، تەسلیم بەکەسی بکەن، (واتە: بەحزبی یەکگرتن). ئەوانەی لەحزبیش دەرچووینە[٤١٦]، چ زوو بێت چ درەنگ، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت.

هەروەها بەکورتی باسی (کۆنگرەی یەکگرتن)، کرابوو. لەوێدا هاتبوو (ئێمە لەسەرەتادا، لەگەڵ یەکگرتن بووین، بەڵام کەزانیمان کۆمەڵێکی هەلپەرست و پارەخۆر دەیانەوێ لەسەر حیسابی یەکگرتن خۆیان قەڵەو بکەن و، چاو بپۆشرێ لەهەڵەکانیان، ئەوا ئێمە هەڵوێستمان وەرگرت و ئامادە نەبووین بچینە ناو ئەم یەکگرتنە).

- لە ١٩٩٢/١٠/٥دا، (بەرەی کوردستانی)، کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی بەست. هەموو لایەنەکانی بەرە، ئامادە ببوون، نوێنەری حزبی یەکگرتن بریتی بوون لە (سامی عەبدولرەحمان، محەمەدی حاجی مەحمود، قادر جەباری، عەبدوڵڵا ئاگرین). (رەسوڵ مامەند و بەهرۆز گەڵاڵی)ش وەك نوێنەری سۆسیالیست، بەشداریان کردبوو. دیمەنی ئەم کۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی، لەتەلەفزیۆنیش نیشاندرا.

لەم کۆبوونەوەیەدا: سۆسیالیست (رەسوڵ مامەند و بەهرۆز گەڵاڵی)، کەوتبوونە دەمەقاڵێ لەگەڵ نوێنەرەکانی حزبی یەکگرتن. یەکگرتن گوتبوویان: حزبی سۆسیالیست هەڵوەشاوەتەوە و شەرعیەتی نەماوە، ئێمە نوێنەرایەتی ئەوان دەکەین. مەسعود بارزانی و مام جەلالیش گوتبوویان: ئەوانە- واتە: سۆسیالیست-، هەر لەبەرە بووینە و دەشمێنن... ئەوان نوێنەری راستەقینەی سۆسیالیستن. (عەلی عەبدوڵڵا)ی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، بەیەکگرتنی گوتبوو: (ئێوەی حزبی یەکگرتن، تازەن، پێویستە داواکاری پێشکەش بکەن تاوەکو مۆڵەتی کارکردنتان پێ بدرێت و لەبەرە وەربگیرێن). بێجگە لەیەکێتی و پارتی، (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)یش ئیعترافی بەرەسوڵ مامەند و بەهرۆز گەڵاڵی وەك نوێنەری سۆسیالیست، کردبوو.

پێچەوانەی ئەم بینە و بەردەیەی نێوان نوێنەری سۆسیالیست و یەکگرتن، لەکۆبوونەوەی (بەرەی کوردستانی)دا، (حزبی یەکگرتنی کوردستان)، لەرۆژی ١٠/١٠/١٩٩٢، بەیانی ژمارە (١)ی ناوخۆی بڵاوکردبۆوە و ئاراستەی کۆمیتەی پارێزگاکان و هەموو کۆمیتەی حزبی کردبوو. لەوێدا بڵاوکرابۆوە (لەرۆژی ٥/١٠/١٩٩٢دا، سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لەهاوینەهەواری سەلاحەدین، بەڕێوەچوو. لەم کۆبوونەوەیەدا رەسوڵ مامەند بەسیفەتی شەخسی بەشداری ئەم کۆبوونەوەیەی کردووە، نەك بەناوی هیچ حزبێك... هەروەها شاندێکی حزبی یەکگرتن لەرۆژی ٦/١٠/١٩٩٢ سەردانی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کردووە. ئەوان، بەیەکگرتنیان راگەیاندووە کەپشتگیری تەواوی حزبی یەکگرتن دەکەن و هەموو جۆرە جیابوونەوە و لادانێك بەراست نازانن و پشتیوانی لێ ناکەن)[٤١٧].

- یەکێتی و پارتی، رۆڵیان هەبوو لەسەرنەکەوتنی (حزبی یەکگرتن). ئەوان بەئاشکرا پشتگیریان لەیەکگرتن دەکرد و پیرۆزباییان لێ دەکردن، کەچی بەنهێنی و ژێر بەژێر هەوڵی ئەوەیان دەدا درز و لێکترازان بخەنە کۆنگرەی یەکگرتنەوە، بۆ نموونە:
- فەرەنسۆ هەریری، بەڵێنی بە (پاڵە باوانی)، ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی (حزبی یەکگرتن) دابوو گەر نەچنە ناو یەکگرتن و بەناوی (پارتی گەل)، بمێننەوە، من یارمەتیتان دەدەم[٤١٨].
- لەلایەکی ترەوە، یەکێتی و پارتی، لەکۆبوونەوەی ٥/١٠/١٩٩٢ی بەرەی کوردستانی، پشتگیریان لەبالی جیابۆوە (رەسوڵ مامەند) کردبوو، بەنوێنەری سۆسیالیستیان، لەقەڵەم دابوون.
- پێش نیوەڕۆی رۆژی ٦/١٠/١٩٩٢، رەسوڵ مامەند و کادیرە جیابووەوەکان سەردانی (مام جەلال)یان کردبوو. مام جەلال بەئەوانی گوتبوو: (ئێمە پشتگیری لەئێوە دەکەین. ئەمڕۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان هەیە. نابێ محەمەدی حاجی مەحمود بەکەیفی خۆی هەڵسوکەوت بکات... ناوبراو سەربەخۆیە، حزب لەگەڵ ئەوە نەك ئەو لەگەڵ حزب...).

هەر هەمان رۆژ، پاش نیوەڕۆکەی، (حزبی یەکگرتن)یش سەردانی (مام

جەلال)یان کردبوو. مام جەلال هەر لەسەر ئەو هەڵوێستەی خۆی کەبۆ سۆسیالیستی خستبووە روو، سوور بوو لەسەر پشتیوانی لێکردنیان... بۆیە حزبی یەکگرتن بەپەلە بەخۆکەوتن و چەند کۆبوونەوەیەکیان کرد. لەم کۆبوونەوانەدا، بڕیاریاندا وەفدێك لەسەر ئاستی مەکتەبی سیاسی بنێرنە تورکیا و ئێران، بۆ مەسەلەی پشتیوانی پەیداکردن و ئیعتراف پێکردنیان. لەرۆژی ۱۹۹۲/۱۰/۸، وەفدەکەیان بەسەرۆکایەتی سامی عەبدولڕەحمان، چوونە تورکیا.

- لەرۆژی ۱۹۹۲/۱۰/۱۵دا، ژمارە (۱)ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۲ی رۆژنامەی (یەکگرتن)، ئۆرگانی ناوەندی (حزبی یەکگرتنی کوردستان)، بەزمانی کوردی و، هەمان ژمارە بەچاپی عەرەبی، کەوتە بازاڕەوە.

لە ۱۹۹۲/۱۰/۲۷دا، یەکەمین ژمارەی رۆژنامەی (رێگای ئازادی)، ئۆرگانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، دوای پرۆسەی یەکگرتن، لەژێر زنجیرەی ژمارە (۷۷)، کەوتە بازاڕەوە. ئەم ژمارەیە، رۆژنامەنووس (غەفور مەخموری)، سەرپەرشتی چاپکردنی کردبوو.

شایانی گوتنە: هەر لەگەڵ پرۆسەی یەکگرتن لەمانگی نیسانی (۱۹۹۲)ەوە، رێگای ئازادی، وەستابوو، چیتر بەناوی (رێگای ئازادی)یەوە، دەرنەچووبوو.

## ٥- گرژی نێوان (یەکگرتن و سۆسیالیست) و هەندێك رووداوی توندوتیژی :

لەو گرژی و رووداو و توندوتیژییانەی کەلەنێوان (یەکگرتن و حزبی سۆسیالیستی کوردستان)دا، روویاندا، لەدەفتەری یاداشتنامەی رۆژانەدا، نووسیومن، هەندێکیان دەگوازمەوە نێو ئەم کتێبە.

*** یەکەم :**

شەوی ۲۰-۱۹۹۲/۱۱/۲۱، کارزان شەقڵاوەیی، لێپرسراوی ناوچەی شەقڵاوەی (حزبی یەکگرتنی کوردستان)، لەزووەوە، بەنهێنی پەیوەندی بەحزبی سۆسیالیستەوە کردبوو، بەڵام هەر لەناو (یەکگرتن) مابۆوە. شەوی ۲۰-۱۱/۲۱، مامۆستا (سەعد عەبدوڵڵا)ی بەرپرسی لقی هەولێری (حزبی

یەکگرتن)، هەست بەم پەیوەندییە نهێنییەی کارزان دەکات. کاتژمێر دووی شەو، کارزان دەچێتە ئەو بارەگایەی کەببووە (مەکتەبی سیاسی حزبی یەکگرتن)، لەشەقڵاوە. لەوێ، پێشمەرگەیەکی وەك پاسەوانی بارەگا لێدەبێت و دەریدەکات. هەندێك لەحیمایەکانی (مامۆستا سەعد)یش، لەوێ دەبن. ئەوانیش دەردەکات. مامۆستا (سەعد)یش، خودی خۆی لەماڵی مامۆستا (ئەمین قادر) دەبێت لەشەقڵاوە. حیمایەکان دەچنە لای مامۆستا سەعد و رووداوەکەی بۆ باس دەکەن. ناوبراویش، بەجیهاز، بروسکەیەك بۆ هێزی (باڵەك) دەکات و داوای هاتنی بەپەلەیان لێدەکات. هێزی باڵەك بەدەنگیەوە نایەن. مامۆستا سەعد، بەناچاری دەچێتە بارەگای داگیرکراو. لەدوورەوە، جەماعەتی کارزان دەنگی دەدەن و نایەڵن بێتە پێشەوە. مامۆستا سەعدیش پێیان دەڵێت: (دێمە ژوورەوە، دوو سێ قسەتان لەگەڵ دەکەم). ئەوان ناهێڵن... حیمایەکانی مامۆستا سەعد، بەنیازی شەڕکردن، دابەش دەبن. جەماعەتی کارزان، لەژوورەوە تەقە دەکەن. لەئەنجامدا، (تەحسین)ی حیمایەی مامۆستا سەعد، برینداردەبێت. دوای ئەمە، ئاسایشی شەقڵاوە و خەڵك و بەشێك لەپێشمەرگەکانی یەکێتی، دێنە شوێنی رووداوەکە و، تەقە لەیەکتر کردن، رادەگرن. بۆ بەیانیەکەی: لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە (یەکێتی و پارتی و شیوعی)، پێکدەهێنن. لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکەدا، مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا بەدەست درێژی کەر، لەقەڵەم دەدرێت. مەحزەری چۆنیەتی رووداوی رووداوەکە و لێکۆڵینەوەکە بۆ مەسعود بارزانی و مام جەلال، دەنێرن. ئەوانیش دەڵێن: پێویستە لەلایەن لایەنی پەیوەندیدار، لێی بکۆڵدرێتەوە. بۆیە، بڕیار دەدەن، بارەگای ناوبراو (بارەگای مەکتەبی سیاسی حزبی یەکگرتنی کوردستان لەشەقڵاوە)، بۆ ماوەیەکی کاتی، لەدەست یەکێتی بێت، تا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە تەواو دەبێت. بەم شێوەیە، مامۆستا سەعد و (کارزان)ی سۆسیالیست بەم بڕیارە، رازی دەبن. جەماعەتی یەکگرتن، دێنەوە هەولێر و (سۆسیالیست)یش دەچنە بارەگایەکی یەکێتی، تا تەواو بوونی لێکۆڵینەوەکە.

هەر ئەم شەوە، پێشمەرگەکانی (موحسین عوسمان)ی لێپرسراوی لقی هەولێری حزبی سۆسیالیستی کوردستان، بەهانای (کارزان)ەوە دەچن و

لەدوورەوە، چاودێری وەزعەکە دەکەن. پاش لێکۆڵینەوە، سەعد عەبدوڵڵا بەدەست درێژی کەر، لەقەڵەم درا[٤١٩].

رۆژێك پێش ئەم رووداوە، سەعد عەبدوڵڵا و سەید کاکە و قادر جەباری، بەواژۆی خۆیان، بروسکەیەك دەدەنە (کارزان)، تاوەکو بەجیهاز بۆ (دکتۆر مەحمود عوسمان)ی بنێرێت. کارزان بروسکەکە نانێرێت و وەك بەڵگەنامەیەك لای خۆی گلی دەداتەوە. ناوەرۆکی بروسکەکە بەم شێوەیە بوو: (کاك دکتۆر، هیواداریـن بەزووترین کات بێیتەوە، ئەگەر بۆ ماوەی مانگێکیش بێت، دەنا وەزعی یەکگرتن خراپە و لەوانەیە هەڵبوەشێتەوە).

*** دووەم:**

شەوی ٢٢-٢٣/١١/١٩٩٢، رۆژێك دوای رووداوەکەی شەقڵاوە، تەلەفزیۆنی یەکگرتن باسی رووداوەکەی کرد و گوتی: (.... جەماعەتێکی دۆڕاو... دار و دەستەی رژێم، هێرشیان کردۆتە سەر بارەگاکانی حزبی یەکگرتن لەهەولێر و سەلاحەدین و شەقڵاوە کەبۆتە هۆی بریندار بوونی پێشمەرگەیەکی حزبی یەکگرتن). هەروەها گوتی: (... ئێمە لەحزبی یەکگرتن هەردەم حەز لەبرایەتی و ئاشتی و یەکگرتن دەکەین... بۆیە بەرەنجامی ئەم دەست درێژیەمان ئاگادارکردنەوەی هەموو حزب و لایەن و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو...).

هەر ئەم رۆژە، بەیانێك دەربارەی رووداوەکە بەناونیشانی (روونکردنەوەیەك) لەمەکتەبی سیاسی حزبی یەکگرتن، دەرچوو بوو. بەیانەکە، سێ جار لەتەلەفزیۆنی یەکگرتن، خوێندرایەوە. لەکاتی خوێندنەوەدا، چەند کۆترێکی نیشان دەدا کەبەئاسمانەوە، وەك سیمبوڵی ئاشتی خوازی، دەفڕین. هیمداد حوسێن (د. هیمداد)، ئەوکاتە، وەك بێژەرێك لەتەلەفزیۆنی یەکگرتن کاری دەکرد، ئەو، بەیانەکەی دەخوێندەوە. رۆژێك دواتر، لەگازینۆی مەچکۆ، هیمداد گوتی: (... بەیانەکە بەدەست و خەتی مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا، نووسرابوو. داوای لەعەبدوڵڵا ئاگرین، بەرپرسی راگەیاندن کردبوو، کەدوو سێ جار، لەتەلەفزیۆن، بخوێندرێتەوە).

شایانی گوتنه: هەر لەکاتی کەبروسکەیەك بۆ د. مەحمود عوسمان دەنووسن و داوای گەڕانــەوەی بەپەلــەی لێدەکــەن، ئاگادارییــەکیش بــۆ هــەموو هێــز و پێشمەرگەکانی حزبی یـەکگرتن، دەنێـرن. لەئاگادارینامەکـەدا هـاتبوو: (سمکـۆ مەنتك، بیست هەزار دیناری لەرژێم وەرگرتووە و پیاوی رژێمە، تی ئێن تیەکەی کەلەدارەتوو تەقیەوە، هەر دەستی ئەوی تێدا بووە... بۆیە تکایە ئاگاداری ئەم پیاوە بن....).

ئەوکاتــە، سمکـۆ مــەنتك لەگــەڵ بـاڵی رەسـوڵ مامەنـد بـوو، پێـشمەرگە و فەرماندەیـەکی عەسـکەری چـاڵاك و مانـدووی حزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان بوو. دواتر، پەیوەندی بەریزەکانی (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان)ەوە کـرد و، لەدرێژەی شەڕەکانی ناوخۆی یەکێتی و پارتی، شەهید بوو.

## ٦- کۆنگرەی دووەمی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان):

رۆژی چوارشەممە، رێکەوتی ١٩٩٢/١١/٤، کاتژمێر (١٠,٣٠)ی سـەرلەبەیانی، لەهۆڵی بنکەی لاوان لەرانیە، بەئامادەبوونی نوێنەری زۆربەی حزب و رێکخراوە سیاســییەکانی کوردســـتان، دووەمــین کــۆنگرەی (حزبــی سۆسیالیــستی کوردســتان)، بەسـترا. هـۆڵی کـۆنگرە، بەوێنەیـەکی سـاڵح یوسـفی و چـەند ســەرکردە و کــادیر و پێــشمەرگەیەکی شــەهیدی حــزب، رازێنــدرابۆوە. لەدروشمەکانی کۆنگرەی دووەمی حزب:

- کــۆنگرەی دووەمـــی حزبـــی سۆسیالیـــستی کوردســـتان، کــۆنگرەی بەخۆداچوونەوە و خۆ رێکخستنەوە لـەپێناوی یـەکگرتنی راسـتەقینە لەسـەر رێبازی دیموکراتی و سۆسیالیستی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی.
- کۆنگرەی دووەمی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، کۆنگرەی وەفادارییە بـۆ رێبازی سەیدای رێبەر و خوێنی شەهیدە نەمرەکانمان.
- بزوتنەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردسـتان فەرهـەنگێکی خـەباتی پـڕ ئەزموونە لەبزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان- لەوتەکانی رەسوڵ مامەند-.

کـادیری پێـشکەوتووی حـزب (سمکـۆ ئـەنوەر)، سەرپەرشـتی کردنـەوەی کۆنگرەی دەکرد. سەرەتا دەقیقەیەك وەستان بۆ گیانی شەهیدان، پاشان ئـەم

وتار و بروسكانه، خوێندرانەوە:

١- بروسکەی مام جەلال. لەم بروسکەیەدا، مام جەلال جەختی لەسەر مێژووی (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، کردبوو. هەروەها باسی برایەتی و هاوخەباتی و هاوڕێبازی- سۆسیال دیموکرات-ی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حزبی سۆسیالیستی کوردستان)ی کردبوو. ئومێدخواز بوو، لەدوارۆژێکی نزیکدا، یەك بگرنەوە.

٢- وتاری مەکتەبی سیاسی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، لەلایەن (قادری حاجی عەلی)یەوە، خوێندرایەوە.

٣- وتاری حزبی شیوعی عێراق، لەلایەن (جەلال دەباغ)ەوە، خوێندرایەوە.

٤- بروسکەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران- ڕێبەرایەتی شۆرشگێڕ.

٥- وتاری مەکتەبی سیاسی (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)، لەلایەن (د. سەردار)ەوە، خوێندرایەوە.

ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامان بوو، (پارتی دیموکراتی کوردستان- عێراق)، نوێنەریان لەوێ نەبوو. بەبروسکەش بەشداریان نەکردبوو. هەر لەوێ هەست دەکرا، پارتی حەز بەزیندوو کردنەوەی حزب ناکات.

دوای وتاری میوانەکان و خوێندنەوەی بروسکەکان، (رەسوڵ مامەند)، راپۆرتی سیاسی خوێندەوە، کەیەك کاتژمێری خایاند. راپۆرتەکە لەسەر دروستبوونی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و مێژووی خەبات و قوربانیدان و هەوڵی یەکگرتن و سەرنەکەوتنی کۆنگرەی یەکگرتن و بەستنی کۆنگرەی دووەمی حزب بوو. سکرتێری حزب، لەراپۆرتەکەیدا گوتی: (... پێویستە کۆنگرەکەمان بۆ هەڵسەنگاندنی مەسەلەی یەکگرتن و سوود وەرگرتن لەهەموو کەموکوڕییەکانی پێشوو هەوڵ بدات بۆ بەدیهێنانی یەکگرتنی فراوانتر لەسەر ئەساسی فیکری و بیروباوەڕی راستگۆیی و قەناعەتی مەبدەئی و یەکگرتنی ئەوتۆ کەگۆڕان و تەئسیری ئیجابی هەبێت بۆ خەباتەکەمان و کێشەی گەلەکەمان)[٤٢٠].

* دانیشتنی یەکەم، لەکاتژمێر (١٢,١٠)ی نیوەڕۆ، کۆتایی پێهات.

* دانیشتنی دووەم، ١٩٩٢/١١/٤، لەکاتژمێری (٤,٣٠)ی پاش نیوەڕۆ،

لەبارەگای حزب، لەچوارقوڕنە، دەستی بەکارەکانی کرد و لەنۆی شەو تـەواو بوو.

سـەرەتا، پـەیڕەوی نـاوخۆ خوێندرایـەوە. بەزۆرینـەی دەنـگ، نـاوی حـزب هەروەکو خۆی (حزبی سۆسیالیـستی کوردسـتان– عێـراق)، مایـەوە. بڕیـاردرا، یـازدە ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی و پێـنج ئەنـدامی یـەدەگ، هەڵبـژێردرێن. هەروەها بڕیار لەسەر ئەوە درا کە: کۆمیتەی سەرکردایەتی مـافی ئـەوەی هەیـە لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەنـدامی کۆمیتـە بکـات و دووری بخاتـەوە. بڕیـاریش درا، مەکتەبی سیاسی لەسکرتێر و چوار ئەندام پێك بێت.

* دانیـشتنی سـێیەم، ١٩٩٢/١١/٥ پێـنج شـەممە. لەکاتـژمێر (٨,٣٠)ی بـەیانی دەستی پێکرد و لەدوازدەی نیوەڕۆ تەواو بوو. بەدوور و درێژی گفتوگۆی چڕ لەسەر پەیڕەوی ناوخۆ قسە کرا و بەدەنگدان بڕیاری لەسەر درا.
* دانیـشتنی چـوارەم، ١٩٩٢/١١/٥ پێـنج شـەممە. لەکاتـژمێر (٢,٣٠)ی پـاش نیوەڕۆ دەستی پێکـرد و لـە (٧,٣٠)ی ئێـوارە تـەواو بـوو. لـەم دانیـشتنەدا، گفتوگۆ لەسەر پرۆژەی مەکتەبی عەسـکەری و پـرۆژەی یـەکگرتنی داهـاتوو، کرا. (رەسوڵ مامەند)، زۆر پێی لەسەر یەکگرتن دادەگرت و دەیگوت: ئـەمڕۆ سـەردەمی یەکگرتنــە، بەتایبــەتیش لــەنێوان ئــەم حزبانــەی کــەرێبازیان لەیـەکترەوە نزیکـە... سـەردەمی پارچـە پارچـە بـوون و حزبـی بـچووك، نـەماوە... لەوتارەکـەی نـاوبراودا، بیـانووی ئـەوە هێنرابـۆوە کـە: نـەبوونی نوێنـەری سۆسیالیـست لەپەرلـەمان و ئەنجوومـەنی وەزیـران و جومگـەکانی حکومەت و شوێنی تر و بێ ئیمکانیەتی دارایی حـزب، دەبێـت هانمـان بـدات لەگەڵ ئەو حزب و لایەنانە یەکبگرین کەلەسۆسیالیستەوە، نزیکن. وتارەکەی نـاوبراو، زێـتر بـەلای یـەکگرتن لەگـەڵ (یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان)دا، دەشکایەوە. هەروەها دەیگوت: (... کەئەم قسانە دەکەم، کەس پێشنیاری یەکگرتنی لەگەڵ نەکردووین، بەڵام ئەگەر لەداهاتوودا پرۆژەی وا هاتە پێش، حــەز دەکــەین، رای ئێــوەی ئەنــدامانی کــۆنگرە بــزانین، تــا کۆمیتــەی سەرکردایەتی، جارێکی تر، بـەبێ گەڕانـەوە بـۆ را وەگرتنـی ئێـوە، پـرۆژەی یەکگرتن لەگەڵ حزب و لایەنی تر، ئەنجام بدات...).

بەشی هەرە زۆری ئەندامانی کۆنگرە، رایان لەسەر ئەوە بوو (جارێ با ئێمە حزب رێك بخەینەوە و بەهێز ببینەوە، ئەگەر لەبەرژەوەندیمان دابوو، ئینجا بڕیار لەسەر یەکگرتن، بدەین). شەو پاش تەواو بوونی دانیشتنی چوارەم، نوێنەرانی کۆنگرە، دوو دوو و سێ سێ، گروپ گروپ، باسی مەسەلەی یەکگرتن و قسەکانی (رەسوڵ مامەند)یان، دەکرد. زۆربەیان رایان لەسەر ئەم جۆرە یەکگرتنە، نەبوو. دەنگۆی ناڕازی بوونی ئەندامان گەیشتبۆوە رەسوڵ مامەند و شێخ محەمەد شاکەلی.

* دانیشتنی پێنجەم، ١٩٩٢/١١/٦، هەینی: کە، (رەسوڵ مامەند) زانی بەم شێوەیەی ئەو دەیەوێت و باسی کردبوو، نوێنەرانی کۆنگرە، رازی نین، خۆیی و محەمەد شاکەلی، هاتنە سەر مینبەری کۆنگرە و گوتیان: (... ئێوە بەهەڵە لەقسەکانی ئێمە گەیشتوون. ئێمە، باسی یەکگرتن لەئێستادا ناکەین، بەڵکو دەڵێین: ئەگەر لەداهاتوو پڕۆژەی وا هاتە پێش و لەبەرژەوەندیماندا بوو، ئێمە ئامادە دەبین بۆ یەکگرتن). دوای ئەوە، گفتوگۆ لەسەر راپۆرتی سیاسی و بڕیار و راسپاردەکان، کرا. ئەم دانیشتنە لەکاتژمێر (٨,٣٠) دەستی پێکرد و، لەیەکی پاش نیوەڕۆ، کۆتایی پێهات.

* دانیشتنی شەشەم، ١٩٩٢/١١/٦، هەینی: لەکاتژمێر (٢,٤٥)ی پاش نیوەڕۆ دەستی پێکرد و لە (١١)ی شەو، کۆتایی پێهات. لەم دانیشتنەدا، دەست بەهەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی کرا. بەتێکڕای دەنگی ئەندامانی کۆنگرە و بێ هەڵبژاردن، (رەسوڵ مامەند) بەسکرتێری حزب و، (محەمەد شاکەلی، شێروان شێروەندی)، بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، هەڵبژێردران. ئەوانیش سوپاسی ئەندامانی کۆنگرەیان کرد. دوای ئەوە، وتاری بنەماڵەی شەهید دکتۆر عەزیز و چەند پارچە شیعرێك لەلایەن (عەبدوڵڵا)ی برای شەهید مام ئاراس و حەمە جاف و شادمان مەلا حەسەنەوە، خوێندرایەوە. ئینجا دەرگای خۆ کاندید کردن، بۆ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کرایەوە. ئەم ئەندامانە، خۆیان کاندید کرد:

١- عەبدولکەریم حەسەن: ناسراو بەمامۆستا عەبدولکەریم، لیژنەی کەرکوك، لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٦، ئاستی خوێندن: سێی ناوەندی.

٢- شێخ محەمەد شێخ عـزەدین: لیژنـەی کـەرکوك، ئاسـتی خوێنـدن: خوێندەوارە.
٣- سەید ساڵح: لیژنەی کەرکوك، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٢.
٤- ئەحمەد قەدەفەری: لیژنەی سلێمانی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٩.
٥- عەبدولکـەریم تۆفیـق: لیژنـەی سـلێمانی، ئاسـتی خوێنـدن: مامۆسـتای سەرەتایی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٠.
٦- جـەلال عەینـەك: لیژنـەی سـلێمانی، دەرچـووی ئامـادەیی پیـشەسازی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٠.
٧- جەودەت محەمەد ساڵح: لیژنەی هەولێر، ئامادەیی تەواو نەکردووە.
٨- ڕێبوار عەبدولڕەحمان: لیژنەی هـەولێر، دەرچـووی کۆلیـژی بـەڕێوەبردن و ئابووری.
٩- محەمەد فاتح: لیژنەی هەولێر، مامۆستای سەرەتایی، لەدایکبووی ١٩٤٦.
١٠- جەرجیس حەسەن: لیژنەی هەولێر، لەدایکبووی ١٩٥٣.
١١- عوبێـد مەجیـد سـاڵح: لیژنـەی هـەولێر، لـەدایکبووی ١٩٥٦، دەرچـووی ئامادەیی.
١٢- موحسن عوسمان: لیژنەی هەولێر، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٥.
١٣- مامۆستا عەبدولکەریم (حەسەن عوسمان): بەڕێوەبەری ئێستگە.
١٤- بەهرۆز گەلاڵی[٤٢١]: لیژنەی ئەوروپا، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٠، ئەندازیار.
١٥- عەلی ئەحمەد وەیسی: لیژنەی دهۆك، مامۆستا، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٤.
١٦- موحسین بایز: لیژنەی ڕاپەڕین، دەرچووی قۆناغی ناوەندی.
١٧- حەمەسوور: لیژنەی ڕاپەڕین، لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٢.
١٨- بەکر فەتاح: مامۆستا، لەدایکبووی ١٩٦٢.
١٩- کـاوە محەمـەد ئـەمین (مامۆسـتا کـاوە)[٤٢٢]: لیژنـەی هـەولێر، دەرچـووی ئامادەیی کشتوکاڵ، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٦.
٢٠- سمکۆ ئەنوەر: لیژنەی هـەولێر، لـەدایکبووی ١٩٥٧، دەرچـووی ئامـادەیی کشتوکاڵ.

دوای تەواو بوونی پرۆسەی دەنگدان و لەیەکتر هاوێرکردنی دەنگەکان، ئەم کاندیدانە بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دەرچوون:

١- عەلی ئەحمەد وەیسی: ٣١٤ دەنگ.

٢- بەهرۆز گەلاڵی: ٢٩٦ دەنگ.

٣- ئەحمەد قەدەفەری: ٢٨٤ دەنگ.

٤- ڕێبوار عەبدولڕەحمان: ٢٦١ دەنگ.

٥- جەلال عەینەك: ٢٥٤ دەنگ.

٦- محەمەد فاتح: ٢١٤ دەنگ.

٧- موحسین بایز: ٢١١ دەنگ.

٨- موحسین عوسمان: ٢٠٣ دەنگ.

ئەم کاندیدانەش بوونە ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی:

١- عەبدوڵلا تۆفیق: ١٨٦ دەنگ.

٢- عەبدولکەریم حەسەن: ١٨٤ دەنگ.

٣- سمکۆ ئەنوەر: ١٥٤ دەنگ.

٤- حەمەسوور: ١٥١ دەنگ.

٥- کاوە محەمەد ئەمین: ١٤٨ دەنگ.

ئەم کاندیدانەش بەهۆی نەهێنانی دەنگی پێویست نەیانتوانی بگەنە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (کارا، یەدەگ):

١- شێخ محەمەد شێخ عزەدین: ١٢٠ دەنگ.

٢- حەسەن عوسمان (مامۆستا عەبدولکەریم): ١٠٨ دەنگ.

٣- جەودەت محەمەد ساڵح: ٩٦ دەنگ.

٤- سەید ساڵح ٥٨ دەنگ.

٥- جەرجیس حەسەن: ٢٦ دەنگ.

٦- عوبێد مەجید ساڵح: ١٧ دەنگ.

٧- بەکر فەتاح: ١٠ دەنگ.

ئەمەو سەرلەبەیانی ڕۆژی شەممە، ١١/٧، ڕەسوڵ مامەند، سوپاسی

ئەندامانی کۆنگرەی کرد و پیرۆزباییشی لەدەرچووەکان کرد. دوایی، ئیش و کارەکانیان بەم شێوەیە دابەش کرد:

١- موحسین عوسمان: لێپرسراوی لقی هەولێر.

٢- ئەحمەد عەلی وەیسی: لێپرسراوی لقی دهۆك.

٣- ئەحمەد قەدەفەری: لێپرسراوی لقی سلێمانی.

٤- عەبدولکەریم حەسەن: لێپرسراوی لقی کەرکوك و خانەقین.

٥- رێبوار عەبدولڕەحمان: لێپرسراوی راگەیاندن.

٦- شێخ محەمەد شاکەلی و شێروان شێروەندی: ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

شایانی گوتنە کە: لەدووەم رۆژی کۆنگرە، بەهرۆز گەلاڵی، بەنیازی کۆمەك و یارمەتی پەیداکردن بۆ بەرێوەچوونی کۆنگرە، چووە هەولێر و چاوی بەسەرۆکی حکومەت (د. فوئاد مەعسوم) کەوتبوو، یارمەتی و کۆمەکی لەناوبراو وەرگرتبوو. پاش نیوەڕۆ گەڕایەوە چوارقوڕنە و دووبارە بەشداری لەکۆنگرە، کردەوە.

رێککەوتێکی تریش، لەو هەشت کەسەی کەبەدەنگدان بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، سێ کەسیان ناویان (موحسین) بوو. موحسین عوسمان، موحسین بایز، موحسین عەبدولڕەحمان ناسراو بەرێبوار.

بەم شێوەیە، بەئامادەبوونی (٣٨٨) نوێنەر، پاش گفتوگۆکردنی بیست و هەشت کاتژمێر و دە خولەك، کۆنگرەی دووەمی حزب، کۆتایی هات.

لە ١٩٩٢/١١/٨یشدا، بەلاغی کۆتایی کۆنگرەی دووەم، بڵاو کرایەوە.

## ٧- یەکگرتنی حزبی سۆسیالیستی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان:

دوای ئەوەی کۆنگرەی دووەمی حزب تەواو بوو، لقەکان دامەزران، بەڵام هیچ چالاکیەکی ئەوتۆ نەبوو... دەزگای راگەیاندن، جگە لەئیستگە و، بڵاوکردنەوەی یەك ژمارەی (رێگای ئازادی)، هیچ چالاکییەکی تری نەبوو... لەهەموو لایەکەوە، فشاری لەسەر بوو. لەیەکێتی و پارتی لەلایەك و، (حزبی یەکگرتن)یش، لەلایەکی ترەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، گەرمەی

دابەشـــکردنی پلـــە و پۆســـتی حکــومی بـــوو.. لێپرســـراوەکان و کـــادیر و فەرماندەکانی هەردوو حزبی براوەی هەڵبژاردن، پۆستی حکومی وەك: (وەزیـر، ئەندام پەرلەمان، بەڕێوەبەری گشتی، راوێژکار، دامەزراندنی بەکۆمەڵ، پلەکانی عەســکەری...تــاد)یــان، وەردەگــرت... کەچــی کــادیران و لێپرســراوانی سۆسیالیست، لـەدوورەوە، سـەیری ئـەم هـەموو ئیمتیـازات و بەخـشینەوەیان، دەکرد. ئەگەر مەسـەلە، خـەباتی شـاخ و قوربانیـدان بێـت، ئـەوا سۆسیالیـست لەوانی کەمتر نەکردبوو، ئەگەر زیاتریشی نەکردبێت... بەڵام ململانێی حزبایەتی و دەرکردنــی هاوڕێیــان و هاوســەنگەرانی شــاخ، لەبازنــەی پۆســت و ئیمتیــازات بەخــشینەوە، بەشــێك لەســەرکردە و کــادیر و فەرمانــدەکانی سۆسیالیــستی نائومێد کردبوو. ئەوان، بیریان دەکردەوە، بـەحزبێکی یـەکگرتوو و بـەهێزەوە، نەیانتوانی لەهەڵبژاردن، سەرکەوتوو بن، پاش ئەم پارچە پارچە بوون و فشارە زۆرەی سەریان، چۆن دەتوانن جارێکی تر و لەهەڵبـژاردنێکی تـردا، سـەرکەوتن بەدەست بهێنن؟!

ئەو سەرکردە و کادیرانەی سۆسیالیست، کەچاویان لەپۆسـت و پلـە و پایـە بوو، بەنائومێدییەوە، لەناو سۆسیالیست، مابوونەوە. فشارێکی زۆریان بۆ سەر سەرکردایەتی دەهێنا تاوەکو لەم دۆخە دەربـاز بـبن و لەگـەڵ حزبێکـی گـەورە یــەکبگرن و پۆســت و پلــە و پایــە، بەدەســت بێــنن. (یــەکێتی نیــشتمانی کوردستان)یش، لەژێرەوە، هەوڵی دەدا، بەهـەر شـێوەیەك بێـت، سۆسیالیـست لەخۆی نزیـك بکاتـەوە[٤٢٣]. رۆژانــی کـۆنگرەی دووەم و ئامـادەبوونی نوێنـەری یەکێتی و بروسکەی تایبەتی مام جەلال و پارە وەرگـرتن لەسـەرۆکی حکومـەت د. فوئاد مەعسوم (لەسەر لیستی یەکێتی) و باسکردنی یەکگرتنی گەورە لەگەڵ یـەکێتی لەلایـەن (رەسـوڵ مامەنـد)ەوە، ئامـادە نـەبوونی پـارتی لـەکۆنگرە. ئەمانە، هەموویان نیشانەیەك بـوون کەهـەوڵ دەدرێـت سۆسیالیـست بخرێتـەوە چوارچێوەی یـەکێتی... یـەکێتیش لـەرێگای رۆژنامـەی (کوردسـتانی نـوێ)وە، وتار و بابەتی جۆر بەجۆری لەسەر یـەکگرتنی چـەپەکان لەگـەڵ یـەکێتی، بـڵاو دەکردەوە و، ئەم باسەی کردبووە باسی رۆژ و، بەهەرمێنی کردبوو.

ســەرەنجام: لــەرۆژی ١٩٩٣/٢/١٠، پرۆســەی یــەکگرتن ئەنجامــدرا و حزبــی

سۆسیالیستی کوردستان، لەناو یەکێتیدا، توایەوە. (ڕەسوڵ مامەند)، کرا بەکارگێڕی مەکتەبی سیاسی. شێخ محەمەد شاکەلی و شێروان شێروەندی بوونە ئەندامی سەرکردایەتی. (بەهرۆز گەلاڵی)ش کەلەکۆنگرەی دووەم ببووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی سۆسیالیست، لەم پۆست بەخشینەوەیە بووە ئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی یەکێتی و لەحکومەتیش، پۆستی (جێگری وەزیری ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان)ی، وەرگرت. ئەوانی تریش، لەدامودەزگاکانی حکومەت و مەڵبەندەکان و پەیوەندییەکانی دەرەوە و هێزی پێشمەرگە و کۆمیتە و ڕاگەیاندن و...تاد، جێگایان بۆ کرایەوە و پۆست و ئیمتیازاتیان، وەرگرت. ئەم پرۆسەیە، (یەکگرتن) بوو، نەك (یەکگرتنەوە). وەك هەندێك کەس بانگەشەیان بۆ دەکرد و، بڵاویان دەکردەوە، گوایا، سۆسیالیست لەشاخیش لەناو یەکێتیدا بووە و پاشان لێی جیابۆتەوە. ئێستاش گەڕاوەتەوە هەمان شوێنی خۆی. بەڵام لەراستیدا وانەبوو. چونکە:

- سۆسیالیست کەلەساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٩)، لەگەڵ یەکێتی بووە، ڕێکخراوێکی سەربەخۆ بووە. ڕێکخستن و سیاسەت و ئایدیای تایبەت بەخۆی هەبووە. ئەوکات، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بریتی بوو لەسێ ڕێکخراو، (بزوتنەوە، کۆمەڵە، هێڵی گشتی یان خەتی پان). بەهەرسێکیان نیمچە بەرەیەکیان لەژێر ناوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، پێك هێنابوو.
- ئێستا (١٩٩٣)، ئەو یەکێتییەی جاران (١٩٧٦-١٩٧٩)، نەماوە. کۆمەڵە و یەکێتی شۆڕشگێڕان، تواونەتەوە. یەکێتی، لەنیمچە بەرەیەکەوە بۆتە ڕێکخراو (حزب)ێکی یەکگرتووی سەربەخۆ.
- یەکگرتن: بەمانای ئەوە دێت کەبۆ یەکەم جار (أ) لەگەڵ (ب) یەك بگرێت. (یەکگرتنەوە)ش، بەمانای ئەوە دێت کە (أ) و (ب)، ڕۆژێك لەڕۆژان لەیەك ماڵ، چوارچێوە، شوێن، پێکەوەبووبن و دواتر لەیەکتر جیا بوونەتەوە. ئێستا، هەردوو لایان دەیانەوێت وەك جاران پێکەوە کاربکەن و یەکبگرنەوە. لەم حاڵەتەدا، (سۆسیالیست) وانەبووە. لەرابردوودا، ڕێکخراوێکی سەربەخۆ بووە بەڵام لەچوارچێوەی نیمچە بەرەی یەکێتی.

(حزبی یەکگرتنی کوردستان)یش، بەهۆی فشاری زۆری پارتی و یەکێتی و

ناتەبایی باڵەکان و چاوبڕینە پۆست و پایە، ئەوانیش نەیانتوانی بەرگە بگرن و، لەرۆژی ١٩٩٣/٧/٢٧ (پێنج مانگ و حەڤدە رۆژ، دوای چوونی سۆسیالیست بۆ ناو یەکێتی)، ئەوانیش لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکیان گرت.

کەسایەتیە دیارەکانی سۆسیالیست لەناو (حزبی یەکگرتن)دا، لەریزەکانی پارتی، کۆمەڵێك پۆست و پلەیان پێ بەخشرا. لەوانە:

- محەمەدی حاجی مەحمود، بوو بەئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی و لێپرسراوی لقەکانی سلێمانی و گەرمیانی پارتی.
- سەعد عەبدوڵڵا، بووە ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی لقی دووی پارتی لەهەولێر.
- قادر جەباری، بووە وەزیری داد و ئەندامی سەرکردایەتی پارتی.
- سەید کاکە، عومەر بۆتانی، نیزامەدین گلی، بوونە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی.
- مامۆستا ئەمین قادر بووە ئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی و لەدەزگای رێکخستن، شوێنی بۆ کرایەوە.

محەمەدی حاجی مەحمود، ئەوەندە لەناو پارتی نەمایەوە، هاتە دەرەوە. (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)ی دروست کردەوە. پارتی زۆر دژایەتی کرد، لەرۆژی ١٩٩٣/١٢/١١، کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ، لەهێرشێکی کتوپڕدا، بارەگاکانی سۆسیالیستی لەهەولێر سووتاند و دایخستن. ئەمجارەیان، یەکێتی پشتگیری لەمحەمەدی حاجی مەحمود، کرد. ناوبراو (محەمەدی حاجی مەحمود)، لەتشرینی دووەمی ١٩٩٤دا، (حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان)، دادەمەزرێنێتەوە. حکومەتی هەرێم، بۆ مۆڵەتی رەسمی وەرگرتن، ئەوەیان لەسەر فەرز کردبوو کەناتوانێت بەناوی: (حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، کاربکات. چونکە، ئەم حزبە چەندین جار هەڵوەشاوەتەوە. بۆیە وەك فێڵێکی قانوونی، وشەی (دیموکراتی)، بۆ زیاد دەکەن. رۆژنامەکەش لە (رێگای ئازادی)یەوە، دەکرێتە (رێبازی ئازادی).

لەپاش رووداوی ١٩٩٦/٨/٣١، (حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان) چۆتە سلێمانی و بۆتە لایەنگیری یەکێتی. (پارتی)ش، وەك ئەڵتەرناتیڤێك،

بەهــەمان نــاو، (حزبــی سۆسیالیــستی دیمــوکراتی کوردســتان)ی بــۆ (ســابیر فەقێیانی) ناسراو بە (سابیر لاتە)، دروست کـردووە. سـابیر لاتـە، لەسـەردەمی شاخ، فەرماندەیەکی عەسکەری بوو، لەریزەکانی حزبی سۆسیالیستدا.

دوای ئەم رووداوانە، ئەو سۆسیالیستە بەهێز و خاوەن پێگەی جاران نەما و، بووە حزبێکی مێژوویی ناو دیکۆمێنت و ئەرشیفەکان.

کۆمــەڵێك هۆکـار هــەبوون کــەوایان کـرد سۆسیالیـست پــەراوێز بخرێـت و بتوێتەوە، لەوانە:

- حزبی سۆسیالیست هەر لەسەرەتای دامەزراندنیـەوە، تـەبایی و یـەکگرتوویی لــەناو ریزەکــانی- بەتایبــەتی دامەزرێنــەر و ئەنـدامانی ســەرکردایەتی-دا، نەبووە. ئەو هاتنە پاڵ و یەکگرتنانەش، هیچیان لەسەر بنچینەی یەك فکر و ئایدیا و بۆچوونەوە، نـەبووە. ئـەوەی کـراوە، لـەژێر فـشار و پاڵەپەسـتۆی دەرەوە و بەرژەوەنــدی کەســی بــووە، وەك: یەکگرتنــەکانی (کۆمیتــەی ئامادەکردنی د. مەحمود و حەڵقەی سەقافی) سـەردەمی شـاخ و یـەکگرتنی لەگەڵ (پاسۆك و گەل)، لەدوای راپەڕین[٤٢٤].
- فــشاری زۆری یــەکێتی و پــارتی، چ لەســەردەمی خــەباتی شــاخ، چ دوای راپەڕین.
- ململانێی د. مەحمود و رەسوڵ مامەند، بەتایبەتی دوای راپەڕین.
- حزبــی سیاســی لەکوردسـتان و لـەناو کۆمـەڵگای کوردەواریـدا تـا ئێـستاش لەســــەر سیــــستەمی عەشــــیرەتگەری و دەرەبەگایــــەتی بنەماڵەییــــدا، بەرێوەدەچێت. پێویـستی بەسـەرکردەی کاریزمـا هەیـە، چـونکە رۆڵـی کـارا دەگێرێـت لەبـەهێزبوون و دەسـەڵاتی سیاسـی دا. لـەم رووەوە: پێـچەوانەی یەکێتی و پارتی، سۆسیالیست سەرکردەیەکی کاریزمایی نەبوو.
- بەرژەوەندی تایبەتی و دەست خستنی پلە و پۆستی حزبی و حکومی و خـۆ رانــەگرتن بــەژیانی دەروێــشانە، هۆکــارێکی تــری تاواندنــەوەی حزبــی سۆسیالیست بوو.
- ململانــێ و بەرپێنەدانــە یــەکتر و بوغزانــدن و پــیلان گێــڕان دژی یــەکتر، خاسیەتی ئەندامانی سەرکردایەتی سۆسیالیست بوو.

هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی سۆسیالیست، بەگوێرەی پێگەی خۆیان، ئەم مەسئولییەتە مێژووییەی تاواندنەوەی (سۆسیالیست)یان، دەکەوێتە ئەستۆ کە:

- بەپلەی یەکەم: رەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود، بەپلەی دووەم: قادر عەزیز کەلەساڵی ١٩٨٥دا باڵێکی کاریگەری جیاکردەوە، بەپلەی سێیەم: بەرپرسی لقەکان، کەدەیانتوانی رۆڵی کارا و خۆڕاگرانە بگێڕن... ئەمانە: ئەم مەسئولییەتە مێژوویی و نەتەوەیی و مۆراڵییەیان دەکەوێتە ئەستۆ.

(پاش کۆنگرەی دووەمی حزب، دەکرا بەنەفەسێکی شۆرشگێڕانەوە بەرامبەر بەفشارەکان خۆڕاگر بن، بەڵام دواتر بڕیاریاندا بچنە ناو یەکێتی، چونکە زۆربەی کادیرانی حزب پەلەیان بوو و بەتەمای پلە و مەسئولیات بوون و دەیانویست لەحزبێکی هەژار و کەم دەرامەت و کەم دۆستی دەرببچن و لەبەرهەمی رەنج و ماندووبوونی چەند ساڵەیان شتێکیان بەربکەوێت... کاك رەسوڵ وەك ئارەزووی خۆی حەزی لەمانەوە دەکرد بەڵام خزمەکانی لەگەڵ ئەوەدا بوون کەبچێتە ناو حزبێکی گەورە و خاوەن دەسەڵات و ئیمتیازات، ئەوانیش لەپەنایدا هەندێ بحەسێنەوە... ناتەبایی و فشاری ئەملا و ئەولا و ماندووبوونی سەرکردایەتی سۆسیالیست لەبەرگری کردن و چاوتێبڕینی هەندێك لەکادیران بۆ پلە و پۆست لەحکومەتی هەرێم وای کرد، کەبڕیار بدەن حزبەکە لەگۆڕ بنێن. لێپرسراویەتی ئەم لەگۆڕنانەی حزب بەپلەی یەکەم بۆ سەرکردایەتی بەپلەی دووەمیش بۆ کادیرانی پلە دووی حزب دەگەڕێتەوە)[٤٢٥].

## کرۆنۆلۆژیای بەشێك لەشەڕەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان

(حزبی سۆسیالیستی کوردستان)، هەر لەسەرەتای چوونە شاخەوە تاوەکو راپەڕین، سەدان چالاکی پێشمەرگایەتی و سیاسی و رێکخراوەیی، ئەنجامداوە. بەمەبەستی ئاشناکردنی نەوەی نوێ بەم حزبە و ریزبەندکردنی چالاکییەکان و رزگارکردنیان لەپەرش و بڵاوی، بەشێك لەم داستان و شەڕانە (زۆر بەکورتی)، دەخەینە روو، لەدامێنی هەر چالاکیەکیشدا، ئەو سەرچاوانەمان دەست نیشان کردووە کەهەواڵەکەیان لێ گواستراوەتەوە کەبریتین لەم سەرچاوانە: (سەفەری کوردایەتی– شاخەوان عەباس، ئازارەکانی شەڕی ناوخۆ– ئازاد کاکل، بیرەوەری پێشمەرگەیەك– سەید کاکە، رۆژژمێری پێشمەرگەیەك– بەرگی یەکەم و دووەم– محەمەدی حاجی مەحمود، ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتمانی کوردستان، رۆژنامەی رێگای ئازادی، رۆژنامەی بەهدینان).

بەشێك لەشەڕەکان، شەڕی ناوخۆن (نێوانی یەکێتی و سۆسیالیست). حەزمان نەدەکرد ئەم رووداو و شەڕە ناوخۆییانە بخەینەڕوو، بەڵام چی بکەین، ئەمە بۆتە بەشێك لەمێژووی خەباتی ئەم حزبە، ئەمڕۆش باسی نەکەین، هەر دەبێت سبەینێ باسی بکەین.

- تشرینی یەکەمی ١٩٧٦: مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لەشاخی کۆڕەك لەسەربازگەیەك دەدەن و شەش سەرباز دەکوژن. سەید کاکە، ل١١٩.
- تشرینی یەکەمی ١٩٧٦: مەفرەزەیەك لەنزیك گوندی (خەتێ)ی ناوچەی خۆشناوەتی، کەمینێك بۆ سوپای رژێم دادەنێن، ١٦ سەرباز و ئەفسەر دەکوژن و چەکەکانیان دەهێنن. سەید کاکە، ل١٢٠.
- تشرینی یەکەمی ١٩٧٦: مەفرەزەیەکی پێشمەرگە چوونە ناو ناحیەی هەریر و سێ سەد سەر مەڕی سەر بەوەزارەتی کشتوکاڵیان هێنا. لەرێگادا تووشی کاروانێکی سەربازی رژێم دەبن و دەکەونە شەڕەوە. شەڕەکە شەش سەعات درێژە دەکێشێت، لەئەنجامدا، (١٠) سەرباز دەکوژرێت. ئەم سێ شەڕەی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦، بەفەرماندەیی (مەغدید بناوی) و (سەلیم کێشکەیی) و (سمایل) و (حەمەدە بۆری مەلەکان) بووە. سەید کاکە، ل١١٩.

- ١٩٧٧/١/٤: مەفرەزەیەك بەفەرماندەیی سەعدی عەزیز، ناسراو بە (سەعدی گچکە)، لەسەر جادەی نێوان (بەستۆرە و مەلا ئۆمەر)ی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر، کەمینێك دادەنێنەوە. بەڕێوەبەری ئەمنی پیرمام (سەلاحەدین)، دەکەوێتە کەمینەکەوە. خۆیی و حیمایەکانی دەکوژرێن. لەم چالاکییەدا، سەعدی، خۆیشی بریندار دەبێت.
- ١٩٧٧/٤/٥: مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لەگوندی (چیوە)ی ناوچەی خۆشناوەتی، لەلایەن سوپاوە گەمارۆ دەدرێن. شەڕ گەرم دەبێت، مەفرەزەکە بەسەلامەتی رزگاریان دەبێت. سەید کاکە، ل١٢٣.
- ١٩٧٧/١٠/٢٥: هێزێکی زۆری رژێم بەپاڵپشتی هەلیکۆپتەر، هێرشیان کردە سەر چیای (هەورێ)، لەگەڵ پێشمەرگەکان رووبەڕوو بوونەوە. هێزەکەی پێشمەرگە بەفەرماندەیی، سەعدی گچکە و سەید کاکە و مەفرەزەیەکی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)، بەفەرماندەیی (مەلا بەختیار) بوو. لەم شەڕەدا، یەك پێشمەرگە بریندار بوو. ئینسکلۆپیدیا، ل٣٢٢.
- ١٩٧٧/١٠/٢٩: جارێکی تر، رژێم هێرشی کردەوە سەر چیای (هەورێ) و شەڕێکی قورس

لەنێوان پێشمەرگە و سوپا روویدا. لەئەنجامدا، پەنجا سەرباز کوژران و پێنج هەلیکۆپتەریش پێکران. یەك پێشمەرگەش بەناوی (مەلای حاجی رەسوڵ)، شەهید بوو. شەهید مەلا، خەڵکی گوندی (کەرزۆڕ)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە بوو، یەکێك بوو لەپێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان و فەرماندەی کەرتی دووی بزوتنەوە بوو.
- ١٩٧٧/١١/١٠: هێزێکی رژێم لەسوپا و جاش، چواردەوری گوندی (جەلی) ناوچەی خۆشناوەتی، دەگرن. پاش شەڕ و دەست وەکردنەوە، چوار سەرباز دەکوژرێت و لەپێشمەرگەکانیش چوار کەس بریندار دەبن و لەگوندەکە دەربازیان دەبێت. سەید کاکە، ل١٢٩.
- ١٩٧٧/١٢/٢١: مەفرەزەیەکی جاشەکان بەفەرماندەی (کانۆ چاوشین)، لەگوندی (حەسەن موترب)ی عەشیرەتی مەنتك، سەر بەناحیەی قوشتەپە، دەبن. هێزێکی پێشمەرگە کەپێکهاتبوون لەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێری

بزوتنـەوە، بەفەرماندەیی (سەعدی گچکە) و مەفرەزەیەکی سەید کاکە و مەفرەزەیەکی کۆمەڵە، چواردەوری گوند دەگرن، شەڕ دەست پێدەکات. لەئەنجامدا، پێنج جاش دەکوژرێن و پێشمەرگەیەکیش بەناوی (محەمەد رەسوڵ سێگردکانی)، شەهید دەبێت. پێنج چەکی سووکی جۆری کلاشینکۆف، دەستکەوتی پێشمەرگە دەبێت. سەید کاکە، ل١٣٠. ئینسکلۆپیدیا، ل٩٢-٩٣.

- ١٩٧٨/١/١٤: شەڕێکی چوار سەعاتی لەنێوان چەند مەفرەزەیەکی سەر بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر و هێزێکی سوپای عێراق لەگوندی (بەردەسپیان)ی سەر بەقەزای کۆیە، روویدا. لەئەنجامدا، ژمارەیەك سەرباز کوژران و بریندار بوون. ئینسکلۆپیدیا، ل٤٦.
- ١٩٧٨/١/٢٧: شەڕێکی پێنج سەعاتی لەنێوان مەفرەزەیەك لەپێشمەرگەکانی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، بەفەرماندەیی سەعدی گچکە و سوپای عێراق، لەگوندی (قەڵاسنج)ی بناری چیای سەفین، روویدا. لەئەنجامدا، ئەفسەرێك و ٢١ سەرباز کوژران. ئینسکلۆپیدیا، ل٢٢٨.
- ١٩٧٨/٢/٢٢: هێزێکی زۆری رژێم لەسوپا و جاش، بەپاڵپشتی چەندین هەلیکۆپتەر، هێرشیان کردە سەر گوندی (شێنێ)ی سەر بەقەڵادزە. شەڕەکە سێ سەعاتی خایاند. هێزەکەی رژێم، بەبێ ئەنجام گەڕانەوە سەربازگەی گۆجاڕ. ئینسکلۆپیدیا، ل١٧٨-١٧٩.
- ١٩٧٨/٣/٨: لەدەوروبەری گوندی (دەشتێو)، هێزێکی پێشمەرگە، بەفەرماندەیی سەعدی گچکە و سەید کاکە، رووبەڕووی هێزێکی زۆری سوپا و جاش و ئەمن و ئیستخبارات دەبنەوە. چەندین فڕۆکە و تانك و زرێپۆش و لیوا و فەوجی سوپا، بەشداری ئەم شەڕە دەکەن. شەڕێکی قورس دەقەومێت. لەئەنجامدا، زیانێکی زۆر و بەرچاوی گیانی و ماددی بەر هێزەکەی رژێم دەکەوێت و نزیکەی (٤٠٠) کەسیان لێدەکوژرێت و بریندار دەبن. چەند کۆپتەرێکیش دەکەوێتە خوارەوە. زیانی پێشمەرگەش، شەهید بوونی فەرماندەی هەرێم (سەعدی گچکە) و چواردە پێشمەرگە دەبێت. پێنج پێشمەرگەش بەبریندار دەکەونە دەست هێزەکەی رژێم، دواتر لەسێدارە

دەدرێن. سەید کاکە، ل١٣٦-١٤٠.

- ١٩٧٨/٥/١١: هێزێکی (٥٠٠) کەسی بەفەرماندەی عەلی عەسکەری کەبەرەو ناوچەی هەکاری دەچوون، لەگوندی (سالاریە)ی سەر بەناوچەی سیدەکان، لەگەڵ هێزێکی رژێم بەپاڵپشتی چەند هەلیکۆپتەرێکی جەنگی، دەکەونە شەڕەوە. لەئەنجامدا، (٤٥) سەرباز دەکوژرێت و چەند پارچە چەکێکیش، دەکەوێتە دەستی هێزەکەی پێشمەرگەوە. ئینسکلۆپیدیا، ل١٤٦.
- ١٩٧٨/٦/١٩: هێزێکی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، بەفەرماندەیی سەعدی گچکە، لەنێوان گوندی (ئاقوبان) و (کەوەرتیان)ی سەر بەقەزای شەقلاوە، رووبەرووی هێزێکی سوپا دەبنەوە. لەئەنجامدا، سێ سەرباز و ئەفسەرێك دەکوژرێن. ئینسکلۆپیدیا، ل١٤. (سەرنج: شەڕەکە بەسەرکردایەتی سەعدی نەبووە، چونکە ئەو کاتە ئەو شەهید ببوو- ئیسماعیل).
- ١٩٧٨/١١/٨-١٩٧٨/١١/١٧: شەڕێکی قورسی نۆ رۆژە، لەنێوان سوپای عێراق و هێزەکانی پێشمەرگە، لەناوچەی قەلادزە و گوندی (شێنێ)، روودەدات. هێزەکەی پێشمەرگە بەفەرماندەیی (حاجی حاجی برایم) بوو. هێزەکەی پێشمەرگە، نزیکەی (١٥٠) پێشمەرگە دەبوون. هەرێمی حەوتی باڵەکیش بەشداریان هەبوو لەشەڕەکەدا. لەئەنجامی شەڕی نۆ رۆژەدا، (٢٥٠) سەرباز کوژران، (٢٠٠)ی تریش بریندار بوون. سێ فڕۆکەش پێکران. هێزەکانی پێشمەرگە لەم شەڕەدا، بێ زیان بوون. ئینسکلۆپیدیا، ل١٧٩.
- ١٩٧٨/١٢/٢: هێزێکی پێشمەرگە بەفەرماندەیی سەید کاکە، سەید سەلیم، شینە بۆڵی، لەگوندی (زێوە)ی خۆشناوەتی، لەگەڵ جاشەکانی (ئەنوەر بەگی بێتواتە)، دەکەونە شەڕەوە. بەکشانەوەی جاشەکان، شەڕەکە کۆتایی پێهات. سەید کاکە، ل١٧٤.
- ١٩٧٩/٢/١٧: مەفرەزەیەکی سەر بەهەرێمی هەشت، لەنزیك گوندی (گۆمەسپان)ی نێوان هەولێر و دێگەڵە، لەکەمینێکدا، ئەفسەرێك بەناوی (جاسم محەمەد مەحمود)، دەستگیر دەکەن. بەم هۆیەوە، رژێم هێرشێکی بەربلاو دەکاتە سەر ناوچەی خۆشناوەتی و لەتۆڵەی ئەم ئەفسەرە، نزیکەی

دوو سەد هاوڵاتی، لەگوندەکانی نازەنین و سماقوڵی سەروچاوە و کونەفلوسە و کەوەرتیان و کەس و کاری پێشمەرگە لەهەولێر، دەستگیر دەکەن. پاش ئەمە، پێشمەرگە ئەفسەرەکە ئازاد دەکەن و حکومەتیش هەموو هاوڵاتیەکان سەربەست دەکات. ئینسکلۆپیدیا، ل٢٥١.

– ١٩٧٩/٢/١٩: هێزێك لەپێشمەرگەکانی هەرێمی (١٢)ی سۆران، بەفەرماندەیی (سەید سەلیم)، لەسەر جادەی نێوان گوندی ئالانە و خەلیفان، کەمینێك بۆ سوپا دادەنێنەوە. هێزەکەی رژێم دەکەوێتە کەمینەکە و شەڕێکی قورس دەقەومێت کەلەئەنجامدا ئامیر فەوجی دووی لیوای (٢٢) و (٤٤) سەرباز و جاش دەکوژرێن، یەك پێشمەرگەش بەناوی سالح عەباس (ئاکۆ) شەهید دەبێت و پێشمەرگەیەکیش بریندار دەبێت. ئینسکلۆپیدیا، ل١٧.

– ١٩٧٩/٢/٢٠: مەفرەزەیەك لەسەر پردی گوندی (حاجی وسو)ی سەر بەناحیەی (دێگەڵە)، لەئەنجامی نانەوەی کەمینێك، ئەفسەرێك بەدیل دەگرن. سەید کاکە، ل١٥٨.

– ١٩٧٩/٧/٥: مەفرەزەیەکی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بەسەرکردایەتی (شەفیق زاهیر)، لەگوندی (شوشکە)ی بناری چیای کۆسرەت، کەمینێك بۆ پێشمەرگەکانی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، بەفەرماندەی (شێرکۆ شێخ عەلی)، دادەنێنەوە. مەفرەزەکەی هێزەکەی سۆسیالیست دەکەوێتە کەمینەکە و لەئەنجامدا، دوو پێشمەرگە شەهید دەبن و دوازدەی تریش بریندار دەبن. ئەمە یەکەم شەڕی چەکداری نێوان یەکێتی و سۆسیالیست بوو. سەید کاکە، ل١٦٣.

– ١٩٧٩/٨/٢١: هێزێکی یەکێتی بەفەرماندەیی (جەمال عەلی باپیر)، لەگوندی (یاخسەمەر)، لەگەڵ هێزێکی سۆسیالیست ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. لەئەنجامدا، پێشمەرگەیەك لەهێزەکەی یەکێتی شەهید دەبێت. سەید کاکە، ل١٦٦.

– ١٩٧٩/٩/٥: هێزێکی یەکێتی بەفەرماندەیی (سەید مەجید و سەلاح چاوشین)، لەگوندی (نازەنین)ی ناوچەی خۆشناوەتی، لەگەڵ هێزێکی سۆسیالیست بەفەرماندەیی (سەید کاکە)، دەکەونە شەڕەوە. لەئەنجامدا،

هەردوولا، بێ زیان دەبن. سەید کاکە. ل١٦٩.

- ١٩٧٩/٩/٧: هێزێکی یەکێتی لەگوندی (سماقوڵی سێنان) دەبێت، هێزێکی (سۆسیالیست)یش دێنە ئەم گوندە. شەڕ دەقەومێت. لەئەنجامدا، پێنج پێشمەرگەی یەکێتی بەدیلی دەکەونە دەست هێزەکەی سۆسیالیست. سەید کاکە، ل١٦٩.
- ١٩٧٩/١٠/٢٠: فەرەج ئەسعەد ئەحمەد، فەرماندەی کەرتی یەکێتی، لەگەڵ مەندە و دوازدە پێشمەرگەی تر، لەدێی (شەوگێڕ)ی دەشتی کۆیە، تەقەیان لە (کاکەسوور)ی فەرماندەی کەرتی سۆسیالیست کرد، بەڵام هیچ لایەکیان زیانیان نەبوو. شاخەوان عەباس، ل٢٢٢.
- ١٩٧٩/١٢/٢٤: هێزێکی زۆری ڕژێم بەپاڵپشتی فڕۆکەی جەنگی و هەلیکۆپتەر و تانك و زرێپۆش و ژمارەیەکی زۆر لەجاش و سەرباز، لەچەندین لاوە هێرش دەکەنە سەر گوندەکانی (سماقوڵی سەروچاو) و (سماقوڵی گرتك). شەڕێکی قورس و فراوان لەچەندین محوەرەوە دەقەومێت. سەرکردەکانی پێشمەرگە بریتی بوون لە: (سەید کاکە، سەید سەلیم، شینە بۆڵی، عەولا سوور، عەولا بۆر، ئەحمەد خان). ڕژێم زیانێکی زۆری بەرکەوت، زیاتر لە (٧٢) تەرم، لەشوێنی شەڕەکە بەجێمابوو. دوو فەرماندەی پێشمەرگە، (سەید سەلیم و شینە بۆڵی)، لەم شەڕەدا، شەهید دەبن. سەید کاکە، ل١٧٤–١٧٨.
- ١٩٨٠/١/١: لەپشت (چناران)، هێزێکی یەکێتی و سۆسیالیست، ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. شەڕ ڕوودەدات. لەئەنجامدا، کادیرێکی یەکێتی، بەناوی (دلشاد محەمەد)، بریندار دەبێت. شاخەوان عەباس، ل٢٢٥.
- ١٩٨٠/٩/٩: هێزێکی یەکێتی بەفەرماندەیی مەجید ئاغا و مەندە و فەرەج، لەپشت گوندی (خدران)، تووشی مەفرەزەیەکی سۆسیالیست دەبن. سۆسیالیستەکان، بێ ئاگا، خەریکی خۆشوشتن دەبن. تەقە دەست پێدەکات. دوو لەپێشمەرگەکانی سۆسیالیست، بەناوەکانی: (محەمەدی مام بەکر) و (جەنگی سەید حەمەدەمین)، شەهید دەبن. ئەوانی تریش، بەدیلی دەکەونە دەست یەکێتی. پاشان، لەژێر فشار، پێشمەرگە دیلەکان تەسلیم بەرژێم دەبنەوە. سەید کاکە، ل١٨٢.

- شەوی ٣-١٩٨١/١/٤: هێزێکی سۆسیالیست بەفەرماندەیی تاهیری عەلی والی و شێروان شێروەندی و قادر جەباری و محەمەدی حاجی مەحمود و مام ئاراس لەناوچەکە دەبن. هێزێکی یەکێتیش بەفەرماندەیی نەوشێروان مستەفا دێنە ناوچەکە. لەگوندی (قەوێڵە)، نەوشێروان، بەدیلی دەکەوێتە دەستی هێزەکەی سۆسیالیست. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٠٠-٤٠١.
- شەوی ٨-١٩٨١/١/٩: هێزێکی یەکێتی لەگەڵ هێزێکی سۆسیالیست، بەفەرماندەیی محەمەدی حاجی مەحمود رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. لەئەنجامدا، پێشمەرگەیەك لەهێزەکەی یەکێتی شەهید دەبێت و (٩)ی تریش بەدیلی دەستگیر دەکرێن. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٠٦-٤٠٧.
- ١٩٨١/١/٢١: هێزێکی سۆسیالیست بەفەرماندەیی (مامە رەشەی کەچە)، لەگەڵ هێزێکی سوپای رژێم دەکەونە شەڕەوە. پێنج سەرباز دەکوژرێن. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤١٢.
- ١٩٨١/٣/١٢: هێزێکی هاوبەشی سۆسیالیست، لەسەر جادەی نێوان خورماڵ- سەید سادق، لەگەڵ هێزێکی رژێم، رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. شەڕێکی قورس دادەکەوێت، لەپاش نیوەڕۆوە تاوەکو شەو بەردەوام دەبێت. (٢٠) سەرباز دەکوژرێن، چەندین سەیارەی سەربازیش تێکدەشکێندرێن. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٢١.
- ١٩٨١/٣/٢٥: هێزێکی سۆسیالیست لەسەر جادەی نێوان سەید سادق و پێنجوین، لەگەڵ سوپای رژێم دەکەونە شەڕەوە. لەئەنجامدا، (٣٠) سەرباز، دەکوژرێن و بریندار دەبن. لەهێزەکەی پێشمەرگەش (مەحمود زەردۆیی)، بریندار دەبێت. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٢١.

- ١٩٨١/٤/١٧: هێزێکی هاوبەشی سۆسیالیست و حزبی شیوعی و یەکێتی، لەدەڤەری (حاسڵ و ئالان)ی سەر بەزەڕایەن، رووبەڕووی هێزێکی سوپا و جاش دەبنەوە. شەڕ دەست پێدەکات، زیانەکانی رژێم: کوژرانی چوار ئەفسەر و (٢٥) سەرباز و جاش. بەدیل گرتنی سەربازێك. ئامیر لیوای (٩٩)، بەناوی (خالید

مەزهـەر عوبێـدی)، لـەناو کوژراوەکانـدا بـوو، تەرمەکـەی کەوتۆتـە دەسـت هێزەکانی پێشمەرگە. پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست بەناوی (ئەکرەم مـەحمود) و دوو پێشمەرگەی یەکێتی و سێی شـیوعی، شـەهید دەبـن. محەمـەدی حـاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٢٥.

- ١٩٨١/٥/٢٦: هێزێکی یەکێتی کەمینێك بۆ هێزێکـی سۆسیالیـست لەگونـدی (ئـالان)، دادەنێنــەوە. لەئەنجامـدا، پێـشمەرگەیەکی سۆسیالیـست بـەناوی (سەرحەد حەمە سەعید) بریندار دەبێت. محەمەدی حاجی مـەحمود، بـەرگی یەکەم، ل٤٣٨.
- شــەوی ٢٣-١٩٨١/٦/٢٤: هێزێکــی سۆسیالیــست دەچــنە نــاو (ســەید سادق)ەوە، دوو سەعات لەگەڵ هێزەکانی سەر بەرژێم شـەڕ دەکـەن، پاشـان بەبێ زیان دەگەڕێنەوە شوێنەکانیان.
- شەوی ٣-١٩٨١/٧/٤: هێزێك لەپێشمەرگەکانی سەر بەهەرێمی یەك، دەچـنە ناو ناحیەی سـیروان. بەچـەکی سـووك و ئارپـێچی لـەبارەگاکانی منەزەمـە و جەیشی شـەعبی دەدەن. شـەڕەکە، چـوار سـەعات درێـژە دەکێـشێت، یـەك جەیشی شەعبی دەکوژرێت و چواری تریش، بریندار دەبن. محەمەدی حـاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٥٧.
- ١٩٨١/٧/٥: مەفرەزەیـەکی کـەرتی حـەوتی سـەر بەهــەرێمی یـەك، لەسـەر جادەی گشتی نێوان (قەدەفـەری و گردەنـازێ)دا، لەسـەیارەیەکی سـەربازی جـۆری ئیڤـا دەدەن، لەئەنجامـدا (١٥) سـەرباز دەکـوژن. محەمـەدی حـاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٥٨.
- ١٩٨١/٨/٢٠: جەمالی عەلی باپیر، فەرماندەی هێزێکی یەکێتی لەگـەڵ بەشـێك لەپێشمەرگەکانی، داوەتی نان خواردن دەبن لەلایـەن (شـێرکۆ شـێخ عـەلی)، فەرماندەی هێزێکی سۆسیالیست. پاش ئەوەی دەبێتە دەمەقاڵێیان، جەمال و هێزەکەی، (شێرکۆ شێخ عـەلی) و شـەش پێـشمەرگەی سۆسیالیـست شـەهید دەکەن. پێشمەرگەکانی سۆسیالیست دەست دەکەنـەوە و (جـەمال) و چـەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی شەهید دەکەن. سەید کاکە، ل١٩٦-١٩٧.
- ئـابی ١٩٨١: پـاش شـەهید کردنـی (شـێرکۆ شـێخ عـەلی)، هێزێکـی گـەورەی

سۆسیالیست، بەفەرماندەیی سەید کاکە، کەپێك هاتبوون لە: (هەرێمەکانی یازدەی باواجی، ١٥ی کۆیە، ١٢ی رواندز و سۆران، ١٠ ی سەفین، ١٤ی ئاکۆیان، و چەندین سەرکردە و فەرماندەی پێشمەرگە)، لەدۆڵی ئالانە و کۆیەوە تا بەری مەرگە و کۆسرەت و دۆڵی جافایەتی، لەتۆڵەی شەهید شێرکۆ، لەچەندین رووبەڕووبوونەوەدا، (٦٣) پێشمەرگەی یەکێتی بەدیل دەگرن. هەروەها کوژراویش لەناو هێزەکانی یەکێتیدا، هەبووە. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٧٧.

– ١٩٨١/٨/٢٣: لەتۆڵەی شەهید (شێرکۆ شێخ عەلی)، هێزێکی سۆسیالیست، بەفەرماندەیی (سەید کاکە و عەبدوڵڵا بۆر و بورهان بلەیی)، لەدۆڵی بالیسان، لەگوندی (چیوەی سەروو)، تووشی چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی دەبن و چەکیان دەکەن و ئازادیان دەکەن. سەید کاکە، ل١٩٨.

– ١٩٨١/٨/٢٦: هەر هەمان هێز، لەدەوروبەری گوندی نازەنین، چەند پێشمەرگەیەکی تری یەکێتی چەك دەکەن و ئازادیان دەکەن. سەید کاکە، ل١٩٨.

– ١٩٨١/٨/٢٩: شەڕێکی فراوان لەنێوان هێزەکانی یەکێتی و هەرێمی (٨)ی دەشتی هەولێر و (١٠)ی سەفین روودەدات. سەید کاکە، ل١٩٨.

– ١٩٨١/٩/٢: هێزێکی زۆری سۆسیالیست لەگوندی (مێوژە)، تووشی هێزێکی یەکێتی دەبن. شەڕ دەست پێدەکات. لەئەنجامدا، پێشمەرگەیەکی یەکێتی شەهید دەبێت. دوانیشیان لێ بریندار دەبێت. ئەوانی تریش، بەدیلی دەگیرێن. سەید کاکە، ل١٩٩.

– شەوی ٩-١٩٨١/٩/١٠: هێزێکی یەکێتی و سۆسیالیست، لەدەڤەری (قاجر)، رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. لەئەنجامدا، پێشمەرگەیەك لەیەکێتی شەهید دەبێت و یەکێکی تریش بریندار دەبێت و بەدیلی دەگیرێت. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٧٠.

– ١٩٨١/٩/١٣: شەڕێکی گەورە لەنێوان یەکێتی و سۆسیالیست، لەنێوان چیای (بیوەك) و (رەزڵە)، روودەدات. لەئەنجامدا، سێ پێشمەرگەی سۆسیالیست شەهید و سێی تریش بریندار دەبن. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی

یەکەم، ل٤٨٠.

- شەوی ١٥-١٩٨١/٩/١٦: لەشەڕێکی نێوان سۆسیالیست و یەکێتیدا، سۆسیالیست ئەم شەهیدانەی هەبووە: (سالار جاف، جەبار بیانەیی، خەبات عەبدوڵڵا، مەحمود زەردۆیی، عەتا حاجی فەریق، شێرزاد حاجی ساڵح، جەلال سورموریاسی، حەمە بچکۆل حەمە عەبدوڵڵا، جەبار حەمە ساڵح). هەروەها پێنج برینداریشی هەبووە. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٨٣.
- ١٩٨١/٩/٢٠: شەڕێك لەنێوان هەرێمی ١٧ی کۆڕەك و هێزەکانی یەکێتی بەسەرکردایەتی (نەوشێروان مستەفا) و سوار ئاغا، روودەدات. لەئەنجامدا، دوو پێشمەرگەی سۆسیالیست و شەشی یەکێتی، شەهید دەبن. سەید کاکە، ل٢٠٥.
- ١٩٨١/٩/٢٦: هێزێکی زۆری یەکێتی لەگەڵ هێزێکی سۆسیالیست لەدەوروبەری گوندی (چێوەی سەروو)، دەکەونە شەڕەوە. لەئەنجامدا، حەسەن وەرتی، فەرماندەی کەرتی سۆسیالیست شەهید دەبێت.
- ١٩٨١/١٠/٧: هێزێکی سۆسیالیست بەفەرماندەی (مام ئاراس)، لەگوندی (تەپەکەلی) شارەزوور، دەکەونە کەمینی هێزێکی یەکێتییەوە. مام ئاراس و چەند پێشمەرگەیەك، بەدیلی دەکەونە دەست هێزەکەی یەکێتییەوە. بۆ رۆژی دواتر (١٩٨١/١٠/٨)، بەدیلی شەهید دەکرێن، کەئەمانە بوون: (مام ئاراس، بارزان عوسمان، خالید حاجی کەریم بێ کراس، وەستا عومەر، محەمەد عەزیز، لەتیف عومەر ساڵح، فارس). ئازاد کاکل، ل٦١-٦٢.
- شەوی ١٥-١٩٨١/١١/١٦: هێزێکی گەورەی (٦٠٠) کەسی، کەپێکهاتبوون لەسۆسیالیست و شیوعی و پارتی، چوونە ناو شاری هەڵەبجە و لەبارەگاکانی رژێمیان دا و بەموکەبیرەی مزگەوت قسەیان بۆ خەڵکی کرد. پاشان گەڕانەوە. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی یەکەم، ل٤٩٣.
- ١٩٨١/١١/١٧: شەڕێك لەنێوان هێزەکانی سۆسیالیست بەسەرکردایەتی عەبدوڵڵا سور و هێزەکانی یەکێتی بەسەرکردایەتی (نەوشێروان و سوارئاغا)، روودەدات. لەئەنجامدا عەبدوڵڵا سور و حەوت پێشمەرگە، پاش ئەوەی

کەبەڵێن لەیەکێتی وەردەگرن کەنایانکوژن، خۆیان رادەستی یەکێتی دەکەن. بەڵام بەداخەوە، بەدیلی، هەموویان شەهید دەکەن. سەید کاکە، ل٢١٥-٢١٦.

- ١٩٨١/١١/٢٥: هێزێکی بەرەی (جود)، هێرش دەکەنە سەر بارەگاکانی یەکێتی لەگوندی (وەرتێ). بارەگاکانی دەگرن و سێ پێشمەرگەی یەکێتیش بەدیل دەگرن. سەید کاکە، ل٢٢١.
- ١٩٨٢/١/١١: هێزێکی هاوبەش لەپێشمەرگەکانی هەرێمی یازدەی باواجی و هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، دوو خەبیری فەرەنسی بەناوەکانی: (مغۆگزیك و ستانی لاس)، دەستگیر دەکەن. فەرماندەی هێزەکانی ئەم چالاکییە بریتی بوون لە: بەکر حەمە، فەرماندەی هەرێمی باواجی و مام غەفور، فەرماندەی کەرتی دووی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، سەید عەبدوڵڵا کەردزی، فەرماندەی کەرت لەهەرێمی یازدەی باواجی. خالید سەعید، فەرماندەی کەرت. سەید عەبدوڵڵا سەرسۆر. ئازاد کاکل، ل٣٧.
- ١٩٨٢/١/٢٠: بۆ ئازاد کردنی دوو خەبیرە فەرەنسییەکە، رژێم بەهێزێکی زۆری سەرباز و جاش، بەپشتیوانی دوازدە هەلیکۆپتەری جەنگی، هێرشێکی چڕ و بەرفراوانی کردە سەر بەستی (شرغە). هێزەکەی رژێم، رووبەڕووی هێزێکی هاوبەشی (سۆسیالیست، یەکێتی، شیوعی)، دەبێتەوە. شەڕێکی قورس دادەکەوێت. سەرەنجام، زیانێکی زۆر بەر هێزەکەی رژێم دەکەوێت، خەبیرەکانیش نادۆزنەوە. لەم رووبەڕووبوونەوەیەدا، زیانی هەرسێ لایەنەکە بەم شێوەیە بوو: سێزدە شەهید و شازدە بریندار، کەشەش لەشەهیدەکان پێشمەرگەی سۆسیالیست بوون. هەروەها پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست، بەناوی (عومەر ژێرسە) بەدیل دەگیرێت. ئازاد کاکل، ل٣٩-٤٠.
- شەوی ١-١٩٨٢/٥/٢: هێزێکی هاوبەشی لقی بادینانی سۆسیالیست و مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی، لەرەبیەکانی سەر (ئەلقوش)یان دا، کەبووە هۆی کوشتنی شەش سەرباز و بریندار بوونی ژمارەیەکی تر. رێگای ئازادی، ژ (٨)، ساڵی دووەم، حوزەیرانی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٢/٥/٢٧: هێزێکی یەکێتی لەنزیك گوندی (حاجی وسو)ی سەر بەناحیەی

دێگەڵـە، تووشــی پێـشمەرگەکانی هــەرێمی (١٠)ی ســەقین، بەفەرمانـدەی عــەریف عــەلی دەبـن. شــەڕ دەقــەومێت. لەئەنجامــدا چــوار پێـشمەرگەی سۆسیالیست بەدیلی دەگیرێن، هەر لـەوێ شـەهیدیان دەکـەن. سـەید کاکـە، ل٢١٧.

- ١٩٨٢/٧/١–١٩٨٢/٩/٣٠: پێـشمەرگەکانی حــزب لەهــەموو دەڤــەرەکان، لەماوەی سێ مانگدا، (١٠٨) چالاکی جۆر بەجۆریان ئەنجامداوە، کەسەرجەم زیانــەکانیان بــەم شـێوەیە بـووە: خـستنە خـوارەوەی دوو هەلیکۆپتــەر، تەقاندنــەوەی ســێ ناقیلــە، تێـك و پێکـدانی ســەربازگەیەك، ســوتاندن و تێکشکاندنی (٢٣) ئۆتۆمبیلی زیل و ئیڤـای سـەربازی و جاشـەکان، کـوژرانی (١٥٤) ســەرباز و جــاش، ٧٨ برینــدار، ٢٩ دیــل، ٣٧ کلاشــینکۆف، ١٣ دەمانچە، ژمارەیەکی زۆری فیشەك و کەل و پەلی سەربازی، هێنان و دەست بەســەر داگرتنــی (٢٤) ئۆتــۆمبیلی حکــومی و ســەربازی، دەسـتکەوتی پێشمەرگەکان بووە. لەهەموو چالاکییەکاندا: (١٠) پێشمەرگە شەهید و (١٦) بریندار هەبووە. رێگای ئازادی، ژ (١٠)، ساڵی دووەم، ئەیلولی ١٩٨٢، ل٣.
- ١٩٨٢/٧/٣٠: پێشمەرگەکانی هەرێمی هەشتی دەشتی هـەولێر، کـەمینێکیان لەسەر رێگای پردێ– هـەولێر، دانایـەوە. سـەیارەیەکی سـەربازی دەکەوێتـە کەمینەکەوە. پاش رووبەڕووبوونەوە، عەقیدێك و نائب عـەریفێك و سـەربازێك بــەدیلی دەگیرێــن. رێگــای ئــازادی، ژ (٩)، ســاڵی دووەم، ئــابی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.
- شەوی ٤–١٩٨٢/٨/٥: پێشمەرگەکانی هەرێمی (١٢)ی هەنـدرێن و کۆمیتـەی ناوچەی رواندزی حزب، لەکاتژمێری هەشتی ئێـوارە تـا کاتـژمێر سـێی شـەو، دەسـتیان بەسـەر تـەواوی شـاری رەوانـدزدا گـرت و لەبنکـە و بارەگاکـانی رژێمیاندا. پاشان، لەمزگەوتی (باویل ئاغا)، بەبڵندگۆ وتارێکیـان خوێنـدەوە. لەگەڕانەوەیاندا، تووشـی کـەمینێکی سـەربازی بـوون. کەمینەکـە شـکێندرا و پێشمەرگەیەك بەسووکی بریندار بـوو. رێگـای ئـازادی، ژ (٩)، سـاڵی دووەم، ئابی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٢/٨/١٧: پێـشمەرگەکانی هــەرێمی (١ و ٥)ی ســەر بــەلقی ســلێمانی،

لەگوندی (گردەنازێ)ی دەڤەری شارەزوور، لەرژێم دێنە دەست و هەشت موخابەرات دەکوژن و دەست بەسەر چەکەکانیاندا، دەگرن. رێگای ئازادی، ژ (١٠)، ساڵی دووەم، ئەیلولی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.

- ١٩٨٢/٩/١٤: هێزێکی هاوبەشی هەرێمی (٧)ی قەرەچوغ و قوەی زورگەزراو، سەعات چواری ئێوارە، لەهێرشێکی کتوپڕدا، دەستیان بەسەر گوندی (زمارە)دا گرت و جەیش شەعبیەکانیان چەك کرد. رێگای ئازادی، ژ (١٠)، ساڵی دووەم، ئەیلولی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٢/١٠/١٢: هێزێکی زۆری رژێم، بەپاڵپشتی چەندین تانك و زرێپۆش و چوار هەلیکۆپتەر، هێرشیان کردە سەر گوندی (بەردەسپی) لەبەستی (شرغە). پێشمەرگەکانی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر و هەرێمی حەوتی قەرەچوغ لێیان دێنە دەست. رژێم زیانێکی زۆری بەرکەوت. پێشمەرگەیەك بەناوی (حەمید یابە)، سەر بەهەرێمی حەوت شەهید دەبێت، چواری تریش بریندار دەبن. ئازاد کاکل، ل٤٤-٤٥.
- ١٩٨٢/١٠/٢١: هێزێکی پێشمەرگە کەپێکهاتبوون لەقوەی زورگەزراو، کەرتی (٦)ی هەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، ناوچەی دەشتی هەولێر، بەمەبەستی هوشیارکردنەوەی جەماوەر و تەمبێ کردنی پیاوانی رژێم، بەرەو بناری قەرەچوغ بەڕێکەوتن. پاش تەواو بوون و ئەنجامدانی کارەکانیان، لەشەوی ٢٨-١٩٨٢/١٠/٢٩، بەرەو بەستی (شرغە) دەگەڕێنەوە. لەنزیك گوندی (منارە)، دەکەونە کەمینی جاشەکان. پاش رووبەڕووبوونەوە، دوو پێشمەرگە بەناوەکانی (کاکە زیاد حەسەن) فەرماندەی مەفرەزەی ناوچەی دەشتی هەولێر و (خەسرەو ئیسماعیل) پێشمەرگەی ناوچەی دەشتی هەولێر، شەهید دەبن. هەردوو شەهید خەڵکی گوندی (کەردن)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە بوون. پاش تەواوبوونی شەڕ و شکاندنی کەمینەکە، هێزەکە دەگەڕێتەوە چیای قەرەچوغ. رژێم هێرشیان دەکاتە سەر، جارێکی تریش شەڕ دەقەومێت. ئازاد کاکل، ل٤٦-٤٧.
- ١٩٨٢/١١/٧: هێزێك لەپێشمەرگەکانی هەرێمی (٤)، لەسەر جادەی گشتی نێوان سورداش و دوکان، کەمینێك دادەنێتەوە. لەئەنجامدا کاروانێکی

سەربازی دەکەوێتە کەمینەکەوە. ئامیر فەوجی سوسێ و دوو ئەفسەری تر، دەکوژرێن لەگەڵ (١٠) سەرباز. دەستکەوتی پێشمەرگەکان (٨) کلاشینکۆف و هەندێك کەلوپەلی سەربازی. ڕێگای ئازادی، ژ (١١)، ساڵی دووەم، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٢، دوا لاپەڕە.

- ١٩٨٢/١١/١٣: هێزێکی هاوبەش لەپێشمەرگەکانی بارەگای هەرێم و کەرتی دووی هەرێمی چوار و کۆمیتەی ناوچەی دوکان، کەمینێکیان لەسەر ڕێگای گشتی نێوان سلێمانی– دوکان، نایەوە. لەکاتژمێر (٣,٣٠)ی پاش نیوەڕۆ لەنزیك سەربازگەی (کانی خان)، ئیڤایەکی عەسکەری دەکەوێتە کەمینەکەوە. لەئەنجامدا، ئیڤایەکە تێك و پێك شکێنرا و (١٠) سەرباز کوژرا و پێنجی تریش بریندار بوون. ڕێگای ئازادی، ژ (١٢)، ساڵی دووەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢، ل٣.
- شەوی ١٣–١٩٨٢/١١/١٤: مەفرەزەیەك لەپێشمەرگەکانی لقی هەولێر، بەهاوکاری کەرتی (١)ی سەر بەهەرێمی (١١)ی باواجی، دەچنە ناو ناحیەی دێگەڵە و دەست بەسەر تەواوی دەرمانخانەکانی نەخۆشخانەکەدا دەگرن و دەیگوازنەوە ناوچە ئازادکراوەکان. ڕێگای ئازادی، ژ (١١)، ساڵی دووەم، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٢، ل٥.
- ١٩٨٢/١١/١٤: مەفرەزەیەکی کەرتی (٢)ی سەر بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، لەسەر ڕێگای نێوان هەولێر– مەخمور، خەبیرێکی دانیمارکی بەناوی (پاینس فردیکنە) بەسەیارەکەیەوە دەڕفێنن. ناوبراو خەڵکی دانیمارك، دانیشتووی (کۆپنهاگن) بووە. ڕێگای ئازادی، ژ (١١)، ساڵی دووەم، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٨٢، ل٤.
- ١٩٨٢/١١/٢٥: هێزێکی هاوبەش کەپێکهاتبوون لەکۆمیتەی ناوچەی هەولێر و هەرێمی هەشت و حەوت و قوەی زورگەزراو چوونە ناوچەکانی گوێڕ و دیبەگە و مەخمور. لەشاخی قەرەچوغ، ڕووبەڕووی هێزێکی زۆری جاش و ئیستخبارات بوونەوە. شەڕ لەسەعات (٧)ی بەیانیەوە تا شەو بەردەوام بوو. لەهێزەکەی ڕژێم، زیاتر لە (٢٠) جاش کوژران و ژمارەیەکیشیان لێ بریندار بوو. پێشمەرگەیەکیش شەهید بوو بەناوی (قاسم سەلیم) سێقوچانی، دوانی

تریش بریندار بوون. ڕێگای ئازادی، ژ (١٢)، ساڵی دووەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢، ل٤.

- ١٩٨٢/١٢/١٥: هێزێکی هاوبەش لەپێشمەرگەی هەرێمەکانی (١، ٢، ٥) و کۆمیتەی ناوچەی گەرمیان و کۆمیتەی ناوچەی هەڵەبجە و کەرتی بارەگای لقی سلێمانی، هێرشیان کردە سەر مۆلگا و ڕەبایەکانی جاش و سوپا لەناو سەید سادق و دەوروبەری. لەم شەڕەدا، کەسێ سەعاتی خایاند، (٣٥) سەرباز و جاش کوژران. پاشان ڕژێم کوێرانە بۆردومانی ناوچەکەی کرد کەبووە هۆی شەهید بوونی ئافرەتێك و دوو منداڵیش بریندار بوون. ڕێگای ئازادی، ژ (١)، ساڵی سێیەم، کانوونی دووەمی ١٩٨٣، ل١ و ٢.
- شەوی ١٥-١٩٨٢/١٢/١٦: هێزێکی هەرێمی (٧)ی قەرەچوغ، لەنزیك گوندی (بیرە عارەبان)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە، دەکەونە کەمینی جاش و مەفاریز خاسەی دائیرەی ئەمنی قوشتەپە. لەئەنجامدا یازدە پێشمەرگە لەناو عارەبانەی تراکتۆر شەهید دەبن. شەهیدەکان (ڕەمەزان عەبدولڕەحمان، ڕەشاد بەردێنە، شێرزاد هەینی، مزەفەر عوسمان، نوری خورمەڵە، ڕەمەزان ئەحمەد، ئەکرەم مەولود، ڕەحمان ئیسماعیل، سالم عومەر، ئیسماعیل نورەدین، ڕەحمان سەعید). پێنج پێشمەرگەش بریندار دەبن. ئازاد کاکل، ل٥١-٥٢.
- ١٩٨٣/١/١٠: مەفرەزەیەك لەپێشمەرگەکانی هەرێمی (١٥)، لەسەر ڕێگای گشتی کۆیە- ڕانیە، کەمینێکیان دانایەوە. سەیارەیەکی تویتا سالۆن کەوتە ناو کەمینەکە و سەرنشینەکانی بەدیل گیران، بریتی بوون لە: ملازمی دوو ئەستێرەی پۆلیس (عزەدین وەلید خالید)، خەڵکی موسڵ، معاون پۆلیس لەچوارقورنە. پۆلیس مخابر (موشتاق ئەحمەد خدر). کلاشینکۆفێك و دەمانچەیەك و سەیارەیەکی تویتا، دەستکەوتی پێشمەرگەکان بوو. ڕێگای ئازادی ژ (١)، ساڵی سێیەم، کانوونی دووەمی ١٩٨٣، ل١-٢.
- ١٩٨٣/١/٢٤: هێزێك لەپێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر، لەسەر ڕێگای سەرەکی هەولێر- کۆیە، کەمینێك دادەنێنەوە. سەیارەیەکی عەسکەری دەکەوێتە کەمینەکە و پێشمەرگەکان دەیدەنە بەر دەستڕێژی گوللە.

لەئەنجامدا، مقەدەمێکی عەسکەری بەناوی (عەبدولعەزین)، ژمارەی ناسنامە (٤٠٣٢)، لەگەڵ عەریفێك دەکوژرێن. رێگای ئازادی، ژ (٢)، ساڵی سێیەم، شوباتی ١٩٨٣، ل١.

- شەوی ١١-١٩٨٣/٢/١٢: دوای مۆرکردنی رێککەوتننامەی نۆزدە قۆڵی تەرابلس لەلیبیا، بەچەند رۆژێك، هێزێکی بەرەی جود کەپێکهاتبوون لە: حزبی سۆسیالیست، شیوعی، پارتی، پاش ئەنجامدانی چالاکیەك لەدژی هێزەکانی رژێم دەگەنە گوندی (نێرەگێن)ی بەستی (شرغە) و لەوێ دەمێننەوە. هەر هەمان شەو، هێزێکی زۆری (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، چواردەوری گوند دەگرن و دەیاندەنە بەر رێژنەی چەکی سووك و ئارپیجی. پاش شەرێکی (١٩) سەعاتی، (١١) پێشمەرگە شەهید دەبن، کەدوانیان پاش بەدیل گرتنیان، شەهید دەکرێن. پێشمەرگە شەهیدەکانی سۆسیالیست: (سەلام ئەبوبەکر، عوسمان حەمەد میرەکانی، قاسم ئەبوبەکر، زرار حەمەد داود، سابیر عومەر، ناسیح حاجی رەسول، عومەر دیبەگەیی، عەبدوڵڵا تاڵەبانی). شەهیدەکانی حزبی شیوعی: (مەحمود قادر، نادر چۆمە زەردەرەیی، گەیلان). رێگای ئازادی، ژ (٣)، ساڵی سێیەم، ئازاری ١٩٨٣، دوا لاپەرە.
- ١٩٨٣/٢/١٦: هێزێکی سەر بەهەرێمی یازدەی باواجی دەیانەوێت بچنە گوندی (نێرەگێن) و لەگەڵ هێزە شەرکەرەکەی سۆسیالیست یەك بگرنەوە، لەرێگادا، لەنێوان گوندی سماقە و بایز ئاغادا، بەسەر کەمینێکی یەکێتیدا دەکەون. لەئەنجامدا، (بەکر حەمە)ی فەرماندەی هەرێم و (محسین باین)ی جێگری و (قەهار قەرچناغەیی) فەرماندەی کەرت، بریندار دەبن. سەید کاکە، ل٢٤٢.
- ١٩٨٣/٣/٢١: هێزێکی هاوبەش کەپێکهاتبوون لەقوەی زورگەزراو و کەرتی شەشی سەر بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر و مەفرەزەیەکی پارتی

دیموکراتی کوردستان، چوونه ناو ناحیەی گوێڕ و لەبارەگاکانی ئەمن و جەیشی شەعبیان دا، لەئەنجامدا: (٧) ئەمن کوژرا و پێنجی تریش بریندار بوون. هەروەها دوو جەیشی شەعبیش کوژران. ڕێگای ئازادی، ژ (٣)، ساڵی سێیەم، ئازاری ١٩٨٣، ل١.

- شەوی ٢٤–١٩٨٣/٣/٢٥: هێزێکی قوەی ئاسۆس لەکاتی پەڕینەوەیان لەچۆمی (سەندۆڵان)، هێزێکی یەکێتی تەقەیان لێدەکەن. لەئەنجامدا، پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست بەناوی (عوسمان حاجی ڕۆستەم) شەهید دەبێت. ڕێگای ئازادی، ژ (٣)، ساڵی سێیەم، ئازاری ١٩٨٣، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٣/٤/١٩: چوار هەلیکۆپتەر لەکاتی ڕووماڵکردنی بەستی شرغە، بۆردومانی هێزێکی سۆسیالیست دەکات، لەئەنجامدا، دوو پێشمەرگە بەناوەکانی (لوقمان تەڵعەت و هەڤاڵ ئیسماعیل) شەهید دەبن و سێی تریش بریندار دەبن. ئازاد کاکل، ل٩٤–٩٥.
- ١٩٨٣/٤/٢٨: هێزێکی سەر بەبەرەی جود، هێرشیان کردە سەر بارەگای مەڵبەندی سێی یەکێتی لەگوندی بالیسان. دوای شەڕێکی خوێناوی، داگیری دەکەن. زیانی هەموو لایەنەکان لەم شەڕەدا: یازدە شەهید و بیست بریندار بوو. ئازاد کاکل، ل٩٧.
- ١٩٨٣/٥/١: جەولەی یەکەمی شەڕی (ئاشقولکە و پشت ئاشان)، کەلە ٥/١ دەستی پێکرد و لە ٥/١٣ کۆتایی پێهات، سۆسیالیست لەم شەڕەدا، پێنج پێشمەرگە و حزبی شیوعی زیاتر لە (٦٠) شەهیدی دەبێت.
- ١٩٨٣/٦/١: مەفرەزەیەکی سەر بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر کەلەنۆ پێشمەرگە پێکهاتبوون، لەترسی هێزەکانی یەکێتی خۆیان لەچەمی گوندی (قەرە سالم)ی سەر بەناحیەی ئاڵتون کۆپری، شاردبۆوە. یەکێتی چوار دەوریان دەگرن، شەڕ دەست پێدەکات. هەندێك لەپێشمەرگەکان پاش تەسلیم بوون شەهید دەکرێن. ناوی شەهیدەکان: (وەلی حەمەد ئەمین،

عەبدولکەریم حوسێن، کاوە عومەر، نەسرەدین یاسین، عوسمان عومەر، فەرهاد شوکر، نەسرەدین خورشید، ئازاد رەحمان). ئازاد کاکل، ل١٣٨-١٣٩.

- ١٩٨٣/٦/١٥: هێزێکی قوەی هەیبەت سوڵتان، لەگوندی سماقوڵی گرتك، دەکەونە کەمینی هێزێکی یەکێتییەوە. پاش شەڕێکی خوێناوی، فەرماندەی قوەی هەیبەت سوڵتان (دلزار حوسێن)، شەهید دەبێت. ئازاد کاکل، ل١٤٠.
- ١٩٨٣/٧/١٥: هێزێکی زۆری رژێم لە (سوپا و جاش و ئیستخبارات)، هێرشیان کردە سەر پێشمەرگەکانی کۆمیتەی ناوچەی رواندز و هەرێمی (١٢) لە (باسکە درێژ و گەلی مێگر). شەڕێکی سەخت داکەوت کەلەسەعات نۆی بەیانییەوە تاوەکو چواری عەسر بەردەوام بوو. زیانەکانی رژێم: (کوشتنی چوار سەرباز و جاشێك). پێشمەرگەیەکیش بریندار بوو. رێگای ئازادی، ژ (٥)، ساڵی سێیەم، ئابی ١٩٨٣، دوا لاپەرە.
- ١٩٨٣/٧/٢٧: مەفرەزەیەکی سەر بەهەرێمی (٩)ی باڵەك، هێرشیان کردە سەر رەبیە سەربازییەکانی سەر چیای (بەردەبووك)ی پشت شارۆچکەی چۆمان. شەڕەکە سێ سەعاتی خایاند. لەئەنجامدا: ئەفسەرێك و سێ سەرباز کوژران. رێگای ئازادی، ژ (٥)، ساڵی سێیەم، ئابی ١٩٨٣، ل٨.
- ١٩٨٣/١٠/١٥: مەفرەزەیەکی کەرتی (٢)ی سەر بەهەرێمی هەشتی دەشتی هەولێر، بەفەرماندەیی (عەباس عەلی سۆر) دەچنە ناو شاری هەولێر و سەعات ١١ی شەو لەگەڕەکی ئیسکان، لەگەڵ هێزەکانی رژێم رووبەڕوو دەبنەوە. (عەباس)ی فەرماندەی کەرت بەبریندراری دەکەوێتە دەست هێزەکانی رژێم، دوای ساڵێك لەزیندان مانەوە، لەسێدارە دەدرێت. ئازاد کاکل، ل٤٣.
- ١٩٨٣/١١/٦: پێنج پێشمەرگەی سۆسیالیست لەگوندی (سێناڵە)ی نزیك قوشتەپە رووبەڕووی هێزێکی رژێم لەسەرباز و جاش و جەیشی شەعبی

دەبنـەوە. پـاش شـەڕێکی قـوڕس، سـێ جەیـشی شـەعبی دەکـوژرێن و پێـشمەرگەیەکیش بریـندار دەبێـت. ڕێگـای ئـازادی، ژ (٧)، سـاڵی سـێیەم، کانوونی یەکەمی ١٩٨٣، ل١ و ٧.

- ١٩٨٤/١/١: هێزێکی هاوبەش کەپێکهاتبوون لەپێشمەرگەکانی هـەرێمی (١) و (٤)، سەعات (٨,٣٠) شەو هێرشیان کردە سەر ڕەبایەکانی نێوان (کێلەکـەوە و شانەدەری) و، دەستیان بەسەردا گرت. لەئەنجامدا: پێنج سەرباز کوژران و دووی تریش بەدیل گیران. ڕێگای ئازادی، ژ (٢١)، شوباتی ١٩٨٤، ل٦.
- ١٩٨٤/١/١٦: پێـشمەرگەکانی سـەر بـەلقی بادینـان، لەسـەر ڕێگـای گـشتی (باتوفـە)، کـەمینێکیان دانایـەوە. زیلێکـی سـەربازی کەوتـە کەمینەکـەوە، لەئەنجامـدا: (٩) سـەرباز کـوژران و بریـندار بـوون. ڕێگـای ئـازادی، ژ (٢٢)، ئازاری ١٩٨٤، دوا لاپەڕە.
- شەوی ١٤-١٩٨٤/٢/١٥: مەفرەزەیەکی سەر بەقوەی هـەورامان، بـۆ مـاوەی یەك سـەعات، ڕەبایـەکانی دەوروبـەری (سـەید سـادق)یـان بەچـەکی سـوك و قوڕس گوللەباران کرد. لەئەنجامدا، سەربازێك کوژرا و، یەکێکی تریش بریندار بوو. ڕێگای ئازادی، ژ (٢٢)، ئازاری ١٩٨٤، ل٥.
- شـەوی ٢٥-١٩٨٤/٢/٢٦: پێـشمەرگەکانی سـەر بـەلقی بادینـان، هێرشـیان کردە سەر بارەگاکـانی ڕژێـم لەناحیـەی (دەرگـار عەجـەم)، زیـانێکی زۆریـان لەرژێم دا. ڕێگای ئازادی، ژ (٢٢)، ئازاری ١٩٨٤، ل٥.
- ١٩٨٤/٣/١١: مەفرەزەی شەهید (دڵزار)ی سەر بەناوچەی ڕواندز، چوونە نـاو شارۆچکەی خەلیفان. بڵاوکراوەکانی حزبیان بڵاو کردەوە، پاشان بەئارپیجی و چەکی سووك لە (منەزەمە و مەرکەزی پۆلیس و خەستەخانەی سـەربازی و ڕەبیـەی تـانکی)یـان دا. زیانـەکانی ڕژێـم: کـوژرانی دوو جەیـشی شـەعبی و سـەربازێك. مەفرەزەکـەش بەسـەلامەتی گەڕانـەوە. ڕێگـای ئـازادی، ژ (٢٣)،

نیسانی ١٩٨٤، دوا لاپەڕە.

- ١٩٨٤/٣/١٨: مەفرەزەیەکی تایبەتی سەر بەلقی هەولێر، لەسەر جادەی شەست مەتری، نزیك مزگەوتی سپی، تەقەیان لە (قاسم زیارەتی) کرد، لەئەنجامدا، ناوبراو کوژرا، (جەلال ئاکۆ)ش بریندار بوو. ئەم دوو جاشە سەر بەمەفرەزە خاسەی (وەهاب عەیشێ) بوون. ڕێگای ئازادی، ژ (٢٣)، نیسانی ١٩٨٤، ل٧.

- شەوی ٢٦-١٩٨٤/٧/٢٧: مەفرەزەیەك لەپێشمەرگەکانی هەرێمی (٣)ی شارباژێڕ، چوونە ناو شاری سلێمانی. لەسەر جادەی سی مەتری گەڕەکی شەهیدان، دوو سەیارەی پۆلیسی فریاکەوتن دەدەنە بەر دەستڕێژی گوللە. لەئەنجامدا هەردوو سەیارەکە پەکیان دەکەوێت و سێ پۆلیس دەکوژرێن و دوانی تریش بریندار دەبن. مەفرەزەکەش بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە. ڕێگای ئازادی، ژ (٢٦)، ئابی ١٩٨٤، دوا لاپەڕە.

- ١٩٨٤/١١/١: هێزێکی هاوبەش لەپێشمەرگەکانی هەرێمی (٩)ی باڵەکی سەر بەحزبی سۆسیالیست و سریەی شەهید (خدر کاکل)ی حزبی شیوعی، هێرشیان کردە سەر مۆڵگەکانی ڕژێم لەگوندی (ئۆمەراوە و ناوکێلەکان)، کەدەکەونە سەر ڕێگای گشتی ڕواندز- چۆمان. هێزەکە بەهاوەنی (٦٠) ملم و ئاربیجی و چەکی سووك، بارەگای لیوا و دوو فەوجی سەر بەلیوا و کەتیبەی مەدفەعیان ئاگرباران کرد. زیانەکانی ڕژێم: کوشتن و بریندار بوونی (٧٠) سەرباز. لەکارخستن و تێکشکاندنی تۆپێکی مەیدان و دۆشکەیەك و سووتاندنی (٩) سەیارەی سەربازی. ڕێگای ئازادی، ژ (٢٧)، تشرینی دووەمی ١٩٨٤، ل١.

- ١٩٨٤/١١/٢: سەعات (١٠)ی سەر لەبەیانی، مەفرەزەیەکی تایبەتی سەر بەهەرێمی (٨)ی دەشتی هەولێر، لەناو جەرگەی شاری هەولێر، لەگۆڕەپانی

کۆتر سەلام، تاوانبار (محەمەد عەلی سۆر) دەکوژن. تاوانباری ناوبراو، لەساڵی ١٩٨٢، بەهاندان و دەست لەپشتدانی رژێم، دەبێتە پێشمەرگە و، (سەعید عەلی سۆر)ی برای دەکوژێت و تەسلیم بەرژێم دەبێتەوە. سەعید عەلی سۆر، فەرماندەی کەرت بوو لەهەرێمی (٨). رێگای ئازادی، ژ (٢٧)، تشرینی دووەمی ١٩٨٤، دوا لاپەڕە.

- شەوی ٢٠-١٩٨٤/١٢/٢١: پێشمەرگەیەکی سەر بەکەرتی زاخۆ نارنجۆکێکی دەستی فڕێدایە ماڵی تاوانبار (حاجی ئەحمەد). زیانەکانی نەزانراوە. بەهدینان، ژمارە (٣)، کانوونی دووەمی ١٩٨٥، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٥/١/١٢: مەفرەزەی شەهید (برهان)ی سەر بەکەرتی یەکی زاخۆ، کەمینێکیان لەنێوان (سێکوتکێ و زەمبیل فرۆش) لەسەر شەقامی زاخۆ-باتوفە، دانایەوە. دەوریەکی رژێم کەوتە کەمینەکەوە. لەئەنجامدا، سێ جەیشی شەعبی کوژران و هەندێکی تریش بریندار بوون. بەهدینان، ژ (٣)، کانوونی دووەمی ١٩٨٥، دوا لاپەڕە.
- ١٩٨٥/٢/٧: هێزێکی زۆری رژێم کەپێکهاتبوون لەسوپا و جاش و موخابەرات، هێرشیان کردە سەر هێزێکی سۆسیالیست لەگوندی (ناوگردان)، لەناوچەی شارەزوور. شەڕێکی گەورە قەوما. رژێم شکا و (١٢) جاش کوژران و (٣٠)ی تریش بریندار بوون. هێزەکەی پێشمەرگەش (٩) برینداری سووکی هەبوو. لەم شەڕەدا، مەسئولی موخابەراتی سەید سادق کوژرا. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی دووەم، ل٢٣٥.
- ١٩٨٥/٦/٢٦: رژێم هێرشی کردە سەر (بانی شار) و بارەگای هەرێمی (٢)ی قوەی سیروان. شەڕەکە سێ سەعاتی خایاند، چەندین سەرباز کوژران، چواریش بەدیلی گیران. دەستکەوتی پێشمەرگە: هاوەنێکی (٦٠) ملم و چەند چەکێکی سووك و کەل و پەلی سەربازی بوو. محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی دووەم، ل٢٧٣.

## ١- ساڵح یوسفی:

ساڵح عەبدوڵڵا نەجمەدین مەلا تەها یوسفی، ناسراو بەسەیدا ساڵح یوسفی، لەبنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری ئایینی لەساڵی ١٩١٨، لە (بامەڕنێ)ی سەر بەقەزای ئامێدی لەدایك بووە. باپیرەی گەورەی یەکێك بووە لەو کەسانەی کەدژی دەسەڵاتی عوسمانییەکان، جەنگاوە و، بەشداری شۆڕشی بنەماڵەی بەدرخانییەکانی کردووە. عەبدوڵڵای باوکی یوسفی، زانایەکی ئایینی خاوەن باوەڕنامە و ڕێگەپێدراو بووە. سەیدا ساڵح، خوێندنی سەرەتایی لە (بامەڕنێ)، تەواو کردووە. بۆ بەردەوامبوون و تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن، چۆتە بەغدا و، قۆناغی دوا ناوەندی لەساڵی ١٩٣٨دا، لەدواناوەندی (ئال ئەلبەیت)، تەواو کردووە و، هەر ئەم ساڵە، بەپیشەی مامۆستا، لەشارۆچکەی (هەریر)، دامەزراوە. دوای ماوەیەکی کەم، بەنیازی تەواوکردنی خوێندنی باڵا گەڕاوەتەوە بەغدا و، لەساڵی خوێندنی ١٩٤٢-١٩٤٣، بەپلەی نایاب، خوێندنی باڵای لەکۆلیژی شەریعە تەواو کردووە. لەبەر ئەوەی نمرەکانی زۆر باش بووە، دەوڵەت بڕیاری داوە بینێرێتە زانکۆی ئەزهەر لەقاهیرە، تاوەکو ببێتە قازی... بەڵام لەبەر هەژاری و نەداری بنەماڵەکەیان، نەیتوانیوە بچێتە قاهیرە.

هەر لەم ساڵەدا، لەدادگای موسڵ بەفەرمانبەر، دامەزراوە. لەساڵی ١٩٤٧دا، بەهۆی چالاکی سیاسی، بۆ باشوری عێراق و شاری (حلە)، دوورخراوەتەوە. لەساڵی ١٩٤٩دا، بەر لێبووردن کەوتووە و لەدادگای شەنگال (سنجار)، دامەزراوە. دواتر، بۆ زاخۆ گواستراوەتەوە. لەساڵی ١٩٥٨دا، بۆ شاری موسڵ، گواستراوەتەوە و، بۆتە بەڕێوەبەری (ئەحوال ئەلقاصرین). لەساڵی ١٩٦٠، بەدواوە، ژیانی خۆی بەتەواوی بۆ سیاسەت و حزب تەرخان کردووە.

سەیدا یوسفی، لەتەمەنی هەژدە ساڵییەوە، خولیای سیاسەت بووە. لەساڵی ١٩٣٦دا، لەگەڵ هاوڕێیانی، ڕێکخراوی (بروسك)، دادەمەزرێنن. چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە، هەر لەدەڤەری بادینان بووە. لەساڵی ١٩٣٩دا، لەگەڵ (ڕەفیق حیلمی، مستەفا عوزێری، یونس ڕەئوف دڵداری شاعیر، جەلال قادر، موسا عەبدولسەمەد، ڕۆستەم عەبدولجەبار) و چەندین هاوڕێی تری، (حزبی هیوا)، دادەمەزرێنن. یوسفی بۆتە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی هیوا لەکۆلێژی خانەی

مامۆستایانی باڵا و زانستەکان لەبەغدا. هەروەها، یەکەم ڕێکخراوی (حزبی هیوا)ی لەدەڤەری بادینان دامەزراندووە و سەرپەرشتی کردووە. دوای ئەوەی حزبی هیوا، کێشەی (چەپ و راستی)، تێدەکەوێت، لەساڵی ١٩٤٤دا، هەڵدەوەشێتەوە. بەشێك لەئەندامەکانی، (حزبی رزگاری کورد)، لەساڵی ١٩٤٥دا، دادەمەزرێنن. سەیدا یوسفی، یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی. کە (رزگاری)، هەڵدەوەشێتەوە، (پارتی دیموکراتی کورد)، دواتر: (کوردستان)، لە ١٦/٨/١٩٤٦دا، دادەمەزرێنن.

سەیدا یوسفی، یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی پارتی و، بۆتە لێپرسراوی لقی بادینان (موسڵ)ی ئەم پارتە. لەدوای شۆڕشی چواردەی تەموز، لەساڵی (١٩٦٠)، یاسای دامەزراندنی حزب و ڕێکخراو و کۆمەڵەکان، دەرچووە، تاوەکو بتوانن بەئاشکرا و بەرەسمی چالاکی بنوێنن. بۆ ئەم مەبەستە، لە ١٩/١/١٩٦٠، هەریەك لە: (مستەفا بارزانی، ساڵح یوسفی، ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، عومەر مستەفا، عەلی عەبدوڵڵا، مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل، حیلمی عەلی شەریف، ئیسماعیل عارف، شەمسەدین موفتی)، داوایەك ئاراستەی حکومەت دەکەن. لە ٩/٢/١٩٦٠، قبوڵ دەکرێت و، (پارتی دیموکراتی کوردستان)، دەبێتە پارتێکی یاسایی ڕێگەپێدراو. دوای ئەوەی پەیوەندی نێوان پارتی و حکومەتی قاسم، بەرەو ئاڵۆزی دەچێت، حکومەت فشاری زۆری خستۆتە سەر ڕێکخراو و کەسایەتییە ناسراوەکانی پارتی. لە ١٥/١٠/١٩٦٠دا، سەیدا گیراوە و، بۆ زیندانەکانی بەغدا و ناسریە، دوور خراوەتەوە. لە ١٩٦٢دا، بۆ زیندانەکانی موسڵ، گواستراوەتەوە. هەر لەم ساڵەدا، ئازاد کراوە. دوای ماوەیەکی کەم، جارێکی تر، فەرمانی گرتنی بۆ دەرچووە، بەڵام ناوبراو خۆی رادەستی حکومەت، نەکردووە. لەساڵی ١٩٦٢دا، بۆتە لێپرسراوی لقی پێنجی پارتی لەبەغدا. پاش ڕووخانی حکومەتی قاسم و هاتنە سەر کاری بەعسییەکان لە ٨/٢/١٩٦٣، لەنێوان پارتی و حکومەت، دانوستاندن، دەستی پێکردووە. پارتی وەفدێکی چواردە کەسی بەسەرۆکایەتی مام جەلال و سەیدا یوسفی وەك جێگر، لەئازاری ١٩٦٣ ناردۆتە بەغدا. سەیدا، لەم کاتەی کەئەندامی وەفدی دانوستاندکار بووە لەبەغدا، لە ٩/٦/١٩٦٣، گیراوە و، بەدڕندانەترین شێوە

ئـازاری جەسـتەیی و دەروونـی دراوە کەبۆتـە هـۆی شـکاندنی دەسـتێك و پەراسووەکانی. ڕەوانـەی زیندانـەکانی شاری (حلـە) کـراوە. لەسـاڵی ١٩٦٤دا، ئـازاد کـراوە. ڕۆژنامەنووسـی فەڕەنـسی (ئـەریك ڕۆلاو Eric Rouleau)، کەلەسـاڵی ١٩٦٤، بەمەبەسـتی ئامـادەکردنی راپۆرتێـك لەسـەر شۆڕشـی کوردسـتان، هاتۆتـە کوردسـتان، سـاڵح یوسـفی بینیـوە. پاشـان راپۆرتەکـەی لەڕۆژی ١٩٦٤/٧/٨، لەڕۆژنامەی (لۆمۆند)، بڵاو کردۆتەوە. ئەو لەراپۆرتەکەیدا نووسیویەتی: ساڵح یوسفی یەکێکە لەنوێنـەرانی کـورد لەبەغـدا. مرۆڤێکی بـاڵا بـەرز و لاوازە. لـەرێگای سـەیرکردنی چـاوەکانییەوە، خـەمێکی قـوڵ دەخوێندرێتەوە... یەکێك بوو لەو کەسانەی کەئەندامی وەفدی بـاڵای شۆڕشـی کـورد بـوو، بەعـسییەکان لـەحوزەیرانی رابـردوو- ١٩٦٤-دا، زینـدانیان کـرد و بەدڕندەترین شێوە ئازاری جەستەیی و دەروونیان داوە... لەگـەڵ ئـەم ئـازار و ئەشـکەنجەدانە بێبەزەییانـە، وەك هەنـدێك لەشـاهیدحاڵەکان دەڵـێن: وای لەبەشێك لەجەلادەکان کـردووە کەفرمێـسکی بـۆ بڕێـژن... لەگـەڵ ئـەم هـەموو ئازاردانەش، ناوبراو، ئازایانە بەرگەی گرتووە[٤٢٦].

دوای نـەمانی عەبدولـسەلام عـارف لـە ١٩٦٦/٤/١٣ و هاتنـە سـەر کـاری (عەبدولڕەحمان عارف)ی برای، حکومەت جارێکی تر داوای دانوستاندن لەکورد دەکـات. لـە ١٩٦٦/٦/٢٢، وەفـدی شـۆڕش بەسـەرۆکایەتی حـەبیب کـەریم و ئەندامێتی: (ساڵح یوسفی و موحسین دزەیی و عەلی عەبدوڵڵا)، دەچنە بەغدا و، لەگـەڵ دەسـەڵاتداران، کۆدەبنـەوە. لـە ١٩٦٦/٦/٢٩دا، رێککـەوتنێك و ئاگربەسـت، رادەگەیـەنرێت. دوای ئـەم رێککەوتنـە، لەسـاڵی ١٩٦٧، بەدەسـت پێشخەری ساڵح یوسفی، ڕۆژنامـەی (التـآخی)، لەبەغـدا دەردەچێت و، نـاوبراو یەکێك بووە لەو کەسانەی کـەبێ پـسانەوە کـاری بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشەی کورد بەرێگای ئاشتی و رێککەوتننامەی یازدەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠، کردووە.

دوای مـۆرکردنی ئـەم رێککەوتننامەیـە، چـەقی قورسایی خـەباتی یوسـفی، لەناو شاری بەغدا بووە. لەم ماوەیەدا، کۆمەڵێك ئەرك و لێپرسراویەتی لەئەستۆ گرتووە. لەوانە:

- لە ١٩٧٠/٣/٢٩، بۆتە وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری کورد.

- جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی هاوکاری و دۆستایەتی عێراق- سۆڤیەت.
- بەرپرسی لقی (٥)ی پارتی لەبەغدا.
- ئەندامی ئەنجوومەنی ئاشتی و هاوکاری جیهان.
- ئەندامی ئەنجوومەنی ئاشتی و هاوکاری لەعێراق.
- ئەندامی کۆمیتەی ئاشتی بۆ جێبەجێ کردنی خاڵەکانی رێککەوتننامەی ئازار.
- ئەندامی ئەنجوومەنی نەخشەکێشانی پەروەردەیی.
- بەرپرسی سەرپەرشتیکردنی رێکخراوی یەکێتی قوتابیان و لاوانی دیموکراتی کوردستان.
- بەرپرسی سەرپەرشتیکردنی سەندیکای کرێکاران و یەکێتی جوتیارانی کوردستان.

هەروەها کۆمەڵێك ئەرکی رۆشنبیری و ئەدەبی و رۆژنامەگەریی لەدوای یازدەی ئازاری ١٩٧٠، لەئەستۆ گرتووە، لەوانە:

- سەرنووسەری رۆژنامەی (التآخی)، بەزمانی عەرەبی.
- سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەی (برایەتی)، بەکوردی.
- سەرنووسەری گۆڤاری (رۆژی کوردستان)، بەزمانی کوردی و عەرەبی.
- سەرنووسەری گۆڤاری (ئەستێرە)، بەزمانی کوردی، بۆ منداڵان.
- سەرنووسەری گۆڤاری (نووسەری کورد).
- سەرۆکی کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لەبەغدا[٤٢٧].

سەیدا، دژی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی ئازاری (١٩٧٤) بوو. بەهەموو شێوەیەك نێوەندگیری لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەت دەکرد، تاوەکو بەندەکانی رێککەوتننامەکە، جێبەجێ بکرێ. ناوبراو دواخستنی جێبەجێ کردنی بەندەکانی رێککەوتننامەکەی بەباشتر دەزانی لەدووبارە هەڵگیرساندنەوەی شەڕ. هەر ئەم نیەت پاکی و ئاشتیخوازییەی وای لەحکومەت کردووە کەهەوڵی لەخشتە بردنی بدەن و لەسەرکردایەتی پارتی و شۆڕشی کوردستان، دووری بخەنەوە. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستەیان، لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٤ و پێش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ، (نەعیم حەداد)، کەئەوکات یەکێك

بـووه لەسـەرکردە باڵاکـانی بـەعس و حکومـەت، داوا لەیوسـفی دەکـات، واز لەسـەرکردایەتی پـارتی بهێنێـت. ئـەوکات، حکومـەت ئامادەیـە، چ پۆسـتێکی وزاری، دەخوازێت، ئەوان پێیدەدەن. لەبەرامبەر ئەم داوایەی (نـەعیم حـەداد)، یوسـفی وەڵامـی دەداتـەوە و دەڵێـت: کاکـە نـەعیم، هەرچـەندە ئێـستاکە تـۆ ئەنـدامی سـەرکردایەتی شـۆڕش و سـەرکردایەتی هەرێمایـەتی حزبـی بـەعس و، هــاوڕێی گیــانی بــەگیانی لێپرســراوەکانی تــری، ئــەوجا، زۆر جــاران گــوێم لـەهاوڕێکانت بـووه کـەپێت دەڵـێن: تـۆ بەبنەچـە عێراقـی و عـەرەب نیـت و ئەحوازی، واتـە ئێرانیـت... ئەگـەر هـاتوو مـن خیانـەتم کـرد و، پۆسـتم لـەئێوە وەرگـرت، لەشـۆڕش و حـزب و میللەتەکـەم جیـا بوومـەوە، کەلەبنەچـەکەوە کـوردم، ئـەدی چـی بـەمن دەڵـێن؟! لـەم کاتـەدا، نـەعیم حـەداد، بێـدەنگی هەڵبژێرێت(٤٢٨).

پـاش نـسکۆی ١٩٧٥، پێـچەوانەی زۆربـەی سـەرکردە دیارەکـانی شـۆڕش، گەڕانەوە بۆ عێراق هەڵدەبژێرێت. ئەوەندەش بڕوای بەخۆی هەبوو کەحکومـەت گـوێی لێـدەگرێت و، دەتوانێـت شـتێك بەشـتێك بکـات. کەدەگەڕێتـەوە بەغـدا، لێناگەڕێن بچێتەوە مـاڵی خـۆی و، لـەهوتێلێك دەسـت بەسـەری دەکـەن. دوای ئەوەی خانەوادەکەشی لەئێران (نەغەدە)وە دەگەڕێنەوە بەغـدا، ئینجـا ڕێگـای پێدەدەن بگەڕێتەوە سەر ماڵ و حاڵی خـۆی، بـەڵام لـەژێر چاودێرییەکی چـڕی دەزگاکانی ڕژێم. ناوبراو، دەستبەرداری هەوڵەکانی نابێـت، لەماڵـەوە نامەیـەکی دوور و درێـژی چـل لاپـەڕەیی، بـۆ سـەرۆك کۆمـار (ئەحمـەد حەسـەن بـەکر)، دەنووسێت. لەنامەکەدا، باسی رابردوو و تێکۆشانی خۆی لەدژی حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق بەحکومەتەکەی ئێستاشەوە، دەکات... لەگەڵ ئەمەشدا، چەندین ڕێگا چارە بـۆ چارەسـەر کردنـی کێـشەی کـورد، دەخاتـەڕوو... بـەڵام لەبەر بوغرایی و نەشئەی سـەرکەوتن، ڕژێـم گـوێ بـەداواکانی نـادات و نامەکـە فەرامۆش دەکات(٤٢٩).

لەگەڵ فەرامۆش کردنی داواکانیشی، ئەو هەر لەهەوڵەکانی بەردەوام دەبێت. بۆیـە لەگـەڵ هاوڕێکـانی، سـەرەتای سـاڵی ١٩٧٦، ڕێکخـراوی (بزوتنـەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردسـتان)، دادەمـەزرێنێت، تـاوەکو لەچوارچـێوەی

ئەم ڕێكخراوەدا، هەوڵەكانی چڕتر بكاتـەوە و، داوا و خواستـەكانی، بگەیەنێتـە دەسەڵاتداران.

ئەوان (حكومەت)، دەیانویست سەیدا وەك هەموو ئەو كوردانـەی كەلەبەغـدا لـەژێر نـاوی پـارت و ڕێكخـراوی كارتۆنیـدا، كـار دەكـەن، لێ بكـات... یـان، پۆسـتێكی وزاری بـدەنێ و، بێـدەنگی بكـەن. نـاوبراو لـەنێوان سـاڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ لەبەغدا ژیابوو. چەندین پۆستی گرنگی هەبوو، بەپۆسـتی وەزیریـشەوە، پەیوەندییەكی باشی لەگەڵ سـەرۆك كۆمـار (ئەحمـەد حەسـەن بـەكر)، هـەبوو. بۆیە، سەرۆك كۆمار داوای لێدەكات كەیـەكێك لـەم پۆسـتانە (سـەرۆكی دیـوانی سـەرۆكایەتی كۆمـار، سـەرۆكایەتی ئەنجوومـەنی ڕاپەڕانـدنی ناوچـەی حـوكمی زاتـی، پۆسـتی سـەفیری عێـراق لەیـەكێك لەوڵاتـەكان)، هەڵبـژێرێت، بـەڵام ئـەو هـەموویان ڕەت دەكاتــەوە و، وەڵامیــان دەداتــەوە: تــەنها داواكـاریم ئەوەیـە كەنەتەوەكـــەم بـــەئازادی و یەكـــسانی لەســـایەی هاتنـــەدی ئۆتۆنۆمیـــەكی ڕاستەقینەدا، بژیت[٤٣٠].

سەیدا، لەبەر ئەوەی پێشتر چەندین پۆستی حكـومی و حزبـی و ڕۆشـنبیری هەبوو، پەیوەندییەكی باشـی لەگـەڵ باڵوێزخانـەكانی وڵاتـان لەبەغـدا، هـەبوو، بۆیە، كەكۆنگرەی لوتكەی عەرەبی لە ١٠/١٠/١٩٧٨ لەبەغـدا بەسـترا، لەترسـی ئەوەی نەوەك ناوبراو، لابەلا و لەپەراوێزی لوتكەكەدا، پەیوەندی بەكەسایەتی و لێپرسراوە عەرەبەكانەوە بكات و داوایان لێبكات كەفشار بخەنە سەر حكومـەت بۆ دۆزینەوەی ڕێگـا چـارەیەك، چـەند هەفتەیـەك، پـێش بەسـترانی كـۆنگرە و، هەفتەیـــەكیش دوای تـــەواو بـــوونی، دائـــیرەی ئـــەمنی بەغـــدا، زینـــدانی و دەستبەسەری دەكات[٤٣١].

دوای ئـەوەی لەكودەتایـەكی سـپیدا، (ئەحمـەد حەسـەن بـەكر) لادەدرێ و (سەدام حوسێن)، دەبێتە سەرۆك كۆمار، سەدام، چەند گەشتێك و سەردانێك بۆ كوردستـان دەكات، بـەگفت و ڕەفتـار ئـەوە نیـشان دەدات كـەگرنگی بـەكورد و ناوچەی حوكمی زاتی كوردستان، دەدات. لەم ڕوانگەیەوە، سەیدا، بەئومێدێكی زۆرەوە، یاداشـتنامەیەكی یـازدە لاپـەڕەیی بـۆ سـەدام حوسـێن دەنووسـێت و داوای لێـدەكات دامودەزگاكـانی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی پەرەپێبـدات و دەسـت

هـەڵبگرن لەتێکـدان و ڕاگواسـتنی دێهاتـەکانی کوردسـتان. کـاتێکیش کەلـە ١٩٨٠/٩/٢٢، شەڕی عێراق– ئێران، هەڵدەگیرسێت، ڕژێـم داوا لەسـەیدا دەکـات دژی ڕژێمی تازەی ئێران، بابەت بنووسێت و، لەڕۆژنامەکانـدا، بـڵاوی بکاتـەوە. ئەو ناچێتە ژێر باری ئەم داوایە و ئامادە نابێت داخوازییەکانی ئـەوان جێبـەجێ بکات(٤٣٢).

سەیدا، هەرچەندە دامەزرێنـەر و بزوێنـەری سـەرەکی بزوتنـەوە بـوو، بـەڵام هاوڕێکانی، بەتایبەتیش ئەوانەی شاخ، زۆر گوێڕایەڵی نەبوونە.. ئـەو هەمیـشە لەنامەکانیدا، ڕێنمایی ئەوەی دەکردن کـەواقیعی بـن و واقیعیانـەش کۆمـەڵگای کوردی، بخوێننەوە... دروشمێك بەرز بکەنەوە، کەکۆمەڵگەی کـوردی بتوانێـت ئیستیعابی بکات. لەنامەکانیدا، داوای ئەوەی لێدەکردن کەواز لەبەرزکردنـەوەی چمکی (سۆسیالیستی زانستی)، بهێنن...

لەرۆژی ١٩٨١/٤/١٦، واتە: بیست و شەش (٢٦) ڕۆژ، پێش بەسـتنی یەکـەم کۆنگرەی حزب لە ١٩٨١/٥/١٢دا، ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی بەدەستخەتی خۆی بـەزمانی عـەرەبی بـۆ نـاردوون و، ڕێنمـایی کـردوون کـەواز لـە (سۆسیالیـستی زانـستی) بهێـنن و، حزبەکـە تووشـی لـێکترازان نەکـەن. گـوێی لێنـەگیراوە و، ڕێنوێنییەکانی فەرامۆش کراوە.

ڕژێـم هەسـتی بـەجموجۆڵ و چـالاکی و داوا ئاشـکراکانی دەکـرد، بۆیـە: سـەرەڕای چـاودێری ئاشـکرا و کـۆنترۆڵ خـستنە سـەری، بـەنیازی زانیـاری کۆکردنـەوە و، ناسـینی میوانـەکانی، خـەڵکی نزیـك لـەخۆی، بـەبیانووی جـۆر بەجۆرەوە، دەناردە لای... بۆ ئـەم مەبەسـتە، زۆر جـاران گـەنجێکی پۆشـتە و ڕێکوپێك، بەبیانووی ئەوەی کەدەیەوێت نامەی ماجستێر لەسەر رۆژنامەگـەریی بنووسێت و سوود لەئەزموونی سەیدا، وەربگرێت، سەردانی ماڵەوەی کردووە... ڕۆژێکیان، لەپێش چاوی میوانەکان، سەیدا، بێ پێچ و پەنا بەگەنجەکە دەڵێت: براکـەم، مـن دەزانم تـۆ لەلایـەن حکومـەت و دائـیرەی ئەمنـەوە ڕاسـپێردراوی کەچاودێری من بکەیت... بیروبۆچوونی من دەربارەی ڕۆژنامەگەریی، زۆر ڕوون و ئاشکرایە و، هەموو خەڵکیش ئەوە دەزانن، شتێکی تـازەم پـێ نییـە... دوای ئـەوەی کەگەنجەکـە دەڕوات، یـەکێك لەمیوانـەکانی کەلەدانیـشتنەکەدا بـووە،

بەسەیدا دەڵێت: نەترسایت کەوا بەراشکاوی وەڵامی ئەم گەنجەت دایەوە؟!
سەیدا دەڵێت: لەچارەنووسی خۆم ناترسم، بەڵام ئەوەم پێناخۆش بوو کەئەو میوانم بوو، وام پێ گوت[٤٣٣].

چەند مانگێك پێش شەهیدکردنی، بارزان تکریتی، کەئەوکات سەرۆکی موخابەرات بووە، سەردانی ماڵەکەی کردووە و، لەبارەی شەڕی عێراق– ئێران، داوای هەڵوێست و روونکردنەوەی، لێکردووە.. سەیدا، لەوەڵامدا پێی گوتووە: من لەسەر ئەم بابەتە، هیچ را و بۆچوونێکم نییە، بەڵام لەبارەی پرۆسەی تەهجیر و تەعریب کەلەزاخۆوە تا خانەقینی گرتۆتەوە، دەتوانم رای خۆم بخەمەڕوو... بەم وەڵامە، (بارزان تکریتی)ش، تووشی سەرسوڕمان بووە و یەکسەر رۆیشتووە[٤٣٤].

سەیدا، نامە و رێنماییەکانی، لەرێگای (کاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژار و محەمەد شاکەلی)یەوە، بۆ سەرکردایەتی شاخ، ناردووە. بۆ سەلامەتی و ئاشکرا نەبوونی لەئەگەری گیرانی نامەکان و، کەوتنە دەست رژێم، ناوی خواستراوی: (خاڵ سلێمان، ئەرشەد، رەفیق نادر)، بەکارهێناوە[٤٣٥].

رژێم، کەلەدەستەمۆ و رامکردنی سەیدا نائومێد دەبێت، پەنا بۆ تیرۆرکردنی دەبات. بۆ ئەم مەبەستە، دەزگاکانی ئەمن و موخابەرات، مفەوەزێکی سەربەخۆیان، لەجل و بەرگی پۆستەچی، بۆ ماڵەکەی دەنێرن. کاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆی رۆژی ١٩٨١/٦/٢٥، پۆستەچی لەدەرگا دەدات. یوسفی، خۆی دەرگاکەی لێدەکاتەوە و، پۆستەکە، کەلەشێوەی نامەیەکدا بووە، لێوەردەگرێت... بەچەند خولەکێك دوای رۆیشتنی پۆستەچییەکە، سەیدا، نامەکە دەکاتەوە و، بەروویدا دەتەقێتەوە. تومەز چەند کەسێك لەناو پیکابێك لەپشت ماڵی سەیدا بووینە و، چاوەڕێی ئەوەیان کردووە کەپۆستەچییەکە، نامەکە بداتە دەست سەیدا. کەسەیدا وەریگرتووە و ئیمزای کردووە، ئەوان لەدوورەوە، لەرێگای کۆنترۆڵەوە، نامەکەیان تەقاندۆتەوە. سەیدا کەوتۆتە سەر زەوی. ئەو دەستەی کەنامەکەی پێ کردۆتەوە، زۆر بەخەستی بریندار بووە. خێزان و کچەکانی، هاواریان کردووە و دراوسێکانیان بەفریایان کەوتوون... بەرێکەوت، ئۆتۆمبیلێك بەوێدا تێپەڕیوە، رایان گرتووە، سەیدایان خستۆتە

ناوی و بۆ نەخۆشخانەی (یەرموك) و، بەشی فریاکەوتنیان، بردووە. لەوێ، بردوویانەتە ژووری نەشتەرگەریی و، ئەوەندەی نەبردووە، گیانی سپاردووە. لەسەر داوا و وەسیەتی خۆی، رۆژێك دوای گیان لەدەستدانی، تەرمەکەیان بۆ زاخۆ بردووە و، لەژێر چاودێرییەکی چڕی دائیرەی ئەمن، بەخاك سپێردراوە. دوای چەند مانگێك، خانەوادەکەشی بەیەکجاری بەغدایان بەجێ هێشتووە و گەڕاونەتەوە شاری زاخۆ[٤٣٦].

## ٢- رەسوڵ مامەند

لەساڵی (١٩٤٤)، لەگوندی (بەردەشان)ی ناوچەی مەرگە، لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، لەبنگرد و قەڵادزێ و شاری سلێمانی، تەواو کردووە. لەکۆلیژی ماف وەرگیراوە، تا قۆناغی سێی خوێندووە. لەبەر زروفی سیاسی، وازی لەخوێندنی زانکۆ هێناوە. لەساڵی ١٩٦١، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. لەرێکخراوە پیشەییەکانیش بۆتە ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان. (لەساڵی ١٩٦٧ لێپرسراوی ناوچەی قەڵادزێ بووە... ئەوکاتە، لیژنەی ناوچە لەچۆم خڕکە بووە، لەپشت قەڵادزێ)[٤٣٧].

لەکۆنگرەی شەشی پارتیدا، ناوبراو یەکێك بووە لەئەندامەکانی کۆنگرە و لەلیژنەی ئامادەکردنی کۆنگرە بووە. لەساڵی ١٩٦٩دا، لەخولێکی پێگەیاندنی کادیرانی پارتیدا، بۆتە یەکەمی سەر خولەکە. دوای رێککەوتننامەی یازدەی ئازار، بۆتە لێپرسراوی کاروباری رێکخستن لەسلێمانی. دواتر، بۆ هەڵەبجە و دوکان گواستراوەتەوە. لەساڵی ١٩٧١دا، بۆتە کارگێڕی لقی سێی پارتی لەشاری کەرکوك. لەدوای نسکۆی ١٩٧٥، لەگەڵ چەند کادیر و سەرکردە و فەرماندەیەکی پێشمەرگە، لەناوچەکانی پێنجوین و بناوە سووتە، هەوڵیانداوە درێژە بەخەبات بدەن و تەسلیم بەرژێم نەبنەوە. هەوڵەکەیان، بێ ئاکام بووە. دوای ئەوە، چۆتە رۆژهەڵاتی کوردستان و لەشاری ورمێ، گیرساوەتەوە. لەشارەکانی رۆژهەڵات، لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا، بەشداری چەندین کۆبوونەوەی کردووە، بەمەبەستی دروستکردنی پارتێکی تازە. دوای ئەمە، گەڕاوەتەوە

عێراق. یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان.

ناوبراو، یەکێك بووە لەو سەرکردانەی بزوتنەوە کەلایەنگیری دەست پێکردنەوەی خەباتی چەکداری بووە. لەگەڵ یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە، چۆتەوە شاخ. رەسوڵ مامەند، لەگەڵ سالح یوسفی و کاردۆ گەلاڵی و عەلی هەژار و چەندین کادیر و فەرماندەی تر، لەگەڵ ئەو رایەدا نەبووە کەبزوتنەوە پەیوەندی بە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)ەوە بکات... ئەوان، پێیان وابوو، (بزوتنەوە)، وەك هێڵی سێیەم وایە، نە جەلالی و نە مەلاییە. ئەگەر خۆ بدەنە پاڵ یەکێتی، دووبارە کارەساتی ململانێی ئەم دوو باڵە زیندوو دەکەنەوە و، دەبنە هۆکار و پارسەنگێك بۆ شەڕی ناوخۆ، بەڵام لەژێر هەوڵ و فشاری عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید سەعید و عومەر دەبابە و چەند کادیرێکی تر، کەپێشتر لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی (جەلالی)دا بووینە، بەوە رازی بووە کەوەك رێکخراوێکی سەربەخۆ بچنە ناو نیمچە بەرەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).

ماوەی ئەم سێ ساڵەی کەلەگەڵ یەکێتیدا بووینە، هەردەم کێشەیان لەگەڵ سەرکردەکانی کۆمەڵە و خودی مام جەلال دا، هەبووە. چونکە پێیان وابووە:

- یەکێتی لەبەر ئەوەی لەسوریا دامەزراوە و لەژێر کاریگەری سوریا و حزبی بەعس هەرێمی عێراقدا، بووە، بۆیە، دروشمی شۆڕشی سەرتاسەری عێراقی هەڵگرتووە و، داوای روخاندنی رژێمی کردووە. کەچی رەسوڵ مامەند و بزوتنەوە و هاوبیرەکانی پێیان وابووە، رژێمێکی وا، کەرۆژهەڵات و رۆژئاوا، هاوکاری دەکەن، بەچەند رێکخراوێکی تازە دامەزراوی ئۆپۆزسیۆنی کورد، ناڕوخێت. جگە لەمەش، روخاندنی رژێم، ئەرکی کورد نییە.
- ناوبراو و هاوبیرەکانی، جەختیان لەسەر سەربەخۆیی بزوتنەوە دەکردەوە، خۆیان بەنەیاری پارتی دیموکراتی کوردستان، نەدەزانی. هەوڵیاندەدا، هاوسەنگیەك لەنێوان ئەو دوو باڵە نەیارە رابگرن و نەبنە پارسەنگێك بۆ هیچ لایەکیان. کەچی یەکێتی، پارتیان بەدوژمن و نەیاری پلە یەکی خۆیان دەزانی.

پـێش ڕوودانـی ڕووداوەکـانی هـەکاری لەسـاڵی ١٩٧٨دا، ڕەسـوڵ مامەنـد، ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بوو، بەڵام لەبەر کێشە و گرفتـەکانی لەگـەڵ سەرکردایەتی یەکێتی، دەستی لەمەکتەبی سیاسـی کێشایەوە... ئـەو، هـەوڵی دەدا، هەرچی زووتره بزوتنـەوە لەبـەرەی (یـەکێتی)یـەوە، دەربـچێت و نەبێتـە سووتەمەنی و قوربانی ململانێی مێژوویی هەردوو باڵەکەی خـەباتی کوردایـەتی، بەڵام لەبەر عەلی عەسکەری و د. خالیـد، نەیـدەتوانی ئـەم هـەنگاوە هـەڵێنێت. دوای شەهیدبوونی ئەم دوو سـەرکردەیە لەهـەکاری، ڕەسـوڵ مامەنـد، دەسـتی واڵا بوو. دوای (٦-٧) مانگ، لەنەورۆزی ١٩٧٩دا، لەگـەڵ زۆربـەی هـەرە زۆری بزوتنەوە (بەسەرکردایەتی و ڕێکخستنەوە)، لەیەکێتی، جیابوونەوە.

لـەکۆنگرەی یەکـەمی حزبـی سۆسیالیـستی کوردسـتان، بۆتـە سـکرتێری سەرکردایەتی شاخی حزب. دوای شەهیدبوونی سـاڵح یوسـفی لـە ١٩٨١/٦/٢٥، بۆتە سکرتێری حـزب. دوای ئەنفالـەکان و بـێ هێـز بـوونی خـەباتی چـەکداری، لەســاڵی ١٩٨٩دا، چــۆتە ئــەوروپا و، ناوەنــدێکی ســەرکردایەتی حزبــی سۆسیالیستی لەوێ دامەزراندووە. لە ١٩٩٠/١١/١٢دا، گەڕاوەتـەوە کوردسـتان. لەکاتی ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١دا، سەرپەرشتی قوڵی ڕاپەڕینی ڕانیەی کردووە. لەدانووستاندن لەگەڵ ڕژێم، ئەندامی دەستەی وتوێژ بووە. لەکۆنگرەی دووەمی حـزب لەنۆڤێمبـەری ١٩٩٢دا، دووبـارە بەسـکرتێری حـزب، هەڵبژێردراوەتـەوە. لەشوباتی ١٩٩٣، چوونەتەوە نـاو یـەکێتی و بۆتـە کـارگێڕی مەکتـەبی سیاسـی یەکێتی. لە ١٩٩٣/١٢/٢٢دا، بۆتە ئەندامی دەسـتەی سـەرۆکایەتی هـەرێم. ئـەم دەستەیە لەهەشت کەسایەتی پێك هـاتبوو، کەمەسـعود بـارزانی و مـام جـەلال، یەکێك بوون لەئەندامەکانی ئەم دەسـتەیە، لـە ١٩٩٤/٤/١٢، لەلەنـدەن، کۆچـی دوایی کردووە. لە ١٩٩٤/٤/٢٤دا، تەرمەکـەی گەیـشتۆتەوە دەروازەی سـنووری ئیبراهیم خـەلیل. لـە ٤/٢٥دا، لـەڕێوڕەسمێکی شایـستەدا لەگوندەکـەی خـۆی، زێدی باوك و باپیرانی (بەردەشان)، بەخاك سپێردراوە.

ناوبراو، مرۆڤێکی کەمـدوو و میـانڕەو بـوو. لەگەرمـەی تەنگژەکانـدا، هـەوڵی دەدا پارسـەنگی هێـز و هاوکێـشەکان، بەهاوسـەنگی ڕابگرێـت. لەگـەڵ ئـەوەی کەسۆسیالیست دۆستایەتیەکی بەهێزی لەگـەڵ ئێـران هـەبوو، لەهـەمان کاتـدا،

ئەو دۆستایەتییەی لەسەر حسێبی خەباتی پارتەکانی رۆژهەلاتی کوردستان نەبوو. لەم رووەوە، (عەبدوڵڵا حەسەن زادە)ی سکرتێری ئەوسای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لەرۆژی ١٩٩٤/٤/٢٥، لەسەر گۆڕی رەسوڵ مامەند، وتارێکی خوێندەوە. لەوتارەکەیدا گوتی: (دەخوازم ئەلقەیەکی نیوە نهێنی و ئاشکرا لەخەبات و تێکۆشانی کاك رەسوڵ مامەندەوە پەیام بکەم. لەساڵی ١٩٦٨ەوە، من کاك رەسوڵ مامەند دەناسم، لەو ساتە تا ئێستا یەکێك بووە لەیاوەران و هاوسەنگەرانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و هەموو تێکۆشەرانی کورد لەکوردستانی ئێران. راستە بەهەموو شانازییەکەوە دەڵێم کاك رەسوڵ لەهەر سەنگەرێك دا بووبێت حزبەکەی و رێکخراوەکەشی دۆست و پشتیوان و یاوەر بووە بۆ حزبی دیموکراتی کوردستان و بزوتنەوەی گەلی کورد لەکوردستانی ئێراندا)[٤٣٨].

جگە لەقسەکانی عەبدوڵڵا حەسەن زادە، بەشی زۆری حزب و رێکخراوەکانی باکور و رۆژئاوای کوردستان و حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و حزبی شیوعی عێراق و...تاد، ئەو راستیەیان دووبارە کردەوە کە: (رەسوڵ مامەند، هەموو ژیانی خۆی لەپێناوی رزگاری گەلەکەی خەرج کردووە، وەسەرکردەیەکی پشوو درێژ و ماندوو نەناس، بووە)[٤٣٩].

### ٣- تاهیری عەلی والی

لەساڵی ١٩٣٨، لەشاری سلێمانی لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە. لەساڵی (١٩٥٧)، لەکۆلیژی سەربازی وەرگیراوە. لەساڵی (١٩٦٠)دا، خوێندنی سەربازی تەواو کردووە و بۆتە ئەفسەر لەسوپای عێراقدا. کاتێك کەشۆڕشی ئەیلول، ساڵێك لەتەمەنی تێنەپەڕیبوو، ناوبراو لەساڵی ١٩٦٢دا، پەیوەندی بەهێزەکانی پێشمەرگەوە کردووە و، لەناوچەی ئاکۆیان، بۆتە سەرلق. هەر لەم ساڵەدا، کراوە بەفەرماندەی بەتالیۆنی ناوچەی ئاکۆیان و، دواتر بۆتە فەرماندەی هێزی سەفین. لەساڵی (١٩٦٥)دا، بەپلەی فەرماندەی هێزی قەرەداغ بۆ ناوچەی قەرەداغ، گواستراوەتەوە. بەشداری چەندین رووبەڕووبوونەوە و شەڕی

بەرفراوانی کردووە. لەوانە: شەڕەکانی ئاکۆیان، رواندز، سەفین، هەندرێن، گەرمیان، سەنگاو، رێگای چەمچەماڵ– کەرکوك...تاد.

دوای رێککەوتننامەی یازدەی ئازار، بۆتە فەرماندەی فەوجی حەوتی پاسەوانی سنوور لەسوپای عێراق. دوای ئەوەی کەحکومەت لەجێ بەجێ کردنی رێککەوتننامەی یازدەی ئازار پەشیمان دەبێتەوە و، شەڕ هەڵدەگیرسێتەوە، ملازم تاهیر، پەیوەندی بەشۆڕش کردۆتەوە، بۆتە جێگری فەرماندەی هێزی خەبات. دوای نسکۆ، بەشداری کۆبوونەوەکانی رۆژهەلاتی کوردستانی کردووە و لەهەوڵی ئەوەدا بووە دەستبەرداری شۆڕش و بەرگری نەبێت. لەگەڵ هاورێکانی دەگەڕێتەوە عێراق. رژێم بۆ شاری عیمارە، دووری دەخاتەوە. ناوبراو، یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی بزوتنەوە. لەگەڵ یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە، چۆتەوە شاخ. دوای کۆبوونەوەکانی یەکێتی لەساڵی ١٩٧٧دا، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. لەساڵی ١٩٧٨، لەهەکاری بەدیل گیراوە. لەنەورۆزی ١٩٧٩، لەگەڵ باڵە سەرەکییەکە، لەیەکێتی چۆتە دەرەوە. لەکۆنفرانسی یەکگرتنی بزوتنەوە و لیژنەی کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی، بۆتە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان– حسیك). لەکۆنگرەی یەکەمی حزبدا، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، دواتر ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

فاتح رەسوڵ دەنووسێت: (... کاك تاهیری عەلی والی ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی حسك لەگەڵ حەفت تێکۆشەر کەیەکێکیان شەهید کاوەی شێخ لەتیف حەفید دەبێ لەرۆژی ١٩٨٢/١٢/٢دا... دەکەونە بەر تەوژمی گێژەلووکەی بارینی بەفرێکی زۆر و سارد و شەهید دەبن)[٤٤٠].

بەلام لەراستیدا، شەهیدەکان حەوت کەس نەبوونە، وەك سەرچاوەی ناوبراو باسی دەکات، بەڵکو یازدە کەس بوونە. ئەمەش بەشێکە لەناوی شەهیدەکان: (تاهیری عەلی والی، ملازم عوسمان سەعید والی، نووسەر و شاعیر عەبدولکەریم عەبدوڵلا ناسراو بەسۆران، کامەران سەعید والی، ئەنوەر مەحمود، یاسین رەمەزان کەردزی، کەمال عەبدوڵلا، کاوەی شێخ لەتیف، زەکی، جەبار).

ئەم مەفرەزەیە، بەئامانجی جێ بەجێ کردنی کاروباری سیاسی و

پێشمەرگایەتی و پەیوەندییە نیشتمانییەکان، دەیانویست لەقەندیلەوە ئاودیوی ڕۆژهەڵات ببن و، لەوێشەوە بچنە ناوچەی سلێمانی. لەڕێگادا، بەهۆی باهۆز و گێژەلووکەی بەفر، دەکەونە ناو زەنە بەفر و، شەهید دەبن.

بنەماڵەی ملازم تاهیر، بنەماڵەیەکی تێکۆشەر و ناسراوی شاری سلێمانی و کوردستانن. جگە لەم شەهیدانە، کۆمەڵێك شەهیدی تریان، لەڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی کوردستاندا، بەخشیوە. لەوانە: (شەهید رەئوف بەگ، لەکارەساتی هەکاری شەهید بووە. ئەنوەر سەعید والی لەگوندی داری قەڵاتێی ناوچەی شارەزوور، بەدەستی جاشەکانی زەڕایەن، شەهیدکراوە. بایز ئەحمەد والی لەگوندی بەردەڕەشی ناوچەی شەمزینان لەباکوری کوردستان، لەساڵی ١٩٧٧، بەدەستی سەرکردایەتی کاتی پارتی، شەهید کراوە. شەهیدان: تاریق و شەماڵ لەگوندی بێسەڵمێن و تووەقوت لەشارەزوور بەدەستی یەکێتی شەهید کراون. شەهید ڕۆستەم مستەفا بەگ لەگوندی تەپەسەرقوڵەی شارەزوور بەدەستی جاشەکانی هەڵەبجە، شەهید بووە)[٤٤١].

## ٤- دکتۆر خالید سەعید

لەساڵی ١٩٣٤، لەشاری کۆیە لەدایك بووە. هەر لەم شارەدا، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە. بۆ بەردەوامی خوێندن چۆتە شاری کەرکوك و هەر لەوێ ئامۆژگای برین پێچی تەواو کردووە. لەسەرەتای تەمەنی هەرزەکارییەوە کەهێشتا زۆر منداڵ بووە، لەساڵی ١٩٤٨ پەیوەندی بەریزەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە، کردووە. لەدوای شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨، بۆتە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کۆیەی پارتی. لەساڵی ١٩٦٠، ژیانی هاوسەرێتی پێك هێناوە. لەگەڵ هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول، بۆتە پێشمەرگە. لەساڵی ١٩٦٣ بۆتە سەرلق. ئەوکاتە، بارەگای لق لەگوندی (حاجی قەڵا)ی سەر بە (کۆیە) بووە. لەساڵی ١٩٦٤ بەهەمان لێپرسراویەتیەوە، لەدەشتی کۆیە خەباتی کردووە، پاشان بۆتە فەرماندەی بەتالیۆن.

دوای ڕێککەوتننامەی یازدەی ئازار، تاوەکو ساڵی ١٩٧٤، لەشاری بەغدا نیشتەجێ بووە و لەنەخۆشخانەی (نەعمان)، بۆتە بەڕێوەبەری کارگێڕی ئەم

نەخۆشخانەیە. لەگەڵ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەساڵی ١٩٧٤، پەیوەندی بەشۆڕش کردۆتەوە. سەرەتا، وەك فەرماندەی بەتالیۆن، دواتر بۆتە فەرماندەی هێزی کۆسرەت. دوای نسکۆی ١٩٧٥، لەگەڵ هەڤاڵەکانی بەشداری چەندین کۆبوونەوەی لەشارەکانی نەغەدە و ورمێ و مەهاباد کردووە. دوای ئەوە، دەگەڕێتەوە عێراق و بۆ شاری بەغدا دوور دەخرێتەوە. لەگەڵ دامەزراندنی بزوتنەوە، پەیوەندی کردووە و بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی. لەگەڵ یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە، لە ١٩٧٦/٨/٨دا، چۆتەوە شاخ. لەدوای کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی لەپایزی ١٩٧٧، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی لەسەر پشکی بزوتنەوە.

لەبەهاری ١٩٧٨، بەمەبەستی چەك هێنان و پتەوکردنی پێگەی یەکێتی لەناوچەی بادینان، لەگەڵ هێزێکی زۆر، روو لەسنووری ئێران عێراق، عێراق– تورکیا، دەکات. لەلایەن هێزەکانی ئەوکاتی سەرکردایەتی کاتی، بەدیل دەگیرێ. لەرێککەوتی ١٩٧٨/٦/١٩، شەهید دەکرێت.

## ٥– عەلی عەسکەری

لەساڵی ١٩٣٧ لەگوندی (عەسکەر)ی ناوچەی ئاغجەلەر لەدایك بووە. سەر بەگروپی ئایینی (ئەهلی هەق– هەقە) بووە. مامی ناوبراو، (شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە)، شێخی گروپەکەیان بووە. لەسەرەتای پەنجاکانەوە کەلەشاری کەرکوك خوێندکار بووە، پەیوەندی بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە، کردووە. دواتر، پەیوەندی بەریزەکانی پارتیەوە کردووە. دوای شۆڕشی چواردەی تەموز، بۆتە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کەرکوکی پارتی. لەساڵی ١٩٦٠، لەکۆنگرەی پێنجەمدا، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی. لەکاتی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول، رۆڵێکی کارای لەرێکخستن و سەرپەرشتی کردنی هێزەکانی پێشمەرگە، گێڕاوە.

لەساڵی ١٩٦٢، بۆتە فەرماندەی هێزی خەبات. لەلێکترازانەکەی ١٩٦٤، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی بووە. لەپاش رێککەوتننامەی یازدەی ئازار، رۆڵێکی باش و بەرچاوی گێڕاوە بۆ ئاشتبوونەوە و یەکگرتنەوەی هەردوو

باڵەکەی پارتی. دوای نسکۆی ١٩٧٥، بەشداری کۆبوونەوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی کردووە. دوای ئەمە، گەڕاوەتەوە عێراق و بۆ باشووری عێراق قەزای (روفاعی)، دوورخراوەتەوە. لەکاتی دامەزراندنی بزوتنەوە (هەرچەندە ناوبراو ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر نەبووە)، بەڵام دواتر بۆتە یەکێك لەسەرکردە دیارەکانی ئەم ڕێکخراوە و لە ١٩٧٦/٨/٨، لەمیحوەری سلێمانیەوە، چۆتە شاخ. ناوبراو، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ (مام جەلال)دا، هەبووە. هەر ئەویش هۆکاری سەرەکی بووە لەبردنی بزوتنەوە بۆ ناو یەکێتی. لەم قۆناغەدا (١٩٧٦-١٩٧٨)، ناوبراو، لێپرسراوی فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بووە. سەرەڕای ئەوەی کەئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بووە، لەکۆبوونەوەکانی پایزی ١٩٧٧ی ناوچەی برادۆست، لەسەر پشکی بزوتنەوە، بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. سەرۆکی یەکەم شاندی یەکێتی بووە کەلەتشرینی دووەمی ١٩٧٧، بۆ دانووستاندن، چۆتە بەغدا. لەبەهاری ١٩٧٨، بەهێزێکی گەورە، بەئامانجی دانانی بارەگای مەکتەبی سیاسی لەبرادۆست و هێنانی وەجبەیەکی چەك کەبڕیار وابوو لەسوریاوە، بەناو خاکی تورکیا بگاتە هێزی پێشمەرگە، لە (قەڵادزێ)وە، بەرەو هەکاری بەڕێکەوتووە. دوای شەڕ و پێکدادان لەگەڵ هێزەکانی سەرکردایەتی کاتی پارتی، بەدیلی دەگیرێ. لە ١٩٧٨/٦/١٩، شەهید کراوە[٤٤٢].

## ٦- عەلی هەژار

عەلی عەبدوڵلا عەلی، ناسراو بە (عەلی هەژار)، لەساڵی ١٩٤٣، لەگوندی (عەوێنە)، لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٦٢، پەیمانگای مامۆستایانی لەشاری هەولێر، تەواو کردووە. بۆتە مامۆستا، پەیوەندی بەریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە. لەریزەکانی پارتیدا، کۆمەڵێك ئەرك و لێپرسراویەتی لەئەستۆ گرتووە، وەك: بەرپرسی یەکێتی جوتیاران، بەرپرسی لقی دووی پارتی لەهەولێر، بەرپرسی لق لەهیران و نازەنین، ئەندامی لیژنەی دانوستاندنی پارتی و حکومەت، ئەندامی لیژنەی ناوەندی). جگە لەم ئەرکە حزبیانە، بەشداری لەڕێکخراوە پیشەییەکانیشدا کردووە و بۆتە ئەندامی: (یەکێتی

نووسەرانی کورد، سەندیکای پارێزەران، یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد). لەگەڵ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٤، پەیوەندی بەشاخەوە کردووە. پاش نسکۆ یەکێك بووە لەو کەسانەی کەلێبڕاوانە، هەوڵی بەردەوامبوونی شۆڕشی داوە. لەهەموو کۆبوونەوەکانی رۆژهەڵات، بەشداری کردووە. بەنیازی خۆ رێکخستنەوە و دامەزراندنی حزبێکی تازە، لەگەڵ هاورێکانیدا، گەڕاوەتەوە عێراق. گەڕاوەتەوە کۆلیژی یاسا، کەپێشتر، لەبەر بەشداری کردنی لەهەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، نەیتوانیبوو تەواوی بکات. لەساڵی ١٩٧٦ خوێندنی تەواو کردووە و بۆتە پارێزەر. یەکێك بووە لەدامەزرێنەرانی بزوتنەوە. لەخەمی ئەوەدا بووە، کەهەردوو ئاراستەی باوی ناو سیاسەتی کوردی (جەلالی و مەلایی)، لەناو کۆمەڵگای کوردیدا کاڵ بکاتەوە و، ئاراستەی سێیەم دابمەزرێنێ. لێپرسراوی ناوەوەی هەموو رێکخستنەکانی بزوتنەوە، بووە. لە ١٩٧٩/٤/٩، لەژووری پارێزەرانی دادگای هەولێر، لەگەڵ کاردۆ گەلاڵی هاورێ و هاوخەباتی، لەلایەن دائیرەی ئەمنی هەولێرەوە، دەستگیر دەکرێت و شون بزر دەبێت.

محەمەد شاکەلی، هاورێی، دەربارەی رۆڵی ناوبراو، دەنووسێت: (شەهید عەلی هەژار تا کاتی گیران و بێسەروشوێن کردنی داینەمۆ و بزوێنەری یەکەمی کاروباری ناوخۆی بزوتنەوە و پەیوەندییەکان بوو. لەنێوان هەولێر و بەغدا و باشووری عێراق دا هەمیشە لەهاتووچۆ بوو. چەند هەڤاڵێکیش بۆ راپەڕاندنی ئەرکە زۆرەکان هاوکاریان دەکرد، شەهید کاردۆ گەلاڵی، یەکێك بوو لەوان)[٤٤٣].

## ٧- کاردۆ گەلاڵی

کاردۆ عەبدولقەهار مستەفا گەلاڵی، لەساڵی ١٩٥١، لەگوندی (کەردن)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە، لەدایك بووە. قۆناغەکانی خوێندنی لەناحیەی قوشتەپە و شاری هەولێر، تەواو کردووە. لەکۆتایی شەستەکاندا، پەیوەندی بەریزەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) و (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. لەساڵی ١٩٧٣، بۆتە لێپرسراوی بەشی راگەیاندنی لقی هەولێری یەکێتی قوتابیان. کەشۆڕش هەڵگیرساوەتەوە، لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا، چۆتەوە شاخ.

لەشاخ، لەلایەك سەرپەرشتی ڕێكخستنەكانی قوتابیانی كردووە، لەلایەكی ترەوە، وەك پەیامنێرێك، هەواڵ و چالاكییەكانی پێشمەرگەكانی دەشتی هەولێری ئامادەكردووە و، بۆ رادیۆی (ئیستگەی دەنگی كوردستانی عێراق)ی ناردووە. پێش هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشیش (١٩٧٤)، كۆمەڵێك چالاكی رۆشنبیری و ئەدەبی، ئەنجام داوە. وەك:

– كاتێك كەقوتابی دواناوەندی هەولێری كوڕان بوو، لەساڵی ١٩٧٢دا، لەگەڵ هاوڕێكانیدا، گۆڤارێكیان بەناوی (بیری نوێ)، دەركردووە.
– هەر لەم سەروبەندەدا، بەهاوبەشی بەشی راگەیاندنی لقی هەولێری یەكێتی قوتابیان، چەند ژمارەیەك لەگۆڤاری (دەنگی قوتابیان)یان، دەركردووە.
– لەساڵی ١٩٧٣، وەك پەیامنێرێك، لەرۆژنامەی (التـآخی)، رۆژنامەی (برایەتی)، كاری كردووە.

لەساڵی ١٩٧٢، لەكۆلیژی (یاسا)ی زانكۆی (موستەنسریە)، وەرگیراوە. بەهۆی دەست پێكردنەوەی شەڕ (١٩٧٤)، نەیتوانیوە بەردەوام بێت. كەشۆڕش دووچاری نسكۆ دەكرێت، ناوبراو، ئاوارەی شارەكانی رۆژهەڵاتی كوردستان، بووە. لەوێوە، لەگەڵ هاوڕێكانیدا، بەشداری چەندین چالاكی خۆڕێكخستنەوەی كردووە. بەنیازی دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێك بۆ بەردەوام بوون لەشۆڕش، دواجار گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامە كەبگەڕێنەوە عێراق و لەناو جەماوەرەوە، جارێكی تر دەست بەخەبات بكەنەوە. كەگەڕاوەتەوە عێراق، چۆتەوە زانكۆ. لەپەیوەندیدا بووە لەگەڵ هەڤاڵەكانی. ناوبراو، هەرچەندە كەلەگەڵ ئەو كۆبوونەوەیە نەبووە كەدامەزراندنی (بزوتنەوە)یان تێدا راگەیاندووە، بەڵام یەكێك بووە لەئەندامە نزیك و سەرەتاییەكانی بزوتنەوە. بۆتە ئەندامی سەركردایتی و، لەگەڵ عەلی هەژار، سەرپەرشتی ڕێكخستنەكانی ناوخۆی كردووە. ناوبراو، یەكێك بووە لەلایەنگرانی رەوتی چەپ و، دژی ئەوە بووە كەبزوتنەوە بچێتە ناو ینك. ئەوەشی لەخەمخۆری ئەوەدا بووە، كەدووبارە رەوتی جەلالی و مەلایی، زیندوو نەبێتەوە. لەساڵی ١٩٧٨، كۆلیژی یاسای تەواو كردووە. بیرۆی كردۆتەوە، بۆتە پارێزەر لەشاری هەولێر.

لەرۆژی ٩/٤/١٩٧٩، لەژووری پارێزەرانی دادگای هەولێر، لەلایەن دائیرەی

ئەمنی هەولێرەوە، لەگەڵ عەلی هەژار، گیراون و شون بزر کراون. دوای راپەڕین و دەست کەوتنی هەندێك بەڵگەنامە، ئاشکرا بووە کەلەرێکەوتی ١٩٨٣/٥/٢، لەسێدارە دراون. تا ئێستاکە، تەرمەکانیان، کەس نازانێت چی لێهاتووە و گۆڕی غەریبیان، کەوتۆتە کوێ وە؟! [٤٤٤].

کاردۆ، لەبواری نووسینیشدا، سێ کتێبی چاپکراوی هەیە کەئەمانەن:

- زێدەبایی، قانوونە بەناوبانگەکەی مارکس لەمەڕ ئابوری سەرمایەداریەوە، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٧، (٥٠) لاپەڕەیە.
- عەلی شون هەڵگر پسپۆڕێکی بەهرەوەر بوو، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٧٨، (٧٢) لاپەڕەیە.
- کاردۆ گەلاڵی نووسەر و پارێزەر و سیاسەتمەدار، ئیسماعیل تەنیا، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، (٩٦) لاپەڕەیە.

ئەم کتێبە، بریتییە لەکۆمەڵێك نووسین و شیعر و لێکۆڵینەوە، کەکاتی خۆی، (کاردۆ)، لەگۆڤار و رۆژنامەکاندا، بڵاوی کردۆتەوە. بەندە (ئیسماعیل تەنیا)، کۆی کردۆتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و، ئامادەی چاپکردنی کردووە.

## ٨- مەلا ناسیح

ئیسماعیل خدر عومەر، یان سەید ئیسماعیل کوڕی حاجی مەلا سەید خدری کوڕی سەید عومەر دۆڵپەمۆیی، ناسراو بە (مەلا ناسیح)، لەساڵی ١٩٣٢، لەگوندی (لهێبان)ی ناوچەی کەندێناوە، لەدایك بوە. سەرەتا، لەحوجرە و مزگەوتەکانی کوردستاندا، دەستی بەخوێندنی ئایینی کردووە. دوای ئەوە ئامۆژگای ئیسلامی لەشاری بەغدا، تەواو کردووە. لەقەزای توزخورماتوو، وەك ئیمام تابووری عەسکەری، دامەزراوە. دوای ئەوە، بۆتە پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی (کوران)ی سەر بەشارۆچکەی عەنکاوە. لەهەرەتی گەنجێتیدا، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. وەك پێشمەرگەیەك بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە و ئەرکی سەرپەرشتی کردنی بەشێك لەپێشمەرگەکانی لە (چەمی رێزان)، پێ سپێردراوە. لەساڵی ١٩٧٤، جارێکی تر چۆتەوە شاخ. دوای نسکۆ، ئاوارەی ئێران بووە. بەشداری

کۆبوونــەوەکانی ڕۆژهــەڵاتی کوردســتانی کــردووە. بــەبڕیاری دەســتەجەمعی هاوڕێکانی، گەڕاوەتەوە عێراق.

مەلا ناسیح، یەکێك بووە لەم شەش کەسەی کە (بزوتنــەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان)یان دامەزراندووە. لەساڵی ١٩٧٧، چۆتەوە شاخ. ماوەیەك لێپرسراوی پەیوەندییەکانی حزب بووە لەشارەکانی مەهاباد و ورمێ. لەیەکەمین کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەکاروباری ڕێکخستن و سیاسەتدا، مرۆڤێکی نەرم، موعتەدیل، واقیعبین، بووە. هەوڵیداوە ئاراستە و بیروبۆچوونە جیاوازەکانی نێو حزب، لەیەکتر نزیك بکاتەوە.

دوای ئەوەی کەنەخۆشی تەنگەنەفەسی (ڕەبۆ)، تەنگی پێ هەڵچنیوە، لەسەر ڕاسپاردەی حزب، لەڕێکەوتی ١٩٨٩/١١/١٩، چۆتە لەندەن و، لەوێ گیرساوەتەوە. دوای ڕاپەڕین و هەڵوەشاندنەوەی حزب لەپرۆسەی کۆنگرەی یەکگرتن، بەهەوڵی محەمەدی حاجی مەحمود، جارێکی تر، ڕێکخستنەکان لەژێر ناوی: (حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان)، ڕێکخراوەتەوە، (مەلا ناسیح)، هاوکاری ناوبراو بووە، بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

لەڕێکەوتی ٢٠٠١/٩/٨، لەشاری سلێمانی، کۆچی دوایی کردووە، هەر لەوێش نێژراوە[٤٤٥].

## ٩- سەید کاکە

سەید کاکە سەید ئیسماعیل سەید عومەر، لەگوندی (مورتکە)ی گەورەی سەر بەناحیەی قوشتەپە، لەساڵی ١٩٣٢، لەدایك بووە. نەچۆتە قوتابخانە، بەهۆی هەوڵی تایبەتی خۆی، کەمێك فێرە خوێندنەوە و نووسین بووە.

پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئاغا و دەرەبەگەکانی ناوچەی دەشتی هەولێر، باش نەبووە. بەردەوام لەدژیان وەستاوەتەوە. لەساڵی (١٩٥٨)ەوە، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. لەساڵی ١٩٦١، بەشداری هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلولی کردووە. لەساڵی ١٩٦٤ بۆتە سەرپەل. لەساڵی ١٩٦٦، بۆتە سەرلق. لەساڵی ١٩٦٧، بۆتە فەرماندەی بەتالیۆنی یەك لەهێزی دەشتی هەولێر. لەساڵی ١٩٧٤، دووبارە چۆتەوە شاخ

و، بۆتە لێپرسراوی بەتالیۆنی یەکی هێزی دەشتی هەولێر. لەزۆربەی هەرە زۆری چالاکییەکانی هێزی دەشتی هەولێر، بەشداری کردووە، رۆڵی دیار و بەرچاوی هەبووە. کەسایەتییەکی ناوچەی دەشتی هەولێرە. پاش نسکۆ گەڕاوەتەوە عێراق و، بۆ خوارووی عێراق، شاری رومادی، دوورخراوەتەوە. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی یەکەم بەیانی دامەزراندنی بزوتنەوە، پەیوەندی کردووە. له ١٩٧٨/٨/٨، لەگەڵ یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە، چۆتەوە شاخ. لەساڵی ١٩٧٧، بۆتە فەرماندەی هەرێمی سەفین. لەساڵی ١٩٧٨، لەهەکاری بەدیل گیراوە. لەنەورۆزی (١٩٧٩)، لەگەڵ بزوتنەوە، (یەکێتی)یان جێهێشتووە. لەیەکەم کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەهەندێك قۆناغی خەباتدا، بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. دوای پرۆسەی یەکگرتن، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی یەکگرتن. کەلەگەڵ (پارتی) یەکیان گرتووە، سەید کاکە بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی. لەسەر لیستی پارتی بۆتە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان.

بەهۆی پەیوەندی کردن بەشۆڕشەوە، چەندین جار، خێزان و منداڵەکانی لەلایەن رژێمەوە، زیندانی کراون. هەر بەم هۆیەشەوە، دایك و باوکی، لەزیندان کۆچی دواییان کردووە. ئێستا خانەنشینە و، لەشاری هەولێردا، نیشتەجێیە.

دەربارەی سەید کاکە، شاخەوان عەباس، دەنووسێت: (سەید کاکە لەدەشتی هەولێر، ژمارەیەك پێشمەرگەی باشی لەگەڵدا بوو، وێرای ئەمانەش فەرماندەیەکی بەتوانا و جێی باوەڕی جەماوەری ناوچەکە بوو)[٤٤٦].

## ١٠- دکتۆر مەحمود عوسمان

د. مەحمود عەلی عوسمان یان د. مەحمود سۆرانی، لەساڵی ١٩٣٨، لەسلێمانی لەدایك بووە. کۆلیژی پزیشکی لەبەغدا، تەواو کردووە. لەتەمەنی هەژدە ساڵیەوە، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی)یەوە کردووە. لەساڵی ١٩٦٢، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دواتر مەکتەبی سیاسی. لەساڵی ١٩٦٨، بۆتە نوێنەری بارزانی بۆ بەڕێوەبردن و رێکخستنی پەیوەندییەکانی دەرەوەی پارتی. لەساڵی ١٩٧٠، ئەندامی شاندی دانووستاندکاری شۆڕش بووە لەگەڵ

حکومەت. دوای نسکۆی ١٩٧٥. ئاوارەی ئێران بووە. لەتاران کاری پزیشکی کردووە. لەتشرینی دووەمی ١٩٧٦، کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی، دادەمەزرێنێت. لەساڵی ١٩٧٧، چۆتە سوریا. لەساڵی (١٩٧٨)، گەڕاوەتەوە کوردستان. لەنەورۆزی ١٩٧٩، لەگەڵ (بزوتنەوە)، هاوسەفەری (کۆچی نەورۆز) بووە. لەگەڵ (بزوتنەوە) یەك دەگرێت و (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، دادەمەزرێنن. دەبێتە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی ئەم حزبە.

زۆربەی ژیانی لەسوریا و لەندەن، بردۆتە سەر. لەکۆنگرەی یەکەمی حزب، دوای دروستبوونی ئاڕاستە و باڵ، دڵی شکاوە و خۆی بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندید نەکردووە. دواتر، بەتەزکیە بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەدوای راپەڕین، گەڕاوەتەوە کوردستان و لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩، خۆی بۆ پۆستی (رابەر)، کاندید کردووە. سەرەنجام، هەر چوار پالێوراوەکە، دەنگی پێویستیان، نەهێناوە. لەسەروبەندی کۆنگرەی یەکگرتنی هەرسێ حزبەکە، جارێکی تر دڵی شکاوە و، کوردستانی جێهێشتووە. لەساڵی ١٩٩٥ گەڕاوەتەوە کوردستان. دوای روخانی رژێم، لەساڵی ٢٠٠٣ بۆتە ئەندامی ئەنجوومەنی حوکم لەبەغدا. لەساڵی ٢٠٠٤ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق (پەرلەمان). تاوەکو ساڵی ٢٠١٠، لەم پۆستەدا، ماوەتەوە. ئێستاکە خانەنشینە و لەکوردستاندا نیشتەجێیە.

## ١١- محەمەدی حاجی مەحمود

محەمەدی حاجی مەحمود، ناسراو بە (کاکە حەمە)، لەساڵی ١٩٥٣ لەگوندی (گوڵە خانە)ی ناوچەی شارەزوور، لەدایك بووە. نەچۆتە قوتابخانە، بەهۆی هەوڵ و کۆششی خۆی، فێرە خوێندن و نووسین بووە. لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا (١٩٧٠)، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی)یەوە کردووە. دوای نسکۆ، پەیوەندی بەریزەکانی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)، کردووە.

لەشەوی ٢٦-١٩٧٦/٦/٢٧، لەگەڵ پۆلێك لەتێکۆشەری تر، وەك یەکەمین مەفرەزەی سەرەتایی شۆڕشی نوێ، چۆتە شاخ و بۆتە پێشمەرگە. ئەوکات، بۆ ناسینی هەڤاڵەکانی تر، ناوی نهێنی (بەرد)یان لەمەفرەزەکە ناوە. هەر ئەو

شەوە، ناوی نهێنی (عەزین)ی بۆ خۆی هەڵبـژاردووە. بـەڵام ناوەکـەی ئەوەنـدە بـڕی نـەکردووە، چـونکە خـەڵکی ناوچـەکە ناسـیویانەتەوە و، هـەر بـەناوی راستەقینەی خۆی بانگیان کردووە. چەکی دەستی ئـەم مـەفرەزە سـەرەتاییە، بریتی بوو لەسێ برنە و دوو کلاشینکۆف و دوو دەمانـچە. برنـەوەکان، بـەهۆی ئەوەی فیشەکەکانیان تەڕ بووینە، کاریان نەکردووە[٤٤٧].

لەکۆتایی تەموزی ١٩٧٦، یەکەم چالاکی پێشمەرگانەی لەسەر رێگای نێـوان هەڵەبجە و سەید سادق، ئەنجام داوە. لەساڵی ١٩٧٨، وازی لەکۆمەڵـە هێنـاوە، لەگەڵ هێزێك بۆ سەر سنووری عێراق– تورکیا، بەمەبەستی چەك وەرگرتن، بـۆ هەکاری، بەڕێکـەوتووە. لەهەوڵەکـەیان سـەرکەوتوو نەبووینـە. نـاوبراو، یـەکێك بووە لەو حەوت کەسەی کەبەسەلامەتی، لەهەکارییەوە گەڕاوەتەوە قەندیل.

لەبـەر لێهـاتوویی بۆتـە فەرماندەی هـەرێمی یـەکی هـەورامان، کەئەوکاتـە، بەهێزترین و پڕ چالاکیترین، هەرێم بووە. (هـەرێمی یـەك یـەکێك بـوو لەهەرێمـە گەورەکانی یەکێتی کەسنوورەکەی پێك هـاتبوو لەبەشـێکی پێنجـوین، دەشـتی شارەزوور، هەورامان و ناوچەی هەڵەبجە، ئەو سـەردەمە کاکـە حەمـەی حـاجی مەحمودی گوڵەخانـە بەرپرسـی ئـەم هەرێمـە بـوو، لـەناو هەرێمەکـەدا هەرسـێ باڵەکەی یـەکێتی، کۆمەڵـە، بزوتنـەوە، خـەتی گـشتی، رێکخـستنیان هـەبوو... کاکە حەمە دۆستی کۆمەڵە و پشتگیری ئەکردین، بەڵام کۆمەڵە کێشە و گرفتـی بۆ دروست ئەکرد)[٤٤٨].

لەساڵی (١٩٧٩)، خێزان و منداڵەکانی لەلایەن رژێمەوە زیندانی دەکرێن و بۆ شـاری (ناسـریە)ی باشـووری عێـراق، دووریـان خـستوونەتەوە. لەبـەر ئـەوەی ناوبراو خاوەن هەڵوێست و رای تایبەتی خۆی بووە و حەزی بەپاشـکۆی ئـەم و ئەو نەکردووە، لەلایەن چەند سەرکردەیەکی دیار و دەست رۆیـشتووی یـەکێتی (بەتایبەتی کۆمەڵە)، دژایەتی کراوە، پەڵپ و بیانووی پێ گیراوە و ویـستوویانە دەسـتەمۆی بکـەن. بـەهۆی ئـەم رەفتـار کردنـە، لەیـەکێتی سـارد دەبێتـەوە، هەرچەندە بەشێك لەسـەرکردەکانی یـەکێتی و خـودی مـام جـەلال، دەیانـەوێت دڵی رابگرن، بەڵام ئەو بڕیاری خۆی دەدات و لـەمانگی کـانوونی یەکـەمی ١٩٨٠ واز لەیەکێتی دێنێ و، پـەیوەندی بەحزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردسـتان

(حسيك)، دەكات.

لەيەكەم كۆنگرەی حزب بەشداری دەكات و، بەئەندامی يەدەگی كۆميتەی ناوەندی هەڵدەبژێردرێت. پاش ماوەيەكی كەم، دەبێتە ئەندامی كارای كۆميتەی ناوەندی و بەرپرسی لقی سلێمانی. سەرەڕای كار و چالاكی پێشمەرگايەتی، چەندين وتار و بابەتی سياسی و عەسكەری، لەگۆڤاری (سورێن)، بەناوی خواستراوی (سەرباز، عەزين)، بڵاوكردۆتەوە. لەساڵی ١٩٨٥دا، بۆتە لێپرسراوی مەكتەبی عەسكەری حزب. لەدوای راپەڕين و لەپرۆسەی يەكگرتنی هەرسێ حزبەكە، لەئابی ١٩٩٢، بۆتە ئەندامی كۆميتەی ناوەندی (حزبی يەكگرتن). لەساڵی ١٩٩٣دا، لەپرۆسەی يەكگرتن لەگەڵ پارتی ديموكراتی كوردستان و كۆنگرەدا، بەئەندامی مەكتەبی سياسی پارتی هەڵدەبژێردرێت، دەبێتە لێپرسراوی پارتی لەناوچەكانی گەرميان و سلێمانی. ئەوەندە ناخايەنێت، پارتی جێدەهێڵێت و، بەهەوڵ و كۆششی خۆی و هاريكاری چەندين هەڤاڵی تر، لەتشرينی دووەمی ١٩٩٤دا، (حزبی سۆسياليستی ديموكراتی كوردستان)، رێك دەخات و دادەمەزرێنێتەوە. كۆنگرە دەبەستن. ناوبراو دەبێتە سكرتێری حزب.

محەمەدی حاجی مەحمود، لەهەڵبژاردنەكانی پەرلەمانی كوردستان، بۆتە ئەندام پەرلەمان. لەپاش هاتنی رێكخراوی تيرۆريستی (دەوڵەتی ئيسلامی لەعێراق و شام– داعش)، كاكە حەمە يەكێك بووە لەبەرپرسە ديارەكانی هێزی پێشمەرگەی كوردستان لەميحوەری كەركوك. بەبەردەوامی لەگەڵ پێشمەرگەكان، لەناو سەنگەرەكاندا، بووە. هەر لەم پێناوەشدا، (عەتا محەمەد حاجی مەحمود)ی كوڕی، كەئەندامی كۆميتەی ناوەندی حزب بووە، لەسەنگەرەكان، لەكاتی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ داعش، شەهيد بووە. كاكە حەمە، خودی خۆيشی، بريندار بووە.

چوار بەرگ لەكتێبی: (رۆژژمێری پێشمەرگەيەك)ی ياداشت كردووە، كەبۆتە سەرچاوەيەكی بەنرخ و تۆمارێكی ديكۆمێنتاری مێژوويی بزوتنەوەی كوردايەتی و، شۆڕشی نوێ.

## ١٢- قادر عەزیز

قادر سابیر عەزیز، ناسراو بە (قادر عەزیز)، لەساڵی ١٩٥٤ لەگوندی (سێبیران)ی نزیك قوشتەپە، لەدایك بووە. برازای فەرماندە سەعدی عەزیز، ناسراو بە (سەعدی گچکە)یە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەهەولێر تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٧٠، پەیوەندی بەریزەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە، کردووە. لەساڵی ١٩٧٤، پەیوەندی بەشۆڕشەوە کردووە. پاش نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە عێراق. لەگەڵ راگەیاندنی دامەزراندنی بزوتنەوە، لەساڵی ١٩٧٦، پەیوەندی کردووە. لەئابی ١٩٧٦، لەگەڵ یەکەم مەفرەزەی بزوتنەوە، چۆتەوە شاخ. لەپاش شەهید بوونی (سەعدی گچکە)ی مامی بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە و یەکێتی. لەنەورۆزی ١٩٧٩، پشتگیری لەپرۆژەی دەرچوون لەیەکێتی، کردووە. لەیەکەم کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب. یەکێك بووە لەم کەسە دیارانەی کەپشتگیری لەچەسپاندنی بیری (سۆسیالیستی زانستی)، لەپەیڕەو و پرۆگرامی حزبدا کردووە و، پاڵپشتی (رەسوڵ مامەند) بووە.

بەهۆی جیاوازی بیروڕا، لەگەڵ زۆربەی سەرکردە و فەرماندە عەسکەرییەکانی حزب، کێشە و گرفتی، هەبووە. بەهۆی کەڵەکە بوونی ئەم کێشانە و چارەسەر نەکردنیان، لەپایزی ١٩٨٥، لەگەڵ (عەبدولخالق زەنگەنە)ی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب و کۆمەڵێك کادیری چالاکی حزب، جیابۆتەوە و (حزبی سۆسیالیستی کوردستان- ئیتجاهی دیموکراتی شۆرشگێڕ)ی دامەزراندووە.

لەرێکەوتی ٢٤-١٩٨٨/٤/٢٦، لەیەکەم کۆنفرانسدا، (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان) دادەمەزرێنێت و دەبێتە سکرتێری حزب. لەپاش راپەڕین، بەلیستێکی هاوبەش لەگەڵ (یەکێتی) بەشداری هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩دا، کردووە. دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بۆتە وەزیری کشتوکاڵ.

حزبی زەحمەتکێشان، چەندین لێکترازانی تێکەوتووە و، گروپ و کەسایەتی، لێ جیابۆتەوە. بەرفراوانترین لێکترازان، ئەو لێکترازانە بوو کەبەشی هەرە زۆری

سەرکردایەتی حزب لەئازاری ٢٠٠٩، لەناوبراو جیابووتەوە و، بەهۆی دادگاوە ناوی حزبەکە بەر گروپە زۆرە جیابۆوەکە کەوت. قادر عەزیز، بەناچاری لەژێر ناوی (حزبی ئایندەی کوردستان)، درێژەی بەخەبات دا. لەرێکەوتی ٢٠١٦/٨/١٠، حزبی ئایندە چۆوە ناو یەکێتی و (قادر عەزیز)ی سکرتێر، بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

## ١٣- سەعدی گچکە

سەعدی عەزیز محەمەد ئەمین، ناسراو بە (سەعدی گچکە)، لەساڵی ١٩٤٣، لەگوندی (سێبیران)ی سەر بەشارۆچکەی قوشتەپە، لەدایك بووە. لەقۆناغی سەرەتایی وازی لەخوێندن هێناوە. ساڵی (١٩٦٢)، چۆتە خزمەتی سەربازی و ساڵێك دواتر، پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلول، کردووە. لەناوچەکانی، کۆیە، باڵەکایەتی، خۆشناوەتی، چەمی ڕێزان، پێشمەرگایەتی کردووە. لەشۆڕشی ئەیلول بۆتە (سەرپەل، سەرلق)، دواتر، فەرماندەی بەتالیۆن. لەکاتی هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەئازاری ١٩٧٤، یەکێك بووە لەفەرماندە مەیدانیەکانی شەڕەکانی، ماکۆك، کەدوای سێ مانگ لەبەرگری کردن، بریندار بووە.

پاش نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە کوردستان. پەیوەندی بەبزوتنەوە کردووە. لە ١٩٧٦/٨/٨، چۆتەوە شاخ. ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بووە. لەدوای تێپەڕبوونی چەند مانگێك بەسەر چوونەوە شاخ، بۆتە فەرماندەی هەرێمی دەشتی هەولێر و، سەرکردایەتی یەکەم مەفرەزەی پارتیزانی لەناوچەکانی هەولێر و خۆشناوەتی دا، کردووە.

یەکەم چالاکی پێشمەرگانەشی لە ١٩٧٧/١/٤، لەسەر ڕێگای گشتی نێوان بەستۆڕە و مەلا ئۆمەر بوو، کەبووە هۆی کوشتنی بەڕێوەبەری ئەمنی پیرمام (سابیر زێدان) و پارێزەرەکانی. ناوبراو لەم شەڕەدا، بریندار بووە. بەشداری چەندین شەڕی کردووە، لەوانە: (خانزاد، هەورێ، سەفین، دێدەوان، حاجی قەڵا). لەشەڕەکانی گوندی (حەسەن موترب) و بناری دێدەوان، جارێکی تریش، بریندار بووە. پاش کۆبوونەوەکانی پایزی ١٩٧٧، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی. لەشۆڕشی نوێدا، تەنها حەڤدە مانگ، پێشمەرگایەتی کردووە.

لەرێکەوتی ١٩٧٨/٣/٨، پاش شەڕێکی قورسی قارەمانانە لە (دەشتێو)، لەگەڵ دوازدە پێشمەرگەی تر، شەهید دەبێت. هەر لەم شەڕەدا، چوار پێشمەرگەی تریش بەبرینداری کەوتوونەتە دەست جاش و سوپا، دوای ماوەیەك لەزیندانەکانی موسڵ، لەسێدارە دراون.

## ١٤- قادر شۆڕش

لەساڵی ١٩٢٤ لەگوندی (قەراسنجی سەروو)ی بناری چیای سەفین لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٤٣ بۆتە سەرباز و چۆتە (قبرس). لەساڵی ١٩٤٧، بۆتە ئەندامی پارتی. بەهۆی چالاکییەکانی، لەساڵی ١٩٥٤، لەلایەن رژێمی پاشایەتییەوە گیراوە و لەساڵی ١٩٥٦، ئازاد کراوە. لەسەر داوای حزب، پاش شۆڕشی چواردەی تەموز لەساڵی (١٩٥٨)، کتێبخانەی (شۆڕش)ی لەژێر قەڵای هەولێر، کردۆتەوە. ئەم نازناوەشی (شۆڕش)، هەر لەناوی کتێبخانەکەیەوە، بۆ ماوەتەوە. کتێبخانەی شۆڕش، ببووە شوێنی یەکتر بینینی ئەندام و لێپرسراوەکانی پارتی و ئاڵوگۆڕ کردنی بڵاوکراوەکانی حزب.

له ١٩٦١/٩/١٤، جارێکی تر، زیندانی کراوە. پاش سێ مانگ مانەوە، ئازاد کراوە. لە ١٩٦٢/٥/٣١، لەکاتی ئەنجامدانی چالاکییەکی حزبی دەستگیرکراوە. دوای چەند مانگێك، ئازاد کراوە. لەساڵی ١٩٦٣، بۆتە ئەندامی ناوچە. لەلێکترازانەکەی پارتی لەساڵی (١٩٦٤) کەوتۆتە لای باڵی مەکتەبی سیاسی و چۆتە ئێران. دوای ماوەیەکی کەم، گەڕاوەتەوە ناو پارتی و لە ١٩٦٥/٥/٨، بۆتەوە پێشمەرگە. لەساڵی ١٩٦٩، بۆتە ئەندام ناوچە.

لەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠، بۆتە بەرپرسی ناوچەی کۆیە. لە ١٩٧٣/٢/٢٤ بۆ شارۆچکەی شەقڵاوە گواستراوەتەوە و بۆتە لێپرسراوی لاوانی شەقڵاوە. لەکاتی نسکۆی ١٩٧٥، لێپرسراوی ناوچەی شەقڵاوە بووە. لە ١٩٧٥/٤/١٤، لە (نەغەدە)وە گەڕاوەتەوە عێراق. لە ١٩٧٥/١٢/٢٢دا، بەچاودێری کار (مراقب عمل)، لەبەڕێوەبەرێتی خۆجێیەتی هەولێر، دامەزراوە. دوای راگەیاندنی بزوتنەوە، لەلایەن (عەلی هەژار)ەوە پەیوەندی پێوە کراوە و بۆتە ئەندامی کۆمیتەی رێکخستنی ناو شاری هەولێر. لەهاوینی ١٩٧٩، چۆتە

شاخ. لەیەکەم کۆنگرەی حزب بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب و، بەرپرسی لقی هەولێر لەگوندی (سماقوڵی سەروچاوە). لە ١٩٨٣/٦/١١، لەگەرمەی شەڕی ناوخۆ، بەهۆی تووشبوون بەنەخۆشی (ریخۆڵە کوێرە)، لەگوندی (ئاریانە)ی نزیك دێگەڵە، کۆچی دوایی کردووە. رۆژێك دواتر، بەهەوڵی کەس و کار و هاوڕێیانی، لەگۆڕستانی (ئیمام محەمەد) لەهەولێر دەنێژرێت. لە ١٩٨٣/٧/١، مەکتەبی سیاسی حزب دەربارەی کۆچی دوایی قادر شۆڕش، بەیانێکی لەژێر ناوی: (هەڤاڵی قارەمان قادر شۆڕش لەرێگای خەباتدا گیانی خۆی فیداکرد)، دەرکرد.

## ١٥- ئەنوەری مەجید سوڵتان

لەبنەماڵەیەکی رۆشنبیر و ناسراوی سلێمانی، لەساڵی ١٩٤٤، لەگەڕەکی گوێژە، لەدایك بووە. (سوڵتان ئەحمەد چاوڕەش)ی باپیری لەسوپای عوسمانیدا، ئەفسەر بووە. (ئەنوەر)، لەساڵی (١٩٦٦)، بەشی زانستی قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە، پاشان چۆتە کۆلیژی کشتوکاڵ لەزانکۆی بەغدا. کۆرسی یەکەم تەواو دەکات، دوایی واز لەم کۆلیژە دەهێنێت و دەچێتە کۆلیژی سەربازی. لەساڵی ١٩٦٩ کۆلیژ تەواو دەکات و بەپلەی ملازمی دووەم بۆتە ئەفسەر. لەساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠دا، لەیەکە سەربازییەکانی سوپای عێراق لەشارەکانی، بەغدا، بەسرە، حیلە، خزمەتی کردووە. لەساڵی ١٩٧٢، پلەکەی بۆ ملازمی یەك، بەرز کراوەتەوە. هەر لەم ساڵەدا، ریزەکانی سوپای عێراقی بەجێهێشتووە و، پەیوەندی بەهێزەکانی پێشمەرگەوە کردووە. لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٤، بۆتە فەرماندەی تۆپخانە لەهێزی خەبات، لەدەڤەری پێنجوین. پاش نسکۆی شۆڕش، گەڕاوەتەوە عێراق، بۆ شاری بەسرە دوورخراوەتەوە. نەگەڕێندراوەتەوە سوپا، وەك فەرمانبەرێك لەدائیرەی پۆستە و گەیاندن، دامەزراوە. لەئەیلولی ١٩٧٦، لەسەر داوای کۆمەڵە، پەیوەندی بەشۆڕشی نوێوە کردووە. لەکۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی لەپایزی ١٩٧٧، کراوەتە فەرماندەی هەرێمی دووی دەشتی کەرکوك. لەنیسانی ١٩٧٨، وەك فەرماندەیەك، ئەرکی سەرپەرشتیکردنی بەشێك لەو هێزەی پێ

سـپێردراوە کەبـەرەو هـەکاری بـەڕێکراوە. پـاش شکـست خـواردن و پـەرت و بڵاوبـوونی هێزەکـە، نـاوبراو، لەلایـەن سـوپای ئێرانـەوە، دەسـتگیر کـراوە. لەشـوباتی ١٩٧٩، دوای ڕوخانـدنی شـا، لەزینـدان ئـازاد کـراوە. ئـەمجارەیان، پەیوەنـدی بـە (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی کوردسـتان)ەوە، کـردووە. لەجودابوونەوەی بزوتنەوە، لەگەڵ باڵە سـەرەکییەکە (باڵی ڕەسـوڵ مامەنـد)، ڕۆیـشتووە. لەیەکـەم کۆنفرانـسدا، بەئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی حزبـی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان، هەڵبژێردراوە.

وەك بەدەنگەوەچـوون و هاریکـاری کـردن، بەشـداری شۆڕشـی ڕۆژهـەڵاتی کوردستانی کردووە. لەچەندین شەڕ و پێکدادانـدا لەگـەڵ هێزەکـانی حکومـەتی کۆماری ئیـسلامی ئێـران، ڕۆڵـی فەرماندەیـەکی شـەڕکەری شایـستەی بینیـوە. لەیەکێك لەڕووبەڕوو بوونەوەکاندا، لە ١٩٧٩/٩/٢، لەنزیك شاری (بانە)، شـەهید بووە. دوای بیست ڕۆژ، کەسوکارەکەی، تەرمەکەی دەهێننەوە شاری سلێمانی و لەگۆڕستانی (گردی سەیوان)، بەخاکی دەسپێرن[٤٤٩].

دەربارەی ملازم ئەنوەر، نەوشێروان مستەفا، دەنووسێت: (... لەسەر داوای کۆمەڵە بوو بەپێشمەرگە، دواتـر بۆتـە بزوتنـەوە... ئـەنوەر لەجەیـشی عێراقـدا ئەفسەر بوو. لەشۆڕشی ئەیلولدا ببوو بەپێشمەرگە. کوڕێکی ئازا و دەستپاك و دڵسۆز بوو، بەڵام کابرایەکی ساویلکە و کەللەڕەق بوو)[٤٥٠].

## ١٦- محەمەد غەفور ئاغجەلەری

محەمـەد غـەفور ئەحمـەد ئاغجەلـەری، لەسـاڵی ١٩٣٩، لەشارۆچـکەی ئاغجەلـەر، لـەدایك بـووە. تـا پـۆلی سـێیەمی ناوەنـدی خوێندوویـەتی. لەسـاڵی ١٩٦٠، پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. وەك پێشمەرگە، دواتر (سەرلق)ێك بەشداری شۆڕشی ئـەیلولی کـردووە. لەلێکترازانـە مێژووییەکـەی پـارتی لەسـاڵی (١٩٦٤)، لەگـەڵ بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی بـووە. لەسـاڵی (١٩٧٤)، پەیوەنـدی بەشـۆڕش کـردووە. دوای نـسکۆی ١٩٧٥، کەبزوتنەوە دامـەزراوە، نـاوبراو لەساڵی ١٩٧٦، پەیوەنـدی بـەم ڕێکخـراوەوە، کـردووە. یـەکێك بـووە لەپێشمەرگە سـەرەتاییەکانی شۆڕشـی نـوێ. چـەندین

چالاکی پێشمەرگانەی لەناوچەکانی سنووری کەرکوك و چەمچەماڵ و بەری کۆیە و چەمی ڕێزان و قەڵاسێوکە و...تاد، ئەنجام داوە. ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، بووە. لەرێکەوتی ١٩٧٧/٧/٢٣دا، لەگوندی (کانی بی) ناوچەی بازیان، لەرووداوێکی تەمومژاویدا، لەگەڵ نۆ پێشمەرگەی تر، بەدەستی مەفرەزەیەکی سەرکردایەتی کاتی (قیادە موەقەتە)، شەهید کراون. شەهیدەکان ئەمانە بوون: (ئەنوەر کەریم، عەبدوڵڵا تۆفیق، حامید مەلا ئەحمەد، رەزا عومەر، سەعید عومەر، کەریم مەلا ئەحمەد، حەمید عەزیز، رەمەزان سەعید، ئەحمەد محەمەد).

دوای ئەم رووداوە، مەفرەزەکەی سەرکردایەتی کاتی، خۆیان رادەستی رژێم کردۆتەوە و بوونەتە جاش[٤٥١].

## ١٧- سەعد عەبدوڵڵا

سەعدەدین عەبدوڵڵا عوسمان، ناسراو بە (مامۆستا سەعد)، لەساڵی ١٩٤٩، لەگوندی (عەوێنە)ی سەر بەپارێزگای هەولێر لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی، لەهەولێر تەواو کردووە. لەتەمەنی چواردە ساڵیەوە، پەیوەندی بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە کردووە. دواتر پەیوەندی بە (پارتی)یەوە کردووە. لەساڵی ١٩٦٩دا، خانەی مامۆستایانی لەهەولێر تەواو کردووە و، بەمامۆستا دامەزراوە. لەدوای رێککەوتننامەی یازدەی ئازار، بۆتە ئەندام ناوچەی هەولێر. لەساڵی ١٩٧٤ چۆتە شاخ و بۆتە ئەندام ناوچەی رەواندز.

پاش نسکۆ، گەڕاوەتەوە عێراق و لەهەولێر بۆتەوە بەمامۆستا. لەگەڵ دامەزراندنی بزوتنەوە، لەرێگای عەلی هەژار و کادرۆ گەلاڵی، لەساڵی ١٩٧٦، پەیوەندی بە (بزوتنەوە) کردووە. دوای دەستگیرکردنی (کاردۆ و عەلی هەژار)، لەبەهاری ١٩٧٩ چۆتە شاخ. لەیەکەمین کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. مامۆستا سەعد، یەکێك بوو لەلایەنگرانی ئاراستەی (سۆسیالیستی زانستی). دوای کۆنگرە، بۆتە لێپرسراوی راگەیاندن. سەرپەرشتی (رێگای ئازادی)، ئۆرگانی حزب و گۆڤاری تیۆری (سۆسیالیست) و ئیستگەی (دەنگی شۆڕشی کوردستانی عێراق) و (پەیامی شۆڕشی کوردستانی عێراق)ی، کردووە. چەندین نووسین و لێکۆڵینەوەی سیاسی، بەناوی

خواسـتراوی (ب. گـۆران، ب. ئامـانج) بڵاوکردۆتـەوە. نـاوبراو جگـە لـەکاری سیاسـی، نووسـەرێکی زمـان پـاراو و چیرۆکنووسـێکی سـەر بـەرێبازی ریـالیزم بـووە. یەکـەمین کورتـە چـیرۆکی بـەناوی (فەریکـە گـوێز)، لەسـاڵی ١٩٧٨، لـەگۆڤاری (بـەیان)دا، بڵاوکردۆتـەوە. نـاوەڕۆکی چـیرۆکەکە، باسـی لەتێکـدانی گونــدەکان و، راگواســتن و تەقاندنــەوەی کانیاوەکــان و، ســوتاندنی رەز و باخـەکانی کوردسـتان، کـردووە. ئـەم چـیرۆکە، دەکەوێتـە خانـەی (ئـەدەبی بەرگری)یـەوە. نـاوبراو، رێـچکەیەکی تایبـەت و دیـاری، لەنووسـیندا، هـەبووە. چەندین کتێب و نامیلکەی مێژوویی و ئەدەبی و سیاسی، بڵاوکردۆتەوە. لەوانە:

- تاقە دارێك، کۆمەڵە چیرۆك، لەشاخ بڵاوکراوەتەوە.
- کێشەی کورد، نووسینی: لازارێف، وەرگێران لەعەرەبییـەوە، چـاپی یەکـەم، لەشاخ و، چاپی دووەم لەشار دوایی راپەڕین، بڵاوکراوەتەوە.
- ئایار لەبناری قەندیل، نامیلکەیەکە باس لەشەڕی ئاشقولکە و پشت ئاشـان، دەکات.
- واقیعبینــی و چــەند دیدگایــەکی ســەیدای نــەمر، لێکۆڵینەوەیەکـە لەســەر نامەکانی سەیدا ساڵح یوسفی.
- کەسایەتی کورد و چەند تێبینیەك، هەولێر، ٢٠٠٣.

لەشاخ و لەسەردەمی دوای راپەڕین، ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزب، بووە. لـەدوای راپــەڕین، بۆتــە لێپرسـراوی لقــی هــەولێری حـزب. ئەنـدامی یــەکێتی نووسەرانی کورد، بووە.

لــەکۆنگرەی یــەکگرتنی هەرســێ حزبەکــە لــەئابی ١٩٩٢، بۆتــە ئەنــدامی مەکتەبی سیاسی (حزبی یەکگرتنی کوردستان) و لێپرسراوی لقی هەولێری ئـەم حزبە. دوای ئەوەی یەکگرتن لەگـەڵ پـارتی یەکـدەگرن، نـاوبراو بۆتـە ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی پـارتی و لێپرسـراوی لقـی دوو (هـەولێر). لـەبواری کـاری حکومیش بۆتە وەزیری کشتوکاڵ و ئاودێری لەحکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان. بەیـەکێك لەرۆشـنبیری جدییـەکانی شـاری هـەولێر دادەنرێـت. لـەرۆژی جـەژنی قوربان، لە ٢٠٠٤/٢/١، ئـەوکات کەلێپرسـراوی لقـی دوو بـوو لەهـەولێر، لـەکاتی پێشوازی کردن لەمیوانـەکانی جـەژن، لـەکارە تیرۆریستیەکەی یـەکی شـوباتی سەر مەڵبەندی یەکێتی و لقی دووی پارتی، شەهید بووە[٤٥٢].

## ١٨- شێخ محەمەد شاکەلی

لەساڵی ١٩٤٤، لەبنەماڵەیەکی ئایینی نیشتمانپەروەر، لەشارۆچکەی کەلار لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٥٠ چۆتە قوتابخانە. لەساڵی ١٩٦٣ پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی لەشاری کەرکوك تەواو کردووە و بۆتە مامۆستا. لەسەرەتای لاوێتییەوە پەیوەندی بەریزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، کردووە. لەلێکترازانەکەی ١٩٦٤، لەگەڵ باڵی مەکتەب سیاسی بووە. لەساڵی ١٩٧٤، بەشداری شۆڕشی کردووە، لێپرسراوی رێکخستنەکانی ناوچەی کفری بووە. پاش نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە عێراق و بۆ شاری دیوانییە، دوورخراوەتەوە. کەسێکی بەشدار و ئاگاداری جموجۆڵەکانی دامەزراندنی بزوتنەوە، بووە. دوای گیران و شون بزر کردنی عەلی هەژار و کاردۆ گەلاڵی، بۆتە لێپرسراوی ناوخۆی رێکخستنەکانی بزوتنەوە، پاشان حزبی سۆسیالیست. پەیوەندییەکی پتەو و بەردەوامی لەگەڵ خودی دامەزرێنەری بزوتنەوە (سەیدا ساڵح یوسفی)، هەبووە. لەکۆنگرەی یەکەمی حزب، بەنهێنی بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەسەر داوای حزب، لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٨٢، پەیوەندی بەشاخ، کردووە.

لەدوای راپەڕین، بەشداری کۆنگرەی یەکگرتنی کردووە. لەگەڵ باڵی (رەسوڵ مامەند)، حزبی سۆسیالیستی دامەزراندۆتەوە. لەکۆنگرەی دووەم، لەنۆڤێمبەری ١٩٩٢، بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. دوای یەکگرتنی سۆسیالیست و یەکێتی لەشوباتی ١٩٩٣، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی. لەناو یەکێتی دا، کۆمەڵێك پۆستی ئیداری و سیاسی، وەرگرتووە، وەك: وەزیری رۆشنبیری (ئیدارەی یەکێتی)، وەزیری ئەوقاف (ئیدارەی هاوبەشی یەکێتی و پارتی)،...تاد.

چەندین کتێب و نامیلکەی چاپکراوی هەیە. ئێستا سەرۆکی کۆمەڵەی روناکبیری و کۆمەلایەتی پارێزگای کەرکوك و، راوێژکاری کاروباری ئایینی سەرۆکی هەرێمی کوردستانە.

## ١٩- عادل موراد

لەساڵی ١٩٤٩، لەخانەوادەیەکی کوردی فەیلی، لەشاری بەغدا، لەدایك بووە. لەهەرزەکارییەوە، لەساڵی ١٩٦٥، پەیوەندی بەرێکخستنەکانی (پارتی)یەوە، کردووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی، لەبەغدا تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٦٦، لەبەشی کیمیا لەکۆلێژی پەروەردەی بەغدا، وەرگیراوە. بەهۆی ئەوەی کەلەساڵی ١٩٦٩دا، رێکخستنەکانی بەغدای پارتی ئاشکرا بووینە، ناوبراو، نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات و، چۆتە شاخ و، بۆتە پێشمەرگە. لەخەباتی پێشمەرگایەتیدا، بۆتە ئەندام ناوچەی باڵەك. لەدوای رێککەوتنی یازدەی ئازار، لەکۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، بۆتە سکرتێری ئەم یەکێتیە. هەر لەم ماوەیەدا، گواستراوەتەوە بەغدا، لەوێ، پەیوەندی بەزانکۆ کردۆتەوە و خوێندنی تەواو کردووە. هەروەها بۆتە ئەندامی لقی پێنج لەبەغدا.

لەگەڵ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەئازاری ١٩٧٤، پەیوەندی بەشاخ کردۆتەوە. پاش نسکۆی ١٩٧٥، ئاوارەی ئێران بووە. هەر لەم ساڵەدا، چۆتە سوریا و، لەوێ نیشتەجێ بووە. لەوێ، لەگەڵ مام جەلال و چەند کەسێکی تر، (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)یان، دامەزراندووە. لەکانوونی دووەمی ١٩٧٩دا، گەڕاوەتەوە کوردستان، لەناوزەنگ گیرساوەتەوە. لەمانگی شوباتی هەمان ساڵ، بەهۆی کێشە و گیروگرفتەوە، لەیەکێتی رەنجاوە و گەڕاوەتەوە سوریا. لەوێ، وەك رۆژنامەنووسێك لەرۆژنامەی (السفیر)ی لوبنانی، کاری کردووە. لەساڵی ١٩٨١، پەیوەندی بەریزەکانی (حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان- حسیك)ەوە، کردووە. لەیەکەمین کۆنگرەدا، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. بەشی زۆری ژیانی لەسوریا بردۆتە سەر و، وەك نوێنەری پەیوەندییەکانی حسك، کاری کردووە. دوای راپەڕین، چەند جارێك گەڕاوەتەوە کوردستان. لەکاتی پرۆسەی یەکگرتنی هەرسێ حزبەکە، ئەو لەسوریا بووە. لەساڵی ١٩٩٤، جارێکی تر پەیوەندی بەریزەکانی (یەکێتی)یەوە کردۆتەوە، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی، تا ساڵی ٢٠٠٠، لێپرسراوی راگەیاندن بووە. ساڵی ٢٠٠٤، بۆتە باڵوێزی عێراق لەرۆمانیا. ساڵی ٢٠١٢، بۆتە لێپرسراوی (ئەنجوومەنی ناوەندی یەکێتی).

## ٢٠- محەمەد فاتح

محەمەد فاتح عەبدولڕەحمان فەتاح، لەساڵی ١٩٤٦ لەشاری کەرکوك لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەشاری کەرکوك تەواو کردووە. ساڵی ١٩٦٧، پەیمانگای مامۆستایانی هەر لەشاری کەرکوك تەواو کردووە و، بۆتە مامۆستا. لەساڵی ١٩٦٥دا، پەیوەندی بەرێکخستنەکانی (پارتی)یەوە کردووە. کۆمەڵێك لێپرسراویەتی وەك: ئەندام ناوچە، ئەندامی لقی کەرکوك، گرتۆتە ئەستۆ. لەساڵی ١٩٦٩ بۆتە پێشمەرگە. لەساڵی ١٩٧٤، جارێکی تر، پەیوەندی بەشاخ کردۆتەوە. پاش نسکۆی ١٩٧٥، ئاوارەی شارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان بووە. دوای ماوەیەك گەڕاوەتەوە عێراق. لەگەڵ دامەزراندنی بزوتنەوە، لەساڵی ١٩٧٦، پەیوەندی بەریزەکانی کردووە، بۆتە کادیرێکی چالاکی بزوتنەوە، بەتایبەتیش لەناو رێکخستنەکانی شاری کەرکوك. لەساڵی ١٩٨٠، پەیوەندی بەشاخ کردووە. لەیەکەمین کۆنگرە، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزب. بەهۆی ململانێ و شەڕی ناوخۆ، وازی لەحزب هێناوە و گەڕاوەتەوە عێراق، بۆ شاری رومادی، دوورخراوەتەوە و، لەوێ، بۆتەوە بەمامۆستا.

لەدوای راپەڕین، پەیوەندی بەحزب کردۆتەوە. لەدووەمین کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەپرۆسەی یەکگرتن لەگەڵ یەکێتیدا، بۆتە ئەندامی مەکتەبی رێکخستن. ناوبراو، ئەزموونێکی زۆری لەبواری کاری بەڕێوەبردن و رێکخستندا هەیە. ئێستاکە لەشاری هەولێر نیشتەجێیە. لەبواری نووسین و وەرگێڕاندا، تا ئێستاکە، زیاتر لەبیست کتێب و نامیلکەی لەبواری بەڕێوەبردن و سیاسەتدا، چاپ و بڵاوکردۆتەوە.

## ٢١- عەبدولخالق زەنگەنە

عەبدولخالق محەمەد رەشید زەنگەنە، لەساڵی ١٩٤١، لەشاری کەرکوك لەدایك بووە. دەرچووی پەیمانگای کۆمپانیای نەوتی کەرکوکە. لەسەرەتای گەنجێتیەوە، پەیوەندی بەریزەکانی (حزبی شیوعی عێراق)ەوە کردووە.

ورده ورده، پلـەی حزبـی بـەرز بۆتـەوە. دوا پلـەی حزبـی، سـکرتێری سـەرکردایەتی پارێزگـای کـەرکوك بـووە. نـاوبراو، لـەژیان و خـەبات و کـاری سیاسـیدا، چـەند جارێـك لەلایـەن رژێمـەوە، زینـدانی کـراوە. بـۆ نموونـە: (لەناوەڕاسـتی ١٩٧١، بـەهۆی گـیران و دانپیانـانی ئەنـدامێکی حزبـی شـیوعی، عەبدولخالق زەنگەنە گیراوە، دوای ماوەیەك، ئازاد کراوە)[٤٥٣].

دوای ئەوەی لەلایەن حکومەتەوە، فشاری زۆر خراوەتە سەر حزبی شیوعی و وای لێکراوە کەلەساڵی ١٩٧٨دا، لەو بەرەیە دەرچێت کەلەگەڵ حزبی بـەعس لە ١٩٧٣/٧/١٧دا، پێکیان هێنابوو... بـەرەنجامی ئـەو فـشارە زۆرە، بەشـێکی زۆری کـادیر و ئەندامـەکانی شـیوعی چـوونەتە شـاخ، یـان دەرەوەی وڵات. بەشێکی تریشیان، پاکانەیان نووسی و، لەژێر دەسەڵاتی رژێم، مانەوە.

عەبدولخالق زەنگەنە، (لەساڵی ١٩٧٨دا، سکرتێری سـەرکردایەتی پارێزگـای کەرکوك بـووە. پـاش فـشار هێنـانی رژێـم، عەبـدولخالق و ئەندامـەکانی لیژنـەی پارێزگـای کـەرکوك: ئـەبو ئـازاد و گـۆران و مەنـسور، دەچـنە دائـیرەی ئـەمنی گشتی کەرکوك و پاکانە دەنووسن و دەڵێن: لەمڕۆ بەدواوە، ئێمە شیوعی نین و بڕیارمانداوە وەك هاوڵاتیەکی باش لەژێر دەسەڵاتی حکومەت، دابنیشین)[٤٥٤].

مـاوەی دوو سـاڵ لـەعێراق ماوەتـەوە. پاشـان، پەیوەنـدی بـە (حزبـی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)، کردووە. بۆ ئەم مەبەستە: لەگەڵ عەزیز عەقراوی (عەزیز ئاکرەیی)، چۆتە ماڵی ساڵح یوسـفی و گوتوویانـە: دەمانـەوێت پەیوەنـدی بەسۆسیالیـستەوە، بکـەین. (یوسـفی)ش، دوای ئـەم پەیوەندییـە، لەلای هەڤاڵـەکانی دەڵێـت: نـەدەبوو عـەزیز ئـەو پیـاوە لەگـەڵ خـۆی بهێنێـت، چونکە هەستم کـرد، ئـەو پیـاوە زۆر پەلەیـەتی، جێگـەی خـۆی لـەناو شـۆڕش بکاتەوە... ترسی ئەوەم هەیە گۆڵ لەعەزیز و ئێمە و برادەرانی شاخیش بکات. بەڵام لەدەست دەرچوو، هیچ ناکرێت[٤٥٥].

زەنگەنە، لەگەڵ عـەزیز ئـاکرەیی، سـاڵی ١٩٨٠، چـۆتە سـوریا. لەوێـشەوە، پەیوەندییان بەسۆسیالیـستەوە کـردووە. لەگـەڵ چـەند کەسـێکی تـر، بـەناوی بازنەی رۆشـنبیری (حەلقـەی سـەقافی)، بەشـداری یەکـەم کـۆنگرەی حزبیـان، کردووە. زەنگەنە، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ناوبراو، یـەکێك بـووە لـەم

کەسانەی کەسەرسەختانە هەوڵیداوە ڕێبازی (سۆسیالیستی زانستی)، لەپەیڕەوی ناوخۆی حزب، بچەسپێنێت. ئەو، بەشی زۆر ژیانی لەسوریا، بردۆتە سەر. لەوێ، وەك نوێنەری پەیوەندییەکانی دەرەوەی حزب کاری کردووە. لەساڵی ١٩٨٥، لەکۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی حزبدا، لەگەڵ قادر عەزیز جیابۆتەوە و، حزبی زەحمەتکێشانیان، دروست کردووە. لەم حزبە تازەیەدا، بۆتە ئەندامی پەرلەمانی کوردستان. لەم کاتەی کەهەردوو حزبی سەرەکی کۆنترۆڵی پەرلەمانیان کردبوو، ئۆپۆزسیۆن نەبوو، ناوبراو لەهەموو کۆبوونەوەکاندا، رای تایبەتی خۆی هەبووە و قسەی کردووە. ئەوکات، رۆڵی ئۆپۆزسیۆنی هەبووە. لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٦، لەگەڵ قادر عەزیز و زەحمەتکێشان جیابۆتەوە، وەك ئەندامێکی سەربەخۆ لەپەرلەمان ماوەتەوە. هەر لەم سەروبەندەدا، لەگەڵ (غازی حەسەن)ی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی زەحمەتکێشان و بەرپرسی راگەیاندن، دوای ٣١ ئابی ١٩٩٦، لەهەولێر ماونەتەوە، ڕێکخراوی (بزوتنەوەی میللی کوردستان)یان دامەزراندووە. ئەم ڕێکخراوە، ڕۆژنامەیەکیان بەناوی (دەنگی میللەت) و، گۆڤارێکیشیان بەناوی (ڕۆشنبیری کوردستان)، دەرکردووە. زەنگەنە، ئەندامی چەندین ڕێکخراو بووە، لەوانە:

- سەرۆکی کۆمەڵەی مافخوازانی مرۆڤ لەکوردستان.
- سەرۆکی لقی هەولێری کۆمەڵەی مافی مرۆڤی عێراقی.
- لەپەرلەمان، سەرۆکی لیژنەی مافی مرۆڤ، لیژنەی داکۆکی کردن لەمافی ئافرەتان.
- یەکێك بووە لەچالاکڤانەکانی بواری مافی مرۆڤ و ئاشتی لەکوردستان و عێراق و دەرەوەی وڵات، بەشداری لەچەندین کۆنگرە و کۆنفرانس و کۆبوونەوە، لەناوەوە و دەرەوەی وڵات، کردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٦-١٩٩١)، لەسوریا، ڕۆژنامەی (رایە الحریە)ی زمانحاڵی (حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان)، بەزمانی عەرەبی، دەرکردووە. دوای ماوەیەك، ڕێکخراوەکەی (بزوتنەوەی میللی) هەڵدەوەشێنێتەوە، دەچێتە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان و دەبێتە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی.

## ٢٢- غەفور ساڵح ژاژڵەیی

لەساڵی ١٩٤٨، لەگوندی (کانی بی)ی سەر بە (ژاژڵە)ی ناوچەی ماوەت، لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٥٤، چۆتە قوتابخانە و قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە. بۆ تەواوکردنی قۆناغی ناوەندی، ساڵی ١٩٦٠، چۆتە شاری سلێمانی. لەم ماوەیەدا، پەیوەندی بەریزەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە، کردووە. لەبەر ئاشکرا بوونی چالاکییەکانی، لەساڵی ١٩٦٢، حکومەت بۆ قەزای (هاشمیە)ی سەر بەپارێزگای (بابل)، دووری خستۆتەوە. لەساڵی (١٩٦٨)، بۆتە مامۆستا لەگوندی (ژاژڵە). لەساڵی ١٩٧٤ پەیوەندی بەشۆڕش کردووە، لەناوچەی بادینان، بۆتە سەرلق. پاش نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە عێراق. لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزوتنەوە، پەیوەندی بەم ڕێکخراوە تازەیە، کردووە. لەساڵی ١٩٧٨، چۆتە شاخ و بۆتە پێشمەرگە.

دوو تاوانبار، کەلەریزەکانی پێشمەرگەدا بوون و، لەژێرەوە لەگەڵ ڕژێم بوونە، لەڕێکەوتی ١٩٧٨/١٠/٧، لەنێوان گوندەکانی (باڵخ و گاپیلۆن)ی ناوچەی ماوەت، شەهیدیان کردووە(٤٥٦).

## ٢٣- عەدنان موفتی

عەدنان محەمەد ڕەشاد موفتی، لەساڵی ١٩٤٩، لەشاری هەولێر لەدایك بووە. قۆناغەکانی خوێندنی لەهەولێر، تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٦٣، پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی (پارتی)یەوە کردووە. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەژمێریاری زانکۆی موستەنسریە، بەدەست هێناوە. ساڵی ١٩٧٤، پەیوەندی بەشۆڕش کردووە. پاش نسکۆ گەڕاوەتەوە هەولێر. هەر هەمان ساڵ، عێراقی بەجێ هێشتووە و چۆتە سوریا. لەوێ، لەگەڵ (د. مەحمود عوسمان، شەمسەدین موفتی، قادر جەباری) و چەند کەسێکی تر، (لیژنەی ئامادەکردن- پارتی دیموکراتی کوردستان)یان، دامەزراندووە. لەساڵی ١٩٧٨، گەڕاوەتەوە کوردستان و بۆتە پێشمەرگە. لەنەورۆزی ١٩٧٩، کاتێك کەبزوتنەوە لە (یەکێتی) هاتۆتە دەرەوە، (عەدنان موفتی)ش، وەك یەکێك لەدامەزرێنەرانی

ڕێکخراوی (لیژنەی ئامادەکردنی پارتی)، لەگەڵ بزوتنەوە، (یەکێتی)یان بەجێهێشتووە. لەیەکەم کۆنگرەی حزب، بۆتە ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی. لەساڵانی هەشتاکاندا، لەگەڵ عادل موراد و د. مەحمود و عەبدولخالق زەنگەنە، زۆربەی ژیانیان لەسوریا و دەرەوەی کوردستان، بردۆتە سەر. لەوێ، وەك نوێنەری دەرەوەی حزب، کاریان کردووە.

لە ١٩٨٧/١١/٢٤، لەناوچەی مەرگە، لەلایەن نۆکەرێکی ڕژێم، لەگەڵ ژمارەیەك لەهەڤاڵەکانی، بەژەهری سالیۆم، ژەهر خواردوو کراوە. بۆ وەرگرتنی چارەسەری، چۆتە لەندەن. دوای ڕاپەڕین، یەکێك بووە لەشاندی دانووستاندن لەگەڵ ڕژێم. دوای هەڵوەشاندنەوەی سۆسیالیست، لەساڵی ١٩٩٥، پەیوەندی بە (یەکێتی)یەوە، کردووە. بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی مەڵبەندی هەولێر. لەشوباتی ٢٠٠٤، لەکردەوە تیرۆریستیەکەی مەڵبەند و لق لەهەولێر، بریندار بووە. لە ٢٠٠٥/٦/٤دا، بۆتە سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، لەسەر لیستی یەکێتی. لەساڵی ٢٠١٠، بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. ئێستا لەشاری هەولێردا، نیشتەجێیە[٤٥٧].

## ٢٤- سەید سەلیم

سەید سەلیم نەبی، لەساڵی ١٩٤٠، لەگوندی (بێخاڵ)ی سەر بەقەزای ڕەواندز، لەدایك بووە. بەهۆی هەژاری و نەداری بنەماڵەکەی، نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات. لەسەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول، بۆتە پێشمەرگە.

لەبەر لێهاتوویی، بەخێرایی پلەکانی پێشمەرگایەتی و حزبی بڕیوە. دواین پلەی لەکاتی نسکۆی ئازاری ١٩٧٥، ئەندامی لیژنەی ناوچەی باڵەك و فەرماندەی بەتالیۆن بووە. پاش نسکۆ، ئاوارەی ئێران بووە. وەك زۆربەی هاوخەبات و هاوڕێیانی، گەڕاوەتەوە کوردستان. دوای کارەساتی هەکاری و کەمبوونەوەی هێزی پێشمەرگە، لەسەر داوای مام جەلال، لەگەڵ هەریەك لەشەهیدان (ڕەحمان سەیدە و ساڵح هەولێری)، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە دەکەن. لەکاتی دابەشکردنی ئەرکەکان و دامەزراندنی

هەرێمەکان، سەید سەلیم، کراوەتە فەرماندەی هەرێمی دوازدەی هەندرێن و ئەندامی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی. سەرکردایەتی زۆربەی ئەو شەڕانەی کردووە کەلەناوچەکەدا قەوماون، نموونەی: شەڕەکانی گەلی عەلی بەگ، بەنی هەریر، ناو شاری رەواندز. پاش رووخانی شای ئێران و هەلگیرساندنەوەی شۆڕش لەرۆژهەلاتی کوردستان لەسالی ١٩٧٩، ناوبراو وەك فەرماندەیەك بەهانای شۆڕشی رۆژهەلاتەوە چووە و، لەشارەکانی مەهاباد و سەردەشت و خانە، چەندین چالاکی ئەنجام داوە. لەنەورۆزی ١٩٧٩، لەیەکێتی هاتۆتە دەرەوە و بۆتە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری و سەرپەرشتیکاری هەرێمەکانی (١٠، ١١، ١٢، ١٤)ی هێزی پێشمەرگەی (حسیك).

هەر لەم سالەدا، لەشەڕە بەناوبانگەکەی (سماقولی)، لە ١٩٧٩/١٢/٢٤، لەگەل (شینەبۆلی) فەرماندە، شەهید بووە[٤٥٨].

## ٢٥- عەولا سوور

عەبدوللا رەسول مەحمود عەبدوللا، ناسراو بە (عەبدوللا سوور)، لەسالی ١٩٤١، لەگوندی (ئێندزە)ی بناری چیای قەندیل، لەدایك بووە. باوکی ناوبراو، وەك پێشمەرگەیەك، بەشداری کۆماری مەهابادی، کردووە. عەولا سوور، تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی خوێندووە و وازی هێناوە.

لەسالی ١٩٦٣ بۆتە پێشمەرگە. پاش ماوەیەکی کەم بۆتە سەرپەل، لەهێزی کاوە. لەبەر ئازایەتی و لێهاتوویی، لەلایەن رێبەری شۆڕش (مستەفا بارزانی)یەوە خەلات کراوە. پاش نسکۆی ١٩٧٥، گەڕاوەتەوە کوردستان. لەگەل راگەیاندنی بزوتنەوە، پەیوەندی بەریزی پێشمەرگەکانی (بزوتنەوە)وە، کردووە. لەگەل هەندێك لەکەسوکارەکانی لای د. خالید سەعید، بوونەتە پێشمەرگە. رژێم، سێ جار هەولیداوە دەستگیری بکات، یان بیکوژێت، بەلام سەرکەوتوو نەبووە[٤٥٩].

پاش دەرچوونی بزوتنەوە لەیەکێتی، عەولا سوور، لەگەل بزوتنەوە رۆیشتووە. بەشداری یەکەم کۆنگرەی حزبی کردووە. بەهۆی ململانێی ئەوکاتی نێوان بالی د. مەحمود و رەسول مامەند، ناوبراو کەمێك لەخەبات ساردبۆتەوە.

عەتف و خۆشەویستی بۆ (یەکێتی) هەبووە، بۆیە لەکاتی شەڕی نێوان بزوتنەوە و یەکێتیدا، زۆر باوەڕی بەخۆی هەبووە کەیەکێتی شەڕی لەگەڵدا ناکات. پاش دابەشکردنی ئەرکەکانی پێشمەرگایەتی، بۆتە فەرماندەی هەرێمی چواردەی ئاکۆیان.

له ١٩٨١/١٠/٢٨، لەگوندی (خەزێنە)ی دۆڵەڕەقە، بەدیلی لەلایەن هێزەکانی یەکێتی، کەنەوشێروان مستەفا سەرپەرشتی کردوون، شەهید کراوە.

دوای شەهید بوونی، خودی نەوشێروان و بەشێك لەفەرماندە عەسکەرییەکانی یەکێتی، بەم کردەوەیە، دڵگران بووینە.

## ٢٦- قادر مستەفا

قادر مستەفا، لەساڵی ١٩٤٥، لەگوندی (پەلکانە)، لەدایك بووە. سەر بەهۆزی (لەك)ە. لەسەردەمی حەرەس قەومیەکان، لەساڵی ١٩٦٣، لەزیندانی ئەبوغرێب، زیندانی کراوە. بەهەوڵ و لێزانینی خۆی، توانیویەتی لەزیندان رابکات. لەساڵی ١٩٦٤، کەتەمەنی نۆزدە ساڵان بووە، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەی کوردستان (شۆڕشی ئەیلول)، کردووە. چۆتە قوتابخانە و، تا پۆلی دووەمی قۆناغی ناوەندی خوێندوویەتی. لەکاتی نسکۆی ١٩٧٥، فەرماندەی بەتالیۆنی حاجی قەلا بووە لەدەشتی کۆیە. وەك هەڤاڵەکانی، گەڕاوەتەوە عێراق، بەماڵ و منداڵەوە، بۆ ناحیەی (غەمماس)ی سەر بەپارێزگای دیوانیەی باشووری عێراق، دوورخراوەتەوە. لەدوور خراوەییدا، پەیوەندییەکی بەردەوامی لەگەڵ لێپرسراو و دامەزرێنەرانی بزوتنەوەدا هەبووە، بەبەردەوامیش سەردانی کردوون و ئاگاداری جموجۆڵەکان بووە. بەنیازی خۆ ئامادەکردن بۆ چوونەوە شاخ، پێشوەخت: لەرێگای خزمێکی خۆیەوە، خێزان و منداڵەکانی، لەرۆژی ١٩٧٦/٦/٤دا، رەوانی هەولێر کردووە. دوای ئەوە، خۆشی بەنهێنی گەڕاوەتەوە کوردستان و دوای ماوەیەکی کەم، پەیوەندی بەیەکەم مەفرەزەی شاخ کردووە. لەبەر ئەوەی پێشمەرگە بووە، سێ جاران خانەوادە و براکەی، لەلایەن رژێمەوە بەبارمتە گیراون و زیندانی کراون. لەشۆڕشی نوێدا، کۆمەڵێك لێپرسراویەتی هەبووە، لەکاتی شەهید بوونی، فەرماندەی هەرێمی هەشتی

دەشتی هەولێر بووە. بەقسە و دانپیانانی دۆست و نەیارەکانی، قادر مستەفا، مرۆڤێکی تێکۆشەر و کوردپەروەر و دڵسۆزی رێبازەکەی بووە. هەردەم دژی شەڕی ناوخۆ و ئازاردانی خەڵك بووە. مخابن، بەهۆی ململانێی نادروستی ناوخۆی حزب، لەرووداوێکی نەخوازراودا، لەلایەن مەفرەزەیەکی باڵی جیابۆوە، لەرۆژی ١٩٨٥/١١/٥، شەهید کراوە. ئەو مەفرەزەیەی کەبەم کارە نارەوایە هەستان، هەڤاڵ و هاوسەنگەری دێرینی قادر مستەفا بوون. چەندین ساڵ پێکەوە، لەیەك حزب و هەرێم و سەنگەردا، هاوخەباتی یەکتر بوون.

کاتێك کەناوبراو پێشمەرگە بووە، لەرێگای دەزگای مخابەراتەوە لەبەغدا، لەرێگای نامەیەکەوە، بانگهێشتی (عومەر)ی برای کراوە. عومەر لەوە ترساوە راستەوخۆ بچێتە بەغدا. پەیوەندی بەماڵی (شێخ کاکە)، لەهەولێر کردووە. ئەوان، نامەیەکیان بۆ عەبدوڵڵا ئیسماعیل (مەلا ماتۆڕ) نووسیوە و داوایان کردووە کەعومەر بگەیەنێتە دەزگای مخابەرات و داکۆکی لێ بکات. عومەر نامەکەی بردووە، گەیشتۆتە بەغدا و چۆتە دائیرەی مخابەرات. لەوێ لێی دەپرسن: ئێمە تەنها چەند پرسیارێکمان لەتۆ هەیە، تکایە بەراستی وەڵاممان بدەرەوە: (ئایا قادر مستەفای برات، عاشقی ژن، پارە، مەنسەبە؟!).

عومەریش وەڵامیان دەداتەوە و پێیان دەڵێت: ناوەڵڵا، ئەو عاشقی ئەو شتانە نییە. ئەگەر عاشقی ژن بوایە، ژنەکەی خۆی بەتەنیا بەجێ نەدەهێشت. مخابەرات، ئەمجارە بەوەندە وازی لێ دەهێنن و بۆ هەولێری دەنێرنەوە. مخابەرات مەبەستی بووە بزانێت، قادر مستەفا بەچ شتێك ئیغرا دەبێت و دەتوانرێت دەستەمۆ بکرێت.

قادر ستەفا، لەدوای خۆی، چوار کچ و چوار کوڕی بەجێهێشتووە[٤٦٠].

## ٢٧- رەئوف خەلیفە سەعید

لەساڵی ١٩٤٦، لەگوندی (قەدەفەر)ی دەڤەری شارەزوور، لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٥٤ چۆتە قوتابخانەی گوندی (ناوگردان). تا پۆلی سێیی ناوەندی خوێندووە. پەیوەندی بەرێکخستنەکانی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)ەوە کردووە. لەتەموزی ١٩٧٦، بۆتە پێشمەرگە. لەساڵی (١٩٨٠)،

سەنگەری خەباتی لەناو کۆمەڵەوە بۆ ناو سۆسیالیست، گواستۆتەوە. لەیەکەم کۆنگرەی حزب بەشداری کردووە و بۆتە ئەندامی لقی سلێمانی حزب. دواتر بۆتە لێپرسراوی هەرێمی پێنج. لەشەوی ٢١-١٩٨١/٧/٢٢، کاتێك کەبەکاروباری رێکخستنەوە بەرەو گوندی (قەدەفەر) چووە، کەوتۆتە کەمینی جاشەکانی رژێم و شەهید کراوە. لەدوای خۆی، سێ کوڕ و سێ کچی بۆ کوردستان بەجێ هێشتووە. ئەوکاتەی کەشەهید کراوە، بۆ رێزگرتن لەشەهید بوونی سەیدا ساڵح یوسفی، هەر پارچە قوماشی رەشی بەیەخەوە، بووە[٤٦١].

## ٢٨- مەجید حەمید کاکەیی

لەساڵی ١٩٥٠، لەشارەدێی (داقوق)ی سەر بەپارێزگای کەرکوك لەدایك بووە. لەساڵی ١٩٧٣، کۆلیژی سەربازی، بەپلەی ملازم، لەبەغدا تەواو کردووە. لەگەڵ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەساڵی ١٩٧٤، پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە، کردووە و بۆتە جێگری فەرماندەی بەتالیۆنی (نەهلە)، لەدەشتی موسڵ. هەروەها ئەندامی مەکتەبی عەسکەری بووە. دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥، هاوشێوەی بەشێك لەهەڤاڵەکانی، ئاوارەی ئێران بووە. لەساڵی (١٩٧٦)، گەڕاوەتەوە عێراق، بۆ شاری (عیمارە)ی باشووری عێراق دوورخراوەتەوە و پلەی سەربازیشی لێ وەرگیراوەتەوە. لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٦، لە (عیمارە)وە، پەیوەندی بەرێکخستنەکانی (بزوتنەوە) کردووە. دواتر بۆتە پێشمەرگە و بۆتە ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی حزب لە ١٩٨١/٥/١٢. لەسەر راسپاردەی حزب، گەڕاوەتەوە شار و بۆتە بەرپرسی رێکخستنەکانی ناوخۆی بەغدا و کەرکوك. لەبەهاری ١٩٨٩دا، لەگەڵ پۆلێك لەرێکخستنەکانەوە، لەلایەن رژێمەوە گیراوە.

لە ١٩٨٩/١٠/١١، لە (ئەمنە سوورەکە)ی شاری سلێمانی، گوللەباران و شەهید کراوە.

## سەرکردەکانی (بزوتنەوە) لە (دیداری تەمەن)دا

(دیداری تەمەن)، چاوپێکەوتنێکی دوور و درێژ و بەرفراوانی (سەلاح رەشید)ە، کەلەگەڵ (مام جەلال)دا، لەئایاری (١٩٩٠) و بەدواوە ئەنجامی داوە. لەکتێبێکی دوو بەرگیدا، لەساڵی ٢٠١٧دا، بڵاوکراوەتەوە. لەم دیمانەیەدا، مام جەلال، زۆر بابەت و نهێنی درکاندووە. بیروبۆچوونی خۆیشی لەمەڕ کەسایەتی و رووداوەکاندا، بە (ئەرێنی و نەرێنی)یەوە، خستۆتەڕوو. کەکتێبەکە بڵاوکرایەوە، چەندین نووسین و وەڵام و روونکردنەوە و کۆمێنتی لەسەر نووسرا و، بڵاوکرایەوە. خاوەنی زۆربەی بابەتەکان، بەگومانەوە لەم دیمانەیان روانیوە و پێیان وابووە، ئەوانە، وەڵام و قسەی (مام جەلال) نین و، باوەڕ ناکرێت (مام) شتی لەم بابەتەی گوتبێت، بەتایبەتی ئەو تۆمەت و ناو زڕاندنانەی کەدراوەتە پاڵ هەڤاڵەکانی. هەرچەندە خودی ئامادەکار (سەلاح رەشید)، جەختی لەراستی بۆچوونەکان کردۆتەوە کەقسەی (مام جەلال)ن و پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کەهەموو قسەکان، بەتۆمارکراوی لەسەر کاسێت لەلای ئەو پارێزراون و بۆ ئەو کەسانەی کەگومانیان لەم قسانە هەیە، دەتوانن گوێ بیستی کاسێتەکە بن. پێچەوانەی ئەوانەی کەباوەڕ ناکەن ئەمانە قسەی (مام) بن، ئێمە پێمان وایە، قسەکانی (سەلاح رەشید)، راست و دروستن. ئەو بۆچوون و قسانە هی (مام)ن و، لەکاتی خۆیدا دەری بڕیون.

بۆ سەلماندنی راستی ئەم قسەیەشمان، کۆمەڵێك راوبۆچوونی دژ بەیەکی (مام)، لەقۆناغە جیاجیاکانی خەبات، دەربارەی هەڤاڵەکانی، کەوەك دیکۆمێنت بڵاوکراونەتەوە و پارێزراون، وەك نموونە، دەهێنینەوە.

هەموو مرۆڤێکیش، با لەهەر تەمەن و پلە و پۆستێکی سیاسیشدا بێت، دەکرێت هەڵەی کردبێت و قابیلی ئەوە بێت کەلەلایەن خەڵکی ترەوە، رەخنەی لێ بگیرێت. دەربارەی ئەم بابەتە، خودی (مام)، لەساڵی ١٩٩٢دا، وتارێکی نووسیوە و لەژمارە (٥٠١)ی رۆژی ١٩٩٢/١٠/٥ی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)دا، بڵاوکراوەتەوە. هەمان وتار، جارێکی تر لەهەمان رۆژنامە و لەلاپەڕە (٥)ی ژمارە (٧٣١٤)ی رۆژی ١٤-٢٠١٧/٧/١٥دا، بڵاوکراوەتەوە. لەم وتارەیدا، (مام) دەنووسێت: (مام جەلال لەژیانی سیاسی دوور و درێژی خۆیدا هەندێ

هەڵەی دیاری کردووە و هەندێ جاریش بەشداری هەڵەی دیاری تر بووە، بۆیە هەق و رەوایە رەخنەی لێ بگیرێت... مام جەلال خۆی بەسۆسیالیستی دیموکرات دادەنێت، هەردوو وشەکەش رەخنە و گلەیی حەلاڵ دەکەن و بەرەوا و هەق و پێویستیشیان دەزانن. خۆی لەخۆیدا بیروباوەڕی سۆسیالیستی بیروباوەڕێکی رەخنەگرانەیە، دیموکراسیش لەپێشەوە دەکاتە هەقی دەربڕینی بیروڕای جیاجیا و جیاواز و رایەکەی تر و رەخنە و گلەیی لەهەموو شتێك...)[٤٦٢].

لەژێر رۆشنایی ئەم وتارە و بیروباوەڕی (مام) بەدیموکراسی و رەخنە، دەتوانین بۆچوون و رای جیاوازی خۆمان دەربارەی (دیداری تەمەن)، بخەینەڕوو و، ئەو مافەش بەخۆمان بدەین، کەلەگەڵ هەندێك لەبۆچوونەکان، نەبین. هەموو بۆچوون و کۆمێنتەکانیشم بەبەڵگەی بڵاوکراوە و دیکۆمێنت کراو، دەخەمە روو، تاوەکو لەقسەی گێرفان و، گۆترە و گۆترەکارییەوە، دوور بن.

- مام دەڵێت: (... بەتەقدیری خۆم و بەپێی ئەو زانیارییانەی کەمن و نەوشێروان دەستمان کەوت، ئەو جوڵانەوەیە- بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، ئیسماعیل- دەستی حکومەتی تێدا بوو). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل٥٢.

هەروەها دەڵێت: (هەندێك سەرکردەیان کەپەیوەندیان لەگەڵ حکومەت هەبوو، دوای کارەساتی هەکاری پێیوابوو، هەلێکی باش رەخساوە بۆ ئەوەی یەکێتیش لەرووی سیاسییەوە لەناو خۆیدا هەڵتەکێنێتەوە و بەناوی جیاکردنەوەی بزوتنەوە دووبەرەکی خستە ناو یەکێتیەوە... مەلا ناسیح وا ناسرابوو پەیوەندی لەگەڵ حکومەت هەیە و لەبنەوە سەرێکی بەئەمنەوە بەستراوە). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل١٢٩.

یەکێتی، دوای جودابوونەوەی (بزوتنەوە)، دەیان ناو و ناتۆرەی خستە پاڵی و چەندین وتار و بابەتی، لەئیستگەکەیان، لەسەریان بڵاوکردەوە، بەتاقمی گومانلێکراو، دەستی رژێم، پەیوەندی بوون لەگەڵ حکومەت، تاوانباری کردن. ئەوکات، دەیانگوت: ئەوانەی لەیەکێتی دەرچوون، بەشێکی کەم و گومانلێکراو و سەر بەرژێمن، بزوتنەوە رەسەنەکان لەناو یەکێتیدا ماونەتەوە... بەڵام هەر

ئەم (رەسوڵ مامەند)ە و، ئەو بەشەی کەلەگەڵیدا لەیەکێتی جودابوونەوە، کاتێك کەلەشوباتی (١٩٩٣)دا، بڕیاری ئەوەیاندا کەخەباتی خۆیان بگوازنەوە ناو یەکێتی، (مام)، پێی گوتن: (بەشی هەرە زۆریان لەسۆسیالیستە رەسەنەکان بوون، بەسەرۆکایەتی رەسوڵ مامەند کەکۆنیش یەکێتی بوون، پێیان باشبوو بێنە ناوی یەکێتییەوە... ئێمە هاتنەوەی ئەم برادەرانەمان پێباشبوو، چونکە هەم جەماوەرێکی باشیان لەگەڵ بوو وەژمارەیەکی زۆری خەڵکیان گەڕاندەوە بۆ ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل٢٣٥.

هەروەها، (مام) لەوتاری یەکگرتنەوەدا گوتی: (پێویستە ئەو راستییە بڵێین کەحزبی سۆسیالیستی کوردستان لەسەرەتای دامەزراندنییەوە، چەند ئیختیلافیش بوو بێت لەبەینی ئەو و ینك دا، بەڵام هێزێکی تێکۆشەری خۆڕاگری نەبەز بووە لەشۆڕشی کوردستاندا)[٤٦٣].

هەر ئەم (رەسوڵ مامەند)ەی کەلەکاتی جیابوونەوە، بەگومانلێکراو و دەستی رژێم ناویان دەبرد، کاتێك کەگەڕایەوە ناو یەکێتی بووە کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و جێگای متمانەی (مام). (مام) کاتێك کەسەفەری دەرەوەی وڵاتی دەکرد، (مۆرەکەی مەکتەب سیاسی یەکێتی دەدایە رەسوڵ مامەند و زۆریش متمانەی پێی هەبوو)[٤٦٤].

کەرەسوڵ مامەند لەرۆژی ١٢/٤/١٩٩٤، لەشاری لەندەن کۆچی دوایی کرد، مام جەلال بەبۆنەی ئەم کۆچەوە وتارێکی لەکوردستانی نوێ، ژمارە (٦٦١)ی رۆژی ١٥/٤/١٩٩٤دا، بڵاوکردەوە و لەوێدا گوتی: (رەسوڵ مامەند رۆڵێکی دیاری بینی لەهەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان و دامەزراندنی ینك و راستکردنەوەی باری لاری کوردایەتی دا. بەدرێژایی شۆڕشی نوێی گەلەکەشمان نەبەزانە لەریزی ینك دا وەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی و ئینجا لەریزی حزبی سۆسیالیستی کوردستاندا وەك سکرتێری گشتی حزبەکە بێ وچان و کۆڵدان درێژەی بەخەباتەکەی داوە)[٤٦٥].

هەر بەبۆنەی کۆچی دوایی رەسوڵ مامەندەوە، مەکتەبی سیاسی ینك بەیانێکی دەرکرد و، لەوێدا هاتووە: (رەسوڵ مامەند هەمیشە گیانی چاوگی

کوردایەتی و لەخۆبووردن بوو. دەمێ ساڵە و لەرۆژانی هەرە تاریك و نوتەکدا پێشمەرگەی گیان لەسەر دەست و بوێری ناو سەنگەرەکانی شۆڕش و بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران بوو. تەواوی شاخ و پێدەشت و لێرەوار و ڕێ و بانەکانی کوردستان شایەتی بۆ جوامێری و خەباتی هەرگیز نەپساوەی ئەو دەدەن)(٤٦٦).

لەیادی یەکەم ساڵڕۆژی کۆچی دوایشیدا، (مام)، لەوتارێکیدا بەناوی لەیادی ساڵڕۆژی کۆچی دوایی کاك رەسوڵ مامەند، لە ١٩٩٥/٤/١٢دا، گوتی: (لەبیرەوەری هەڤاڵی تێکۆشەر و کۆڵنەدەری ڕێگای رزگاری و دیموکراتی خەڵکی کوردستاندا کاك رەسوڵ مامەند، زۆر شت هەیە و دەبێ و پێویستە باسیان بکەین بەڵام بەراستی ئەگەر بەدوور و درێژی لەسەری بڕۆین پێویستی بەچەندین نامیلکە و وتار هەیە. خوالێخۆشبوو کاك رەسوڵ مامەند دەورێکی دیار و ئاشکرای بینی لەبوژاندنەوەی کوردایەتی و شۆڕشی نوێ دا... لەسەرەتای شۆڕشی نوێ وە لەدەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ وە هەتا ڕاپەڕینی گەلەکەمان کاك رەسوڵ مامەند بێ وچان بێ کۆڵدان لەشاخ و داخی کوردستان مایەوە و هەوڵ و کۆششی دلێرانەی خۆی درێژە پێدا لەدژی دیکتاتۆریەت و لەپێناوی بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی گەلەکەمان دا هەرچەندە بۆ ماوەیەك زۆر بەداخەوە ناکۆکی و ناتەبایی کەوتە نێوان شەهیدی نەمر کاك رەسوڵ مامەند و براکانی لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا بەڵام لەراستیدا ئەوە ناکۆکی نەبوو لەسەر ڕێبازی خەبات و لەسەر پێویستی درێژەپێدان و گەشەپێدانی شۆڕشی نوێ و سەرخستنی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانە لەکۆڕی کوردایەتیدا بەڵکو هەمان ڕێباز درێژەی پێدرا. بەم جۆرە کاك رەسوڵ هەم دەستپێکی خێر و هەم ئاخیری خێر بووە وەهەم لەدرێژایی خەباتی کۆڵنەدەرانە و نەبەزانەی خۆیدا ڕێگای راستی گرتووە)(٤٦٧).

دەربارەی (مەلا ناسیح)یش، (مام) لەساڵی ٢٠٠١دا، لەمەراسیمێکی تایبەتیدا لەچەمی ڕێزان، باخچەیەکی بەناو کرد و هەر خۆیشی هاورێیەتی کرد بۆ کردنەوەی باخچەکە، هەروەها لەدوای خۆی، هیچی بەجێ نەهێشت تەنیا موچەیەکی خانەنشینی نەبێت، ئەویش هەر بەئەمری مام جەلال بوو(٤٦٨).

جگـــه لەمـــەش، لەســـاڵی ٢٠١٢، بەماوەیـــەکی کـــەم دوای یادکردنـــەوەی دامەزراندنی یەکێتی، لەکاتی چوونی لە (دەباشان)ەوە بۆ (چەمی ڕێزان)، لەناو ئۆتۆمبیل، بەدرێژایی ئەم ڕێگایە، بەشـاهیدی هـاوڕێ و هاوخەباتـە نزیکـەکانی: (باسی دەور و جوامێری و نیشتمانپەروەری مەلا ناسیح)ی کردووە[٤٦٩].

دەربـارەی پەیوەنـدی بـوونی (عـەلی هـەژار و کـاردۆ گـەلاڵی) بەرژێمـەوە، کەیەکێتی ئیدعای زۆری لەسەر دەکرد، یەکێك لەدامەزرێنەران و دۆستی نزیکـی مام جەلال، کە (عومەر شێخ مووس)ە، ئەو ئیدعایە بەتاڵ دەکاتەوە و دەیخاتە چوارچـێوەی ململانێـی ئـەوکاتی حزبایەتییـەوە. ئێمـە لەشـوێنێکی تـری ئـەم کتێبەدا، ئاماژەمان بەقسەکانی (عومەر شێخ مـووس) کـردووە. جگـە لەمـەش، ئەگەر ئەوانە دەستی ڕژێم بوون:

– بۆ لەلایەن ڕژێمەوە دەگیران؟!

– کەگیران بۆ شون بزر کران و تەنانەت تەرمەکانیشیان بـۆ کـەس و کاریـان نەگەڕێندرایەوە؟!

– ئەگەر ئەوانـە قارەمـانی ڕێگـای خـەبات و تێکۆشـەری زیندانـەکانی ڕژێـم نەبووبن، بۆ کەگیران ئیعترافیان لەسەر یەك کـەس لەرێکخستنەکانی بزوتنـەوە نەکرد؟! ئەوە تـەواو پێـچەوانەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵـە بـوو. سـەرکردەکانی کۆمەڵـە، لـەدوای نـسکۆ کەگەڕانـەوە عێـراق، ئاشـکرا دەبـن و بەشـێکی هـەرە زۆریـان دەگیرێـن و نـاتوانن لەبەرامبـەر ئـازاری ئەشـکەنجەدان خـۆڕاگربن... دەربـارەی ئـەم بابەتـە، مـەلا بـەختیار دەنووسـێت: (... دوای گرتنـی دەیـان هاوڕێی کۆمەڵە لەهەولێر و کەرکوك و سلێمانی، یـەك یـەك و پـۆل پـۆل گرتنـی هاوڕێیان لەخۆڕا نەبووە، کاتێك کەئەو کەسـانە دانیـان بـەبوونی کۆمەڵـە نـاوە، بەئەنـدامێتی خۆیـان، تەنانــەت هەشـیانە ڕوو بـەڕوو لەگـەڵ هەنـدێ هـاوڕێ خۆڕاگرەکان دانیشتوون و زمانیان لێداون)[٤٧٠].

دەربـارەی جودابوونـەوەی بزوتنـەوە لەیـەکێتیش، ئـەوکات بزوتنـەوە، هۆکارەکـەی بـۆ دژایـەتی کردنیـان لەلایـەن کۆمەڵـە و ناعەدالـەتی مـام جـەلال دەرهـەق بەباڵـەکانی یـەکێتی (کۆمەڵـە و بزوتنـەوە)، دەگەڕێنـدەوە. ئـەوکات، یەکێتی ئەم ئیدیعایـەی ئـەوانی ڕەت دەکـردەوە... دوای تێپـەڕبوونی چـەندین

ساڵ، ئەوە هەر مام جەلال و سەرکردەکانی یەکێتین، دان بەم راستییەدا دەنێن. مام جەلال، لەم بارەیەوە دەڵێت: (.. من خۆم هەم بەکۆمەڵە زانیوە هەم شۆرشگێران- بزوتنەوەی جاران، ئیسماعیل- واتا هیچ کاتێك خۆم بەجیا نەزانیوە لەکۆمەڵە و شۆرشگێران. ئەگەر رۆژێك هاتبێت و وتبێتیان تەرازووەکە بەلای کام لادا دەشکێنیت، بێگومان من زۆرتری بەلای کۆمەڵەدا دامشکاندووە...). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل٣٨٨.

لەگێڕانەوەی رووداوەکانی هەردوو بەرگی دیدارەکەشدا، ئەوە دەرکەوتووە کەمام جەلال چەندە لەکۆمەڵەوە نزیك بووە تا ئەو رادەیەی، کۆمەڵە واتای ئێوە، ئێوەش واتا کۆمەڵە[٤٧١].

لەشوێنێکی تری دیداری تەمەن، مام جەلال دەڵێت: (بەراستی ئەو برادەرانە- سەرکردەکانی ئاڵای شۆڕش کەئەوکات کۆمەڵە و دەست رۆیشتوو بوون، ئیسماعیل-، دەورێکی خراپیان هەبوو لەتۆراندنی رەسوڵ مامەند و دەرپەڕاندنیان). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل١١٤.

بەقسەی مام جەلال: (کۆمەڵە بڕوایان بەسیاسەتی پیلانگێڕی و گرتنی لەغافڵەت هەبووە، کاتێك کەجەماعەتی رەسوڵ مامەند زویر دەبن و مام جەلال داوا دەکات کێشەکان بەدانیشتن و گفتوگۆ چارەسەر بکەن. ئەو باڵەی کۆمەڵە پێشنیار دەکەن بانگیان بکەین بۆ دەعوەت و لەوێ سواری سەریان بین و هەموویان بگرین). بڕوانە: دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل١٠٧.

ئەو بۆچوونەی مامجەلال، ئەگەر هەمووشی راست نەبێت، ئەوە چەند راستییەکی تێدایە، چونکە لەکاتی کوشتنی شێرکۆ شێخ عەلی و عەولا سووردا، هەمان سیاسەتیان، پەیڕەو کردووە.

لەسەر لەبەری هەردوو بەشی دیدارەکەدا، مام جەلال ئەگەر بەنەرمیش بێت نوقورچکی لەهەموو هاوڕێیان و هاوخەباتی خۆیدا گرتووە، تاکەکەس کەلەم نوقورچ گرتنەدا رزگاری بووبێت، (نەوشیروان مستەفا)یە. لەهەردوو بەشەکەدا، ئەوەندە بەئەرێنی باسی ناوبراوی کردووە و لەهەموو پلان و پێشنیار و کارێکدا پشتی پێ بەستووە و پرس و راوێژی پێکردووە. (نهێنییەکانیشی تەنها لای هێرۆخان و نەوشیروان، درکاندووە، دیداری تەمەن، بەشی دووەم، ل٣٧٤).

هەربۆیە دوای شەهید بوونی شاسوار جەلال (ئارام)، مام جەلال دێت و نەوشێروان دەکاتە کەسی یەکەم و سکرتێری کۆمەڵە. ئەوە لەکاتێکدا بووە کەخودی نەوشێروان ئەوەندە کار و خەباتی بۆ کۆمەڵە نەکردووە و، تەنها و تەنها (پەیوەندی فەردی بەکۆمەڵەوە هەبووە و سەعاتێکیش خۆی بۆ ماندوو نەکردووە)[٤٧٢]. وەك لەبیرەوەرییەکانی خۆشیدا دەردەکەوێت کە: (نەبڕوای بەمارکسی- لینینی و نەبڕوای بەکۆمەڵە هەبووە)[٤٧٣]. ساڵی ١٩٧٧، لەکاتی گەڕانەوەی بۆ کوردستان، بەئاشکرا گوتوویەتی: (من باوەڕم بەکۆمۆنیزم نییە)[٤٧٤]. کەچی مام جەلال: (بەشێوەیەکی بێ سنوور پشتیوانی لێدەکرد و رەنگە بەشی زۆری دەسەڵاتی خۆی بەئەو سپاردبێت بۆ ئەوەی لەکارەکانی سەرکەوتوو بێت)[٤٧٥]. هەر بۆیە ناوبراو- نەوشێروان-، (ویستوویەتی لەسێبەری مام جەلالدا دەسەڵاتی هەبێت و ئەو کارانە بکات کەخۆی بەباشی دەزانێت)[٤٧٦].

هەر ئەو هاوڕێ نزیك و جێی متمانەیەی (مام جەلال)، کاتێك کەلەسیاسەتەکانی یەکێتی رازی نابێت و لەساڵی (٢٠٠٩)دا، جیا دەبێتەوە و (بزوتنەوەی گۆڕان)، دادەمەزرێنێت، مام جەلال، لەراپۆرتێکدا کەلەپلینۆمی چوارەمی یەکێتی لە ٢٩-٣١/١٠/٢٠٠٩دا، خوێندییەوە، بەتوندی هێرشی کردۆتە سەر نەوشێروان و، بەم شێوەیە تاوانباری کردووە:

- نەوشێروان ئەوەندە توندوتیژ بووە پیلانی داناوە بۆ دەرپەڕاندنی نەیارە فکری و سیاسییەکانی لەکۆنفرانسەکانی کۆمەڵەی رەنجدەراندا، تا کار گەیشتە جیابوونەوەی ئاڵای شۆڕش. لەناوخۆشدا، بێ ئاگاداری سکرتێری گشتی و نیوەی مەکتەبی سیاسی و ناوەندی کۆمەڵەش، بڕیاری کوشتنی خەڵکی لەشار و لادێ دەردەکرد. ئەمەش بووە هۆیەکی گەورەی ناکۆکی ئێمە مانان لەگەڵ هێڵی نەوشێروان لەساڵی ١٩٨١ەوە لەناو کۆمەڵەدا.
- بەهۆی ئەوەی کەنەوشێروان سەرکردایەتی شەڕی (پشت ئاشان)ی کردووە، رووداوەکانی لەشەڕی (قرناقا و پشت ئاشان)دا، بەهۆی گرتنەبەری سیاسەتێکی عەسکەری بڕیار لێنەدراوەوە، خراپ و نامرۆڤانە شکانەوە و رووداوی زۆر نالەباریان لێکەوتەوە، کەئەم رووداوانە لەمەڵبەندی یەکی

سلێمانیدا رووی نەدا.

- نەوشێروان لەرووی فیکریشەوە بەئاشکرا دەیگوت: مارکسیزم گەڕوگول بووە و سۆسیالیزم باوی نەماوە، کەچی خۆشی سکرتێری کۆمەڵەی مارکسی– لینینی بوو! هەر ئەو باوەڕەی ئەویش بنەمای فیکری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە بوو لەدواییدا.
- لەکاتی شەڕکردنی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا نەوشێروان هەوڵ دەدا شەڕەکە بکاتە شەڕی کورد و عەرەب، بەرواڵەتیش شەڕەکەی دەکردە شەڕی کورد و عەرەب نەك شەڕی کوردایەتی لەدژی دیکتاتۆریەت، ئەمەش پاساوی دەدایە شۆڤێنیەکان، بۆ زیاتر ئەنجامدانی تاوان. هەروەك گاڵتەشی بەدروشمەکانی برایەتی کورد و عەرەب و هاوخەباتی هێزەکانی کورد و عەرەب دەهات.
- بێ رەزامەندی سکرتێری گشتی کەفەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەش بوو، بەبێ رەزامەندی زۆربەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی فەرمانی دابوو وەك هێزێك هاریکاری ئێران بکات بۆ رزگارکردنی هەڵەبجە.
- لەسەر ئەوەش لەگەڵ نەوشێروان ناکۆك بووین، چونکە ئەو پێی وابوو کەلەسەدام نادرێت، تەنانەت دوای پەلاماردانی کوێتیش پێی وابوو سەدام دەکشێتەوە، بۆیە داوای گفتوگۆی لەگەڵ سەدام دەکرد. ئەوەبوو، بێ پرسی هەڤاڵانیش، بەتایبەتی سکرتێری گشتی کەوتە نامە ناردن بۆ سەدام و هەوڵدانی لاواز بۆ رێککەوتنێکی لاواز بەهیوای ئەوەی سیاسەتی خۆی بباتە سەر. کەچی سەدام ئامادە نەبوو چارەسەرێکی لاوازیش بۆ کێشەکە بسەلمێنێ، بەڵکو شەخسی خۆی ئامادە نەبوو وەڵامی یەك نامەی بداتەوە.
- ناکۆکیەکی تری سەرەکی لەنێوانماندا، لەسەروبەندی راوەستانی شەڕی ئێران– عێراق بوو، لەوساتەدا سکرتێری کۆمەڵە باوەڕی بەشۆڕش نەمابوو، لەدوای شەڕی سەرکردایەتی ورەی بەردابوو، بەپەلە پڕوزە ناوچەکەی بەجێهێشت بەسەر هەڤاڵانی سەرکردایەتیدا بێ ئەوەی پرس و راوێژیان پێ بکات.
- نەوشێروان دژی کوردایەتی، دژی هاتنەوەی کەرکوك بۆ سەر کوردستان، دژی بادینی بووە بەکوردیانی دانەناوە. گوتوویەتی: کەرکوکی، کەس نازانێ

چین؟ دەربارەی هەولێریش قسەی قێزەوەنی کردووە... بۆیە گوتوویەتی: هەر سلێمانیمان بەسە.

- ... نەوشیروان دەستی بەپیلان دانان بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی دژایەنی ی.ن.ك و لاواز کردن و لەبەر یەك هەڵتەکاندنی کرد... بەبیانووی ئەوەی تاقەتی حزبایەتی نەماوە لەگەڵ ئەم سەرکردایەتییە، دەستی لەیەکێتی هەڵگرت، بەپێی نەخشەیەکیش، کەپاشان ئاشکرا بوو، داوای کرد کەبۆ دانانی پەیمانگایەکی کوردایەتی پارمەتی بدرێ... سکرتێری گشتی سەرەرای بۆچوونی جیاواز لەناو مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی، باوەری پێ کرد و پارەی کەداوای کرد، دە ملیۆن دۆلار و گردەکە و هەندێ شتی تری بۆ دابین کرد. ئەویش لەجیاتی توێژینەوەی ستراتیژی، کۆمپانیای وشەی پێ دانا، تەلەفزیۆن و رۆژنامە و رادیۆی پێ دانا و کەوتە دژایەتی ی.ن.ك[٤٧٧].

هەرچەندە (نەوشیروان)یش لەچەندین شوێن دانی بەوەدا ناوە کەپەیوەندییەکی باشی هاورێیەتی و هاوخەباتی مێژوویی لەگەڵ (مام جەلال)دا هەبووە[٤٧٨]، کەچی لەراپۆرتێکی دوور و درێژ، بەناوی: (لەهاوخەباتییەوە بۆ تەخوین)، وەلامی (مام جەلال)ی داوەتەوە. ئەم وەلامە کاتی خۆی لەراگەیاندنەکانی (بزوتنەوەی گۆڕان)، بەفراوانی و دواتریش لەدوو تویی کتێبدا، بلاو کرایەوە. لەوێدا، نەوشیروان دەنووسێت: (... وتارەکەی مام جەلال پڕن لەقسەی ناکۆك و رستەی ناهاوسەنگ. ئەوەی لەشوێنێك ئەیلێ لەشوێنێکی تردا پێچەوانەکەی ئەڵێ).

محەمەدی حاجی مەحمود، یەکێك بووە لەپێشمەرگە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ. بەهۆی لێهاتوویی و تێکۆشانی خۆی لەناو شۆڕشدا بۆتە فەرماندەی هەرێمی یەکی یەکێتی... بەهۆی ئەوەی ناوبراو، راو بۆچوونی خۆی هەبووە و نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری باڵەکانی کۆمەڵەوە، لەلایەن هەندێك لەبەرپرسەکانی ئەو سەردەمەی یەکێتی، دژایەتی زۆری کراوە... لەژێر ئەم فشار و پاڵەپەستۆیەدا، لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا، ناچارکراوە ریزەکانی یەکێتی بەجێ بهێڵێت و بچێتە ناو سۆسیالیستەوە. ئەوکات، یەکێتی بەیانی لەسەر

دەرکرد، زۆر بەخراپییەوە باسی رابردوو و خەباتی ناوبراوی دەکرد و ئەوەی بڵاو دەکردەوە کەلەریزەکانی یەکێتی، دەریانکردووە. هەر حەوت هەشت مانگ دوای ئەم جێهێشتن و بەیان لەسەر دەرکردنە، خودی (مام جەلال)، لە ١٩٨١/٨/١٢، نامە بۆ ناوبراو دەنێرێت و داوای گەڕانەوەی لێدەکات. لەنامەکەدا، زۆر بەئەرێنی باسی رابردوو و خەباتی ئەوی کردووە[٤٧٩].

دوای ئاشتبوونەوەی گشتی و پەیوەندی خراپی یەکێتی لەگەڵ ئێران، یەکێتی هەوڵ دەدات لەگەڵ ئێران پەیوەندی دروست بکات. بۆ ئەم مەبەستە، پەنا بۆ (خاڵە حاجی) و (محەمەدی حاجی مەحمود) دەبات، تا نێوەندگیریان بۆ بکات و رایەڵەی ئەم پەیوەندی و هاریکارییەیان بۆ دروست بکات. بۆ ئەم مەبەستە، مام جەلال لەرێگای (محەمەدی حاجی مەحمود)ەوە نامەیەك بۆ ئایەتوڵڵا مونتەزیری دەنێرێت. مام جەلال لەنامەکەی رۆژی ١٩٨٥/١٢/٢، کەبۆ (محەمەدی حاجی مەحمود)ی ناردووە، پەشیمانی خۆی لەو کارەی کەخۆی و یەکێتی لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا، لەگەڵیان کردووە و ناچاریان کردووە یەکێتی جێ بهێڵێت، دەردەبڕێ و دەڵێت: کاتی خۆی بەهۆی ئەو کەسانەی کەئێستا (ئاڵای شۆڕش)ن، دژایەتی ئەو کراوە. هەروەها دەنووسێت: (.... دیارە خۆشت ئەزانی ئەوێ رۆژێ نەدەکرا دڵی برایانی کۆمەڵە بڕەنجێنم، بۆیە بەقسەی ئەوانم لەگەڵ کردیت. ئەم جارەش پرسم بەکاکە نەوە– نەوشیروان– و ملازم عومەر کرد، زۆر زۆریان پێ خۆش نەبا، پێ باش نەبا، بەلاوە پەسەند نەبا، نامەم بۆت نەدەنووسی وەبەو جۆرە دەستی برایەتیم بۆ درێژ نەدەکردی)[٤٨٠].

ئەو دوو نامەی مام جەلال بۆ محەمەدی حاجی مەحمود، هەموو ئەو بەیان لەسەر دەرکردن و تۆمەت خستنە پاڵ و ناو زڕاندنە بەتاڵ دەکەنەوە و، ئەوە دەردەخەن کەئەوانەی لەسەری (گوتراون، نووسراون، بڵاوکراونەتەوە)، دوورن لەراستی و، بەهۆی ململانێی نێوان باڵ و کەسایەتییە دەست رۆیشتووەکانی ئەوکاتی کۆمەڵە، بووە.

– بەکورتی:

ئەو تۆمەتانەی مام جەلال لەدیداری تەمەن دا داویەتە پاڵ بزوتنەوە و

سەرکردەکانی، کەهەندێك پێیان وایە: (دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی ناکۆکی و جیابوونەوە لەیەکێتی و شەڕ و پێکدادانی ئەوێ ڕۆژێش کەبەدوایدا هات، بەهۆیەوە برینەکان و ناکۆکییەکان قووڵتر بوون، واتە ئەو جۆرە هەڵسەنگاندن و بۆچوونانە هی ئەو زەمەنی جیابوونەوە و دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆییەیە، نەئەو راو بۆچوونانە و نەپێچەوانەکەشی کەبەیەکتری گوتراوە راستن، دەریش کەوت کەچەند هەڵە کراوە بەیەکتری)[481]. پێچەوانەی ئەم بۆچوونە، پێموایە ئەوکاتە ئەو بۆچوونە راست دەبوون کەلەگەرمەی رووداوەکان و لەچوارچێوەی زەمەن و ململانێکاندا، دەربڕابان. ئەم قسانەی مام جەلال کاتێك گوتراون کەسەرکردەکانی ئالای شۆڕش و سۆسیالیست، گەڕاونەتەوە ناو یەکێتی و لەهەمان سەنگەری مام جەلالدا بووینە... پێم وایە: مام جەلال بەتەواوی قەناعەتەوە، ئەم رایانەی دەربڕیوە و کەسایەتی و هاوڕێکانی هەڵسەنگاندووە... بەڵام لەکاتێکدا ئەم قسانەی کردووە، لەزۆر شوێن و کاتی تر، راو بۆچوونی جیاوازی هەبووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەمام جەلال خاوەن هەڵوێست و رایەکی نەگۆڕ نەبووە، بەپێی کات و میزاج و شوێن و بەرژەوەندییەکان، هەڵوێستی خۆی دەربڕیوە و گۆڕیوە.

سەرەڕای ئەو هۆکارانەی کەدەربارەی جیابوونەوەی بزوتنەوە باس کراون، خودی کادیر و سەرکردەکانی ئەوکاتی یەکێتیش ئەو راستییە دەسەلمێنن کە: (سەرانی یەکێتی، کەخۆیان لەدامەزراندنی یەکێتییەوە کاریان دەکرد بۆ تواندنەوەی باڵەکانی ناو یەکێتی لەحزبێکدا، تاڵەبانی و نەوشیروان لەهەوڵەکانیان بۆ تواندنەوەی کۆمەڵە و بزوتنەوە نەکەوتن، تا دواتر بووە مایەی شەڕێکی خوێناوی گەورە لەناو خودی باڵەکانی یەکێتیدا... ئامانجیان و مەبەستیان کارکردن بوو، کۆمەڵە و بزوتنەوە لەناو یەکێتی دا و، یەکێتیش لەخودی تاڵەبانیدا بتوێننەوە... یەکێتی تا دەهات، لەناوچەکانی سلێمانی و هەولێردا لەبەرامبەر حزبی سۆسیالیستی کوردستان و لایەنەکانی جوددا لەرێگای مۆنۆپۆلکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتییەوە، ئەگەری شەڕی ناوخۆی لەگەڵ ئەو لایەنانەدا زیاتر دەکرد)[482]. جگە لەمەش: (سەرکردایەتی بزوتنەوە کەخاوەن ئەزموونێك بوون لەگەڵ تاڵەبانی، هەر زوو هەستیان بەئامانجەکانی

تاڵــەبانی لەشــەڕکردن لەگــەڵ قیــادەی موەقەتــە کــرد... رازی نــەبوون درێژەپێدەری سیاسەتە شکست خواردووەکەی شەڕی ناوخۆی جەلالی و مەلایی شەســتەکان بــن... لەیــەکێتی چــوونە دەرەوە... بــۆ پڕکردنــەوەی بۆشــایی جیابوونەوەی بزوتنەوە لەیەکێتی، تاڵەبانی هــەوڵی دروســتکردنی رێکخراوێکــی کارتۆنی هەر بەو ناوە وەدا و هەندێ کۆنــە جــەلالی شەســتەکانی لەشــارەکانەوە هێنــا و وەك ســەرکردایەتی نــوێی بزوتنــەوەی ناســاندن، بــەڵام ئەوانــە رۆژێــك لەرۆژان نەیانتوانی جێگەی بزوتنەوە بگرنەوە)(٤٨٣).

# ئەنجـــام

* دوای رێککەوتننامـەی جـەزائیری نێـوان شـای ئێـران و سـەدام حوسـێن لـە ١٩٧٥/٣/٦دا، بـەبڕیارێکی نێودەوڵـەتی کۆتاییـان بەشۆڕشـی ئـەیلول هێنـا. ئێـران دەرگـای سـنوورەکانی بـەرووی شۆڕشـدا داخـست و یارمەتییـە زۆر و بەردەوامەکانی، کت و پڕ، بڕی. لەم سەروبەندەدا، کۆمـەڵێك خـەڵك بـەنیازی بەردەوامیـدان بەشـۆڕش، چـەند کۆبوونەوەیـەکیان کـرد، بـەڵام بـێ ئـەنجام بـوون. سـەرکردە و فەرمانـدە عەسـکەرییەکانی شـۆڕش، ببوونـە دوو بـەش: بەشـێکیان راسـتەوخۆ بـەدەم لێبووردنەکـەی عێراقـەوە چـوون و، تەسـلیم بوونەوە. بەشەکەی تریان، ئاوارەی شارەکانی رۆژهـەڵاتی کوردسـتان بـوون. هەندێك لەوانەی کەچوونە رۆژهەڵات، بـەنیازی دۆزینـەوەی ئەلتـەرناتیڤێك بـۆ درێژەدان بەشۆڕش، چەندین کۆبوونـەوەیان لەشـارەکانی: (ورمـێ، نەغـەدە، مەهاباد)، ئەنجامدا. لەوێ، گەیشتنە ئـەو ئەنجامـەی کەبگەڕێنـەوە عێـراق و لەوێوە لەناو جەماوەری خۆیانـدا، بەرنامەیـەکی تـازە، بـەنیازی دامەزرانـدنی (حزب، رێکخراو)ێکی خاوەن ئاراستەی سێیەم دوور لەدوو ئاراستە کلاسیکیە باوەکەی ناسراو بە (جەلالی و مەلایی) دابمەزرێنن.

ئەوان، کەگەڕانەوە عێراق، حکومەت هەر یەکەیانی بۆ شار و شارۆچکەیەکی باشـــوری وڵات، دوورخـــستنەوە... ئەوانـــە، بـــەردەوامبوون لەپەیوەندییـــە نهێنییەکانیان، تاوەکو سەرەنجام، لەرۆژێکی مـانگی کـانوونی دووەمـی ١٩٧٦، بـەئامادەبوونی تـەنها شـەش کـەس، (بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردستان)یان، دامەزراند.

* بزوتنـەوەی سۆسیالیـستی دیمـوکراتی کوردسـتان، لـەپێناوی هێنانـە ئـارای ئاراستەیەکی تازە (سێیەم)، لـەنێو بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی سـەردەمیانەی خـەباتی کوردایـەتی، دوور لەهـەردوو ئاراسـتە باوەکـەدا، دروسـت بـوو. بزوتنەوەیەکی ریفۆرمخوازی مۆدێرن بـوو. بەهـەموو شـێوەیەك هـەوڵی دەدا، دوور لەشـەڕ و توندوتیـژی حکومـەت بگەیەنێتـە ئـەو قەناعەتـەی کەکێشەی کـورد بـەرێگای ئاشـتیانە چارەسـەر بکـات. هـەروەها، بانگەشـەی ئـەوەیان

دەکرد کە ئەوان لەسەر ڕێبازی پارتی، بەڵام بەکەمێك گۆڕانکاری کەلەگەڵ سەردەمەکەدا بگونجێت، خەبات دەکەن. لەپێناوی سەرخستنی پەیامەکەیاندا، تۆڕێکی فراوانی ڕێکخستنیان لەنێو جەماوەردا، دروست کرد. بەهۆی دروستبوونی ڕێکخراوی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، شەش مانگ لەپێش ئەوان و هاتنە پێشەوەی خێرای هەل و مەرج و کردەوە شۆڤێنیەکانی ڕژێم لەتەعریب و تەهجیر و سەرکوتکردن، یەکەم مەفرەزەی خۆی لە ۱۹۷٦/۸/۸، لەدوو میحوەری سلێمانی و هەولێر، گەیاندە شاخەکانی کوردستان. وردە وردە خەڵکی ناڕازی و بەرهەڵستکار، پەیوەندیان پێوە کردن. (بزوتنەوە)، بووە باڵێکی سەرەکی لەنێو نیمچە بەرەی یەکێتی کەلە ۱۹۷٥/٥/۲۲ لەدیمەشق دامەزرابوو.

* هەڵەیەکی باو لەمێژووی (بزوتنەوە)دا چەسپاوە، ئەویش ئەوەیە: گوایا بزوتنەوە لە ۱۹۷٦/۸/۸دا دروست بووە. بەڵام ئەوە دوورە لەڕاستییەوە. ئەم مێژووە (۸/۸)، دەرچوونی یەکەم مەفرەزەیە بۆ شاخ نەك دروستبوونی بزوتنەوە. ڕاستییەکەی: بزوتنەوە لەکانوونی دووەمی ۱۹۷٦دا، دامەزراوە. هەروەها لەکۆمەڵێك سەرچاوەدا، کۆمەڵێك خەڵك بەدامەزرێنەری بزوتنەوە ناوزەد دەکەن، بەڵام لەڕاستیدا دەستەی دامەزرێنەر هەر ئەم شەش کەسەن: (ساڵح یوسفی، ڕەسوڵ مامەند، عەلی هەژار، ملازم تاهیری عەلی والی، مەلا ناسیح، نورەدین عەبدولڕەحمان).

* بزوتنەوە لەچوارچێوەی (ی.ن.ك)دا، چەندین چالاکی سیاسی و عەسکەری و جەماوەری، دژ بەڕژێم ئەنجام داوە. خاوەنی کۆمەڵێك هەرێم و هێزی دەست وەشێن بووە. بەشاهیدی دۆست و دوژمن و، بەپشت بەستن بەچەندین سەرچاوە و دیکۆمێنت، بزوتنەوە، هێزێکی کاریگەر و دەست وەشێنی بەرچاوی گۆڕەپانەکە بووە. هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، ڕێگای گفتوگۆ و ئاشتی ڕەفز نەکردووە، بەڵکو بەباشترین ڕێگا و چارەسەری زانیوە. دەست بردن بۆ خەباتی چەکداری، زێتر بەمەبەستی فشار خستنە سەر ڕژێم، بەکارهێناوە، تاوەکو لەڕێگای ئەم فشارەوە حکومەت ناچار بکات لەسەر مێزی گفتوگۆ دابنیشێت. چەند جارێك وەك هەموو هێزەکانی تری کوردستان

(ی.ن.ك) و (پ.د.ك)، دانووســتاندنی لەگــەڵ حکومــەت كــردووە، بــەڵام سەرەنجام، هیچی لێ سەوز نەبووە و بەئاكام نەگەیشتووە.

* بزوتنــەوە، لــەماوەی خەباتیــدا، بەكۆمــەڵێك تەنگــژە و قۆنــاغی ســەختدا، تێپــەڕیوە، كەبوونەتــە هــۆی بــێ هێزبــوون و تەشــەنەكردنی جەمسەربەندی لەریزەكانیدا، لەوانە: (كارەساتی هەكاری، دروستبوونی كێشە لەنێو باڵەكانی یەكێتی، گیرانی كاردۆ و عەلی هەژار، تیرۆركردنی ساڵح یوسفی، شـەهیدبوونی بەشـێكی زۆر لەســەركردە و فەرمانــدە عەســكەرییەكانی، شــەڕی نــاوخۆ، جیابوونەوەی باڵی قادر عەزیز، جەمسەربەندی نێوان د. مەحمود عوسمـان و رەســوڵ مامەنــد)، هۆكــاری هــەرە دیــاری داڕوخــان و پەرتــەوازەبوونی (بزوتنەوە)، دواتر: (حزبی سۆسیالیستی كوردستان)، بوون.

* كۆمــەڵێك ســەركردەی سیاســی و مەیــدانی هــەرە دیــاری لەخــەباتی شــار و شاخدا، شەهید بوونــە، لەوانــە: (عــەلی عەسـكەری، د. خالیـد سـەعید، سـاڵح یوسفی، عەلی هەژار، كاردۆ گەلاڵی، ملازم ئەنوەری مەجید سولتان، شێركۆ شێخ عەلی، سەعدی گچكە، ملازم تاهیری عەلی والی، قـادر شـۆڕش، مامۆسـتا شــەریف، غــەفور ســاڵح ژاژڵــەیی، عەبــدوڵلا ســوور، ســەید ســەلیم، قــادر مستەفا،...تاد). ئەوانە، كەلێنێكی گەورەیان لەنێو حزب دروست كـرد، كـەتا پەرتەوازە بوونی حزب، رۆژێك لەرۆژان نەتوانرا ئەم كەلێنانە پڕ بكرێنەوە.

* هۆكارێكی تری بێ هێز بـوون و بەهــەدەردانی وزە و خەباتەكـەی، تێـوەگلان بوو لەشەڕی لەمێژینەی یەكێتی و پـاتی. جارێـك لـەناو یـەكێتی دژی پـارتی، جارێكی تر لەناو (جـود)، دژی (یـەكێتی). بـەم هۆیـەوە، هێـز و خەباتەكـەی لەئاراستەیەكی هەڵە و نەخوازراو و لاوەكی، بەهەدەر چوو.

* لەئەنجامی ناكۆكی و ململانێی نێـو باڵـەكانی یـەكێتی لەلایـەك و بەیـەك چـاو سـەیر نـەكردنی هـەموو باڵـەكانی نـاو (ی.ن.ك) لەلایـەكی تـرەوە، بزوتنـەوە بەناچاری لە (ی.ن.ك) جیابۆوە. هاتنە دەرەوەی بزوتنەوە لەیەكێتی، خـۆی لەخۆیدا، بێ هێز بوونی یەكێتی دەگەیاند. ئـەم واقیعـە تاڵـە، لەچوارچـێوەی واقیعی داسەپاوی ئەوكات و چوارچێوە زەمەنی و سیاسیەكە (تا بەئێـستاش رادەگات)، مایەی قبوڵ كردن نەبوو. بۆیە، ئەم هاتنە دەرەوەیـە بـووە هـۆی

سەرهەڵدانی شەڕێکی درێژخایەنی تاقەت پڕوکێنی نێوان بزوتنەوە و یەکێتی، کەبەگرتنی نەوشێروان و شەهیدکردنی شێرکۆ شێخ عەلی و عەولاسوور و مام ئاراس و گرتنی مەڵبەندی هەولێری ینك لەلایەن جود و، دواتر شەڕی یەکلاکەرەوەی ئاشقولکە و پشت ئاشان لەیەکی ئایاری ۱۹۸۳، گەیشتە ترۆپکە.

حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەم شەڕە نەخوازراوەدا، سەرەڕای بێئومێد بوونی بەشێکی زۆر لەپێشمەرگە و ئەندامەکانی و چەك دانانیان، (۱۷۹) پێشمەرگە و فەرماندەشی لەم رێگا نەخوازراوەدا، بوونەتە قوربانی.

* حزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسك)، لەبواری راگەیاندنەوە، سەرەڕای دەرکردنی بەیاننامە و بەلاغی عەسکەری، تا هاتنە دەرەوەی لەناو (ی.ن.ك)، خاوەنی هیچ گۆڤار و بڵاوکراوەیەك نەبووە. کەهاتۆتە دەرەوە، دەزگای راگەیاندن (نووسراو، بیستراو)ی دامەزراندووە. لەم بوارەدا، کۆمەڵێك گۆڤار و رۆژنامەی دەرکردووە، لەوانە: (رێگای ئازادی، دەنگی پێشمەرگە، پەیامی شۆڕشی کوردستانی عێراق، طريق الحرية، بەهدینان، پەیامی برایەتی، سورێن). هەروەها لەبەهاری ۱۹۸۳، ئیستگەشی بەناوی (ئیستگەی دەنگی شۆڕشی کوردستانی عێراق) دامەزراندووە.

* کۆمەڵێك رێکخراوی پیشەیی و جەماوەری وابەستە بەحزبی هەبووە. لەوانە: (یەکێتی قوتابیانی کوردستان و یەکێتی لاوانی سۆسیالیستی کوردستان)، لەسەردەمی خەباتی شاخ و، (یەکێتی مامۆستایانی سۆسیالیستی کوردستان و یەکێتی ئافرەتانی سۆسیالیستی کوردستان)، لەسەردەمی دوای راپەڕین.

* حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەبەر ئەوەی دامەزرێنەر و ئەندامە بالاکان و فەرماندە عەسکەرییەکانی تێکەڵەیەك بوون لەهەردوو باڵە کلاسیکیەکەی خەباتی کوردایەتی، هەر لەگەڵ دروستبوونی، تۆوی ناکۆکییەکان لەنێویدا چەکەرەی کرد، جگە لەمەش، (حسك)، سەرکردەیەکی کاریزمایی نەبوو، کەبتوانێت کۆنترۆڵی هەموو بیروڕا جیاوازەکان بکات نموونەی (بارزانی و تاڵەبانی). دوای شەهید بوونی: (عەلی عەسکەری و ساڵح یوسفی)، بۆشاییەکی گەورە دروست بوو. ئەوانەی مابوونەوە، سەرەڕای بەردەوامیدان

بەناکۆکییەکان، شایستەی پڕکردنەوەی ئەم پۆستە باڵایە نەبوون کەبتوانێت بەرگەی فشاری دوو ئاراستە کلاسیکیەکە بگرێت. ئاراستە فیکریە تێکەڵ و پێکەڵیەکەی نێو حزب: (کوردایەتی، نیشتمانی، دیموکراتی، سۆسیالیستی دیموکراتی، سۆسیالیستی زانستی، عەشایەری...تاد)، هێندەی تر کێشە ناوخۆییەکانی، قوڵتر کردبۆوە، کەئەمەش بووە هۆی لێکترازان و جەمسەربەندی لەنێو خودی حزب و هێزەکانی پێشمەرگەدا.

* لەدوای راپەڕین و شکست خواردنی حزب لەیەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا، کەوتە داوی سۆزی یەکگرتنی بێ پلان و بێ بنچینە. یەکگرتنێك نەك لەسەر حسێبی نزیکی لەخەبات و قوربانیدان و بیر و باوەڕەوە، بڵکو لەسەر بنچینەی شکست خواردن و نەچوونە ژێر باڵی ئەمری واقیعەوە، بوو. هەربۆیەش ئەنجامەکەی هیچی لێ سەوز نەبوو، جگە لەتواندنەوەی سێ حزبی کوردستانی و برەودان و بەهێزکردنی ململانێی مێژوویی هەردوو ئاراستە باوەکە.
* حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەمێژووی خەباتی چەکداریدا، سەرەڕای کەم و کورتی و نووشوستییەکانیشی، خاوەنی چەندین سەرکردەی خاوەن ئەزموون و مەیدانی بوو، کەلەباسکردنی ئەم قۆناغەی خەباتی چەکداریدا، ناکرێت فەرامۆش و نادیدە بکرێن. لەم رێگایەدا، تاوەکو راپەڕین، زێتر لە (١٥٠٠) پێشمەرگە و رێکخستنەکانی، شەهید بووینە. بەسەدان لەئەندامەکانی لەزیندانەکاندا ئاخنراون و لەژێر ئەشکەنجەدا کەم ئەندام بوون. یەکەم حزبی کوردستانی بووە تاوەکو راپەڕین زێتر لەچوارده ئەندامی سەرکردایەتی بەدامەزرێنەرەکەشیەوە، شەهید بووینە، ئەوە سەرەڕای فەرماندە عەسکەرییە باڵاکانی. بەسەدان شەڕ و نەبەردی گەورە گەورەی نابەرامبەری لەدژی رژێم ئەنجام داوە، لەوانە: (شەڕەکانی ناوچەی باڵەکایەتی، هەورێ، دەشتێو، بناری سەفین، سماقوڵی، شیوەپیران، کانی بەردینە، شیرەمەڕ، دەشتی هەولێر...تاد).
* نەبوونی سەرکردایەتیەکی خاوەن یەك بیروڕا و رێبەرێکی کاریزما لەلایەك و فشاری زۆری هەردوو ئاراستەکەی تر بۆ سەری، لەلایەکی ترەوە، وردە وردە

حزبی بەرەو بێ هێزی و داڕوخان و پەرتەوازەبوون و پوکانەوە، برد. تا کار گەیشتە ئەوەی لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندی چەند کەسێك، پایدۆز لەم ئاڕاستەیە بکرێت و بەدەردی ئاردی ناو دڕکان ببردرێت...

ئەوەتا ئێستاکە دەبینین لەسەر ئەرزی واقیع هیچ حسێبێك بۆ خەبات و قوربانیدانی ئەو کەسانە ناکرێت و خراونەتە خانەی فەرامۆشکردن و نەبوونیەوە. ڕۆژانێك هەر ئەوان بوون پێکهێنەری مەفرەزە سەرەتاییەکان و گەشاندنەوەی ژیلەمۆ خامۆشکراوەکان. ئەگەر بێتو وردبینیەك لەناوی ئەو پێشمەرگە سەرەتاییانەی شۆڕش لەساڵانی (١٩٧٦-١٩٧٧) بکرێت، بێ هیچ دوو دڵی و هەروەستە کردنێك، نیوەی زیاتریان (بزوتنەوە) دەردەچن.

* حزبی سۆسیالیستی کوردستان (کانوونی دووەمی ١٩٧٦- شوباتی ١٩٩٣)، لەماوەی حەڤدە ساڵ و یەك مانگی تەمەنیدا، سەرەڕای سەرکەوتن و شکست خواردن، هەڵکشان و داکشان، مانەوە و پەرتەوازە بوون، دەکرێت لەفەرهەنگی حزبە سیاسیەکانی کوردستاندا لاپەڕەیەکی گەش و پێشەنگ ئامێزی دەقەبەر بکرێ، کەنەتوانرێت بەبێ ناو هێنانی ئەو، باس لەمێژووی خەباتی کوردایەتی لەم قۆناغە (١٩٧٥-١٩٩١)دا، بکرێت.

# ناوی بەشێک لە ڕێکخستنەکانی
# حزبی سۆسیالیستی کوردستان- هەولێر

### * کەمال حوسێن عەلی

بەر لە (٣٤) ساڵ، واتە شەوی ٨ی شوباتی ١٩٨٤، هاوڕێی دێرین و ئازیزم کاک فارس ئەحمەد میرەکانی ناسراو بە (فارس چاوشین) لەگەڵ هەردوو هاوڕێی خۆشەویستم کاکە عەباس حاجی کەریم و داود محەمەد، کە ئەو کات بە یەکەوە لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان، لەیەک شانەدا بووین، لە حزب ئاگادار کراینەوە کە لە دژی حزبی بەعس لەناو گەڕەکەکانی شاری هەولێر چالاکی ئەنجام بدەین، چونکە حزبی بەعس ڕۆژی ٨ی شوباتی بە ڕۆژی سەرکەوتنی ئینقیلابی ساڵی ١٩٦٣دەزانی. لەم شەوەدا، لەچەند گەڕەکێکی هەولێر بە ئەرکی خۆمان هەڵساین بە جێبەجێ کردنی لە دوای کاتژمێر یازدەی شەو لە گەڕەکی بەلاشاوە نزیک گۆڕستانی شێخ مەعروف. لە کاتی هەڵواسینی پۆستەری شەهیدان و نووسینی دروشمەکانی حزب لەسەر دیواری قوتابخانەی مەلا فەندی. ماڵە ئامر سریەیەکی جاش بەرامبەر بە قوتابخانەکە بوو، ئەو هاوڕێیانە نەیانزانی بوو ئەوە ماڵە جاشەو تازە هاتوونەتە ئێرە. پاسەوانی ماڵی ئامر سریەکە دەستڕێژی گولەی لە هەرسێکیان کرد، ئەوانیش دەمانچەیان پێبوو مەردانە وەڵامی پاسەوانەکەیان دابۆوە. لەم چالاکییەدا، هاوڕێ فارس بریندار ببوو، گولە بە شان و ڕومەتی کەوتبوو کە تا ئێستاکەش شوێنی گولەکە هەر دیارە. ئەو کاتە بە سیقەو متمانەیەکی زۆرەوە بە یەکەوە کارمان دەکرد.

هەر بۆ لەبیر نەچوونەوەو ئاگادار بوونی نەوەی نوێ، ناوی ئەو بەڕێزانە دەهێنم کە ئەوکات لە ڕێکخستنەکانی حزب لە سنووری پارێزگای هەولێر کاریان دەکرد، هەڵبەتە هەر ئەوەندە نین کە من ناوم هێناون بەڵام من ئاگاداری ئەوانەم. داوای لێبوردنیش لەوانە دەکەم کە ئێستاکە ناوەکانیان نایەتەوە بیرم. بەڕێزان: فارس چاوشین، داود محەمەد، عەباس حاجی کەریم، سەید تاهیری برای شەهید سەلاح، عەباس محەمەد ئەمین برای مامۆستا کاوەی مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی، تەحسین سەید غەریب، ئومێدی مام جەلال، سەردار ساڵەیی، کەمال حوسێن عەلی، مزەفەر محەمەد ساڵەیی، غازی سەید حەسەن ئیلنجاغی، سەید فەیسەڵ سەید حەمەدەمین میرەکانی، سەید ئارام، مامۆستا ڕەفیق، مامۆستا محەمەد قوڕیتانی و هاوسەرەکەی، خاڵە پوشۆ ئیسماعیلی ڕەحمەتی، سەیفەدین نەجمەدین سورچی، دڵزار عەبدوڵلا، وەستا هەڤاڵ، مامۆستا خالید برای شەهید دکتۆر چالاک، کاک سیروانی برای دکتۆر شوان، حاکم ئەحمەد

